سەرنووسەر

پ. د. محەمەد مەعرووف

جێگری سەرنووسەر

پ. د. جەبار قادر

بەڕێوەبەری نووسین

کەمال غەمبار

دەستەی نووسەران

د. ئازاد ئەحمەد مەحموود

د. سەباح رەشید

د. ڤیان سلێمان حاجی

د. هۆشەنگ فارووق

# ئەستێرەیەکی دیکەی
# ئەدەبیاتی کوردییمان ئاوابوو

لەدەستپێکی پاییزی ئەمساڵ دەستی مەرگ یەکێک لە کۆڵەگە بنەڕەتییەکانی رووناکبیریی کوردی، یەکێک لە ئوستادەکانی ئەدەبیات و ئەکادیمییەکی گەورەی کوردستان، پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەداری راپێچی ئەو دونیایە کرد کە دواجار هەر هەموومان درەنگ و زوو هەر لەوێدا دەگیرسێینەوە. بۆ مەرگی دوکتۆر مارف خەزنەدار گۆڤاری ئەکادیمی کە لە ژمارە (٣ تاوەکو ژمارە ٦) سەرنووسەری گۆڤارەکە بووە درووود بۆ گیانی پاکی خەزنەدار دەنێرێ. خەزنەدار زیاتر لە شێست ساڵ لەگەڵ کتێب ووشەدا ژیاوە. ئوستادی مامۆستای ئەدەبیاتی کوردی، لێکۆڵینەوە، چیرۆک، وەرگێران و سەرگوزشتەی حاڵ بوو. مامۆستایەکی ئەکادیمی (خاکی) و گەلێک (نەفس بەرز) بوو و لەگەڵ قوتابی و هاوڕێیەکانی سنوورەکانی تەمەن و جیاوازی پلەی خوێندەواری نەدەزانی و دۆستایەتی لەگەڵ هەمووان گەرم و گوڕ بوو.خوالێخۆشبوو چیایێک بوو لە (حورمەت) و (خۆشەویستی) بۆ لای بەرامبەر. ماوەی زیاتر لە سی ساڵ مامۆستای زانکۆ بوو و دوایین قۆناغی ژیانیشی کاتێک خانەنشین بوو بە بڕشت ترین قۆناغی ژیانی رووناکبیری ئەم کەڵە نووسەرە دادەنرێ. پرۆفیسۆر مارف لە دوای خۆی کۆمەڵێکی زۆر بەرهەمی ناوازەی خۆیی و کتێبخانەیەکی ئاوا دەوڵەمەندی بۆ کوردستان جێهێشت کە دەبێ کوردستان تا هەتا هەتایە شانازی بە رۆڵەیەکی ئاوا دڵسۆزی خۆیەوە بکات، رۆڵەیەک کە تا دوایین هەناسەی ژیانی هەر بۆ "خاک" و "نیشتمان" ژیا.

**ژیاننامەی زانستیی**
**پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار**
**(٢٠١٠/١٠/٢٥-١٩٣٠/١١/١)**

مارف خەزنەدار لە شاری هەولێر لە دایک بووە و خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و ئامادەیی هەر لە هەولێر تەواو دەکات. لە ساڵی ١٩٥٢ تاوەکوو ١٩٥٩ چ وەکوو مامۆستای سەرەتایی و چ وەک فەرمانبەر لە شارەکانی هەولێر، کووت، بەغدا و کەرکووک مامۆستایەتی کردووە. ساڵی ١٩٥٧ بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی لە

زانکۆی بەغدا وەردەگرێ. ساڵی ١٩٦٠ بە زەمالەیەک دەچێ بۆ یەکیەتی سۆڤیەتی جاران و لە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی لە شاری لینینگراد دەخوێنی و ساڵی ١٩٦٣ دوکتۆرا لە بارەی (مێژووی ئەدەبیاتی نوێی کوردی) وەردەگرێ و ساڵی ١٩٦٨ دەگەڕێتەوە بۆ وڵات و وەکوو مامۆستای زانکۆ کار دەکات و ساڵی ١٩٧٩ پلەی پرۆفیسۆری وەردەگرێ.

**لە گرینگترین بەرهەمەکانی:**

١-اغاني کردستان، بغداد، ١٩٥٦.
٢-کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا، بەغدا، ١٩٦٢.
٣-مێژووی ئەدەبیاتی نوێی کوردی ١٨٩٠-١٩٦٠، مۆسکۆ، ١٩٦٧ بە زمانی ڕووسی.
٤-الاکراد - ملاحظات وانطباعات، فلادیمیر مینورسکي، ترجمة وتعلیق وتقدیم، بغداد، ١٩٦٨.
٥-بووکە شووشە، بەغدا، ١٩٦٩.
٦ -ئەڵەمان کوردی و چەند چیرۆکی دیکەی کوردی، بەغدا، ١٩٦٩،
٧-عەبدوڵڵا بەگی میسباح، دیوان، شاعیری گەورەی خاکی موکریان، بەغدا، ١٩٧٠.
٨-دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی دانانی عەلی تەرماخی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە و پێشەکی، بەغدا، ١٩٧٧.
٩-دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، ١٩٧٧.
١٠-مخطوطات فریدة ومطبوعات نادرة، دراسات کردیة، الجزء الاول، بغداد، ١٩٨٢.
١١-تاریخ الاستشراق والدراسات العربیة والکردیة في المتحف الاسیوي ومعهد الدراسات الشرقیة في لینینغراد ١٨١٨-١٩٦٨، بغداد، ١٩٨٠.
١٢-الرحالة الروس في الشرق الاوسط، ترجمة عن الروسیة، بیروت، ١٩٨١.
١٣- نالی لە دەفتەری نەمری دا، ١٩٨٠.
١٤-لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغدا، ١٩٨٤.
١٥-گەشتێک بۆ ئەرزەرۆم، پوشکین، ١٩٩٥.
١٦-کوردەیادە، لەندەن، ١٩٩٨،
١٧- ئەدەبی ڕووسی و کێشەی پاسترناک، هەولێر، ١٩٩٩.
١٨-مێژووی ئەدەبی کوردی (حەوت بەرگ) ٢٠٠١-٢٠٠٦.
١٩-دیجلی هیزرم (دوو بەرگ) ٢٠٠٦-٢٠٠٩.
٢٠-ڕۆژگاری من (پێنج بەرگ) ٢٠٠٩-٢٠١٠.

جگە لەوە مارف خەزنەدار سەرپەرشتی دەیان نامەی ماجستێر و دوکتۆرای کردووە و پێشەکی بۆ گەلێک کتێب نووسیوە. دیمانەتان بەخێر و سڵاو لە ڕۆحی پاک و بەرزتان، ماڵئاوا مەنزلی هەمیشەییتان پڕ بێت لە نوور و جێگەتان بەهەشت بێت.

## لەم ژمارەیە دا

# ڕاسپاردەكانی كۆنفرانسی
# بەرەو ڕێنووسێكی یەكگرتووی كوردی

ئەكادیمیای كوردی

**سەرەتایەك** .....!

لەبیست و دووەم كۆبوونەوەی، ڕێكەوتی (٢٠/٤/٢٠٠٨)ی، ئەنجومەنی ئەكادیمیای كوردیدا، كە پێشتر كارنامەی كۆبوونەوەكە، بۆ گفتوگۆ لەبارەی (**پرۆژەی هەوڵۆچكەیەكی تری چارەسەری گرفتەكانی ڕێنووسی كوردی**)، تەرخانكرابوو، كە (م. جەمال عەبدول)، بە سوود لێ وەرگرتن و ڕەچاوكردنی هەموو ئەو هەوڵانەی لەوەو پێشتر لەوپێناوەدا درابوون، ئامادەی كردبوو. سەرەتا، باسی ئەوەی كرد: گرفتەكانی ڕێنووسی كوردی، كە تا ئێستا هەڵپەسێردراون، پێویستییان بەوە هەیە، زانستییانە چارەسەر بكرێن، وەك بەشێك لەكارەكانی ئەكادیمیاو بەپێی توانا، یەكلاكردنەوەیەكی دروستی ئەو بابەتانە بكرێت.

ئاشكرایە، ئەو دەستكاری و چاكسازی و مشتوماڵ و كۆششە شەكەتكارانەی، كە زاناو زمانەوانانی كورد لە تیپەكانی زمانی عەرەبیدا، بۆ پێ دەربڕینی دەنگە كوردییەكان كردوویانە و ئەو بابەتە چاپكراوانەی دەیان ساڵە بەو ئەلفوبێیە دەنووسرێن، ئێستا ئەگەر ناتەواوییەكیشیان مابێت، هێشتا لە هەموو ئەلفوبێیەكانی تر باشتر دەنگەكانی زمانی كوردیی پێ دەردەبڕدرێت و لەو گەلانەی ئەو تیپانە بەكادرێنن، زۆرترو سەركەوتووانەتر دەستكاریمان كردوون و بە بەریشیەوە ماوە، هەر كاتێك پێویستی كرد چاكسازیی تریشی تێدا بكرێت و دواتر لەو كێشانە دوا، كە تا ئێستا چارەسەرێكی زانستی و ڕێكوپێك و ڕوون نەكراون.

بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارە، لیژنەیەك بەسەرپەرشتیی مامۆستا(محەممەدی مەلا کەریم) و بەشداریی مامۆستایان:(محەممەد ساڵح سەعید و جەلال مەحموود عەلی و جەمال عەبدول و سەگڤان جەمیل و عەبدولستار فەتتاح حەسەن)، پێکهێنرا و ئەو پرۆژەیە، کرایە بنەمای کاری لیژنەکە، پاش گفتوگۆی تەواوکاری و ئامادەکردنی، خرایە بەر دیدی ئەندامانی ئەنجومەنی ئەکادیمیاو دوای گفتوگۆو تاوتوێیەکی زۆر لەلایەن ئەنجومەنەوە، لە دانیشتنی ڕێکەوتی (١١/٥/٢٠٠٨)دا بڕیاردرا، داوا لە شارەزایان و پسپۆڕانی (زمان و ڕێنووس)لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان بکرێت، کە بە نووسین بیروڕای خۆیان لەو بارەیەوە بۆ ئەکادیمیا بنێرن و ڕێکەوتی(٢٥/٥/٢٠٠٨) بڕیاردرا پێش ناردنی بۆ شارەزایان، مامۆستایان: پرۆفیسۆر د.محەممەد مەعرووف و پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین بۆ دواجار پێیدا بچنەوە و ئەوسا چاپ بکرێت و بۆیان بنێردرێت.

لە کۆبوونەوەی ژمارە (٢٧)ی ڕێکەوتی (٨/٦/٢٠٠٨)دا بڕیاردرا بەشی یەکەمی پرۆژەکە بۆ ئەم بەڕێزانە بنێردرێت:

١/ د. یوسف شەریف
٢/ د. سەباح ڕەشید
٣/ د.تالیب حوسێن
٤/ د.فەتاح مامە عەلی
٥/ د.عەبدوڵڵا حوسێن
٦/ د.وریا عومەر ئەمین
٧/ د.محەممەد مەحوی
٨/ د.هۆگر مەحموود فەرەج
٩/ د.فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی
١٠/ د.بەکر عومەر عەلی
١١/ د. محەممەد بەکر
١٢/ د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ
١٣/ د.عەبدوڵڵا بابان
١٤/ د.فازیل عومەر

١٥/ د.ڕەمزیە سابیر
١٦/ د.ئەمین موتابچی
١٧/ ئەحمەد فەرهادی
١٨ / ئەمیر حەسەن پوور
١٩/ م. کەمال مەحموود فەرەج
٢٠/ د. عەبدولوەهاب خالید
٢١/ د. محەممەد ساڵح بەرواری
٢٢/ د. ڤیان سلێمان حاجی
٢٣/ م. کەریم شارەزا
٢٤/ د. لەزگین عەبدولڕەحمان
٢٥/ م. مەجید ئاسنگەر
٢٦/ م. ئیسماعیل تەها شاهێن
٢٧/ م. سەگڤان جەمیل محەممەد
٢٨/ د. فارووف عومەر سەدیق
٢٩ م. مەحموود فەتحوڵلا
٣٠/ د. مەحموود زەهاوی
٣١/ م. عەبدولستار فەتاح
٣٢/ د. سەباحی غالیب
٣٣/ د. جەمال نەبەز
٣٤/ د. عەبدوڵلا پەشێو
٣٥/ د. ڕەفیق سابیر
٣٦/ لەتیف هەڵمەت
٣٧/ د.نەسرین فەخری
٣٨/ د. کوردستان موکریانی
٣٩/ د.شێرکۆ بابان
٤٠/ ئەنوەر سوڵتانی
٤١/ پەروێزی جیهانی
٤٢ / د.فریاد فازیل
٤٣/ د.محەممەد نووری عارف

٤٤/ د.قەیس کاکل
٤٥/ د. لەتیف محەممەد حەسەن
٤٦/ م. عەبدوڵڵای حەسەن زادە
٤٧/ د. عومەر ئیبراهیم عەزیز
٤٨/ م. کەمال غەمبار
٤٩/ م. فەرهاد شاکەلی
٥٠/ عومەر شێخ موس
٥١/ ئۆمەر دزەیی
٥٢/ بەشیر سەبری
٥٣/ م.ئەحمەد حەسەن فەتحوڵڵا

## دەزگاکانی چاپ و پەخش:

١/ ئاراس
٢/ خاك
٣/ سەردەم
٤/ موکریان
٥/ خانەی وەرگێڕان

## گۆڤارە سەرەکییەکان:

١- ڕامان
٢- کاروان
٣- هەرێمی کوردستان
٤- ئایندە
٥- پەیڤ
٦- ڕادیۆو تەلەفزیۆن:
٧- و. ڕۆشنبیری
٨- و. پەروەردە

لەكۆبوونەوەی ژمارە (٢٦)ی ڕێكەوتی (٢٠٠٨/٦/١) بڕگە/١ دەڵێت: پڕۆژەی ڕێنووسی(كوردی)، كە (لیژنەی ڕێنووس) لە ئەكادیمیا ئامادەی كردبوو، د.محەممەد مەعرووف پێیداچووەوەو دواتر پێشەكیی بۆ نووسراو نێردرا بۆ چەند كەسێك لەو شارەزاو پسپۆڕانەی ئەو بوارە كەپێشتر ناوبران، تاكو بە نووسین بیروڕای خۆیان لەسەر پڕۆژەكە دەربڕن و داوایان لێ كرا ڕۆژی (یەكشەممە)ڕێكەوتی(٢٠٠٩/٤/١٢) لەو كۆنفرانسەدا، كە بۆ ئەو مەبەستە لە هۆڵی(مەلا مەحموودی بایەزیدی)لە تەلاری ئەكادیمیا ساز دەكرێ، ئامادەبن. لە بڕگە/٣ی كۆنووسی كۆبوونەوەی ژمارە(٤٣)ی ڕێكەوتی(٢٠٠٩/٤/٥)دا بڕیاری لەسەردراو، یەكشەممە، كات(١٠)ی، بەیانی، كۆنفراسی یەكەم بەسترا، ئەم بەڕێزانە ئامادەبوون:

**ا- لیژنەی ئامادەكار:**

١- د. ئازاد ئەحمەد: سەرۆك

٢- د. محەممەد مەعرووف: ئەندام

٣- د. سەباح ڕەشید: ئەندام

**ب- پێشكەشكار و گفتوگۆكارو وەڵامدەرەوەی بەشداران:**

١- م. محەممەد مەلا كەریم

٢- م. جەمال عەبدول

**ج- بەشدارانی كۆنفرانسی یەكەم:**

١- د. یوسف شەریف

٢- د.تالیب حوسێن

٣- د. هۆگر مەحموود فەرەج

٤- د.فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی

٥- د. عەبدولوەهاب خالید

٦- م. عوسمان هەورامی

٧- م. سەگڤان جەمیل
٨- م. تاریق سالّح مەحموود
٩- د. فارووق عومەر سەدیق
١٠- م. عەبدولستار فەتتاح
١١- م. سادق ئەحمەد
١٢- م. سەلام ناوخۆش
١٣- د. هەڵکەوت حەکیم (بە نووسین لە پاریسەوە بەشداری کرد).

دواتر بەشی دووەمی پرۆژەکە، لەلایەن (م. جەمال عەبدول) ئامادەکرا و نێردرا بۆ ئەو مامۆستا بەڕێزانەی لە کۆنفرانسی یەکەمدا بەشداربوون و ڕێکەوتی(٩/٨/٢٠٠٩) کات (١٠) ی بەیانی لە هەمان هۆڵ کۆنفراسی دووەم بەسترا، کە ئەم بەڕێزانە تیایدا ئامادەبوون:

**ا- لیژنەی ئامادەکار:**

١- د.ئازاد ئەحمەد : سەرۆك
٢- د. سەباح ڕەشید: ئەندام

**ب- پێشکەشکار:**

**م. جەمال عەبدول**

**ج- بەشداربووانی کۆنفراسی دووەم:**

١- د. تالیب حوسێن
٢- د. عەبدولوەهاب خالید
٣- م. سەلام ناوخۆش
٤- م. تاریق سالّح مەحموود
٥- م. عەبدولستار فەتتاح
٦- م. سەگڤان جەمیل
٧- م. عوسمان محەممەد هەورامی

دوای گفتوگـۆو تاوتوێیـەكی زانـستی چـڕوپڕ و پـڕ پـەرۆش و بـەرپرس و دڵسۆزانەی هەمووان، هەردوو بەشە هەموارکراوەکەی پرۆژەکە، بە سوود وەرگرتن و ڕینمـایی ئـەو نووسـینانەی لەلایـەن ئـەو مامۆسـتا بەڕێزانـەوە نووسـرابوون و بەشداریی کۆنفرانسەکەیان پیٚ کـرد، پاکنووسـکران و ئەمـەی بەردەسـتی لیٚ هاتـە بەرهـەم و ئەنجومـەنی ئـەکادیمیاش بڕیـاری دا چـاپ بکرێـت و بنێردرێـت بـۆ سـەرۆکایەتیی ئەنجومـەنی وەزیـران، بـۆ ئـەوەی دابـەش بکرێـت بەسـەرهەموو وەزارەتـەکان و زانـستگا(زانکـۆ)و بنکـە زانـستی و ڕوونـاکبیری و پـەروەردەیی و هـەموو بوارەکـانی میـدیاو چـاپەمەنییەکان لـە نـاوەوەو دەرەوەی کوردسـتان، بەمەبەستی پێڕەوکـردن و بـەکارهێنانی لـە هـەموو بارێکدا، بـەو هیوایـەی ببێتـە بنەمای ڕێنووسێکی گونجاوو دروست و یەکگرتووی کوردی.

- سـەرنج: بڕیـارە، دەقـی هـەموو ئـەو نووسـینانەی کـە لەلایـەن مامۆسـتایان و پـسپۆڕان و شـارەزایانی دڵـسۆزەوە بـۆ ئـەکادیمیا نێردرابـوون، لـە ژمارەیـەکی تەرخانکراوو تایبەتی گۆڤاری( ئەکادیمی)دا بڵاو بکرێنەوە.

**گوزەرێك:**

پسپۆڕانی زمان، بیروڕایان وایە کە سەرچاوەی نووسینی عـەرەبی، یەکێکـە لــەم زمانانــە: ســریانی، فینیقــی(ئــارامی)، عیــبری، مێخــی (بــابلی)، هیرۆگلیفی(فیرعەونی)، عەرەبی یەمەن، لە کۆنەوە بـە نووسـینی (مەسـنەد) وهـی شام بـە (فینیقـی) و هـی حیجـاز بـە (سریانی) نووسـیویانە، کـە ئـایینی ئیـسلام پەیدابوو، (قورئانی پیرۆز) بە خـەتی(کـووفی) نووسـرایەوە، کـە ئـەو خەتـەش تـا گەیـشتۆتە ئێـستای زۆر دەسـتکاری کـراوە، دواتـریش سـەرو بـۆرو ژێـر و گـیرەو هەمزەو خاڵ، لەلایەن: (ئەبو ئەسـوەدی دوئـەلی و نەسـیر بـن عاسـم و یـەحیا بـن یەعمور و خەلیل بن ئەحمەدی فەراهیدی)یەوە، بۆ تیپەکان دانـرا، دواتـریش وردە وردە نووسینی( نەسخ) و (**ثولث**) و (ڕوقعە)و (دیوانی) و (فارسی) پەیدابوون.

**تیپەکانی زمانی عەرەبی، ( ٢٨ ) تیپن، ئەمانەن:**

**(ا، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، م، ن، و، هـ، ي).**

لەم (٢٨) تیپە، (٢١) یان بۆ زمانی کوردی گونجاون، بەلاّم (٧) یان بۆ زمانی کوردی ناگونجێن، کە ئەمانەن: (**ث**،**ذ**،**ص**،**ض**،**ط**،**ظ**،ع).

پاشان، دەستکاری (٥) تیپی ئەو (٧) تیپە نەگونجاوە کراو(٥) تیپی تری کوردییان لێ سازکرا: (پ لە ب ، چ لە ج ، ژ لە ز ، ڤ لە ف ، گ لە ك) بەمەش تیپە کوردییەکان بوونە (٢٦) تیپ، بەلاّم گرفتی نووسین و کوردی پێ نووسینیان هەرما، چونکە زمانی کوردی چۆن لەدەم دەردەچێت، وا دەنووسرێت، بۆیە بە پێویست زانرا، بە دانانی هەندێ نیشانە(٥) تیپی تریش سازبکرێت:( ڕ) بۆ ڕێی قەڵەو، (ڵ) بۆ لامی قەڵەو و ( ۆ) بۆ واوی کراوە و(ێ) بۆ( یێ)ی کراوە(٥) بۆ بزوێن.

تیپە کوردییەکان (٣٤) تیپن و ئەمانەن:

**( ئـــ، ا، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ڕ، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، ڵ، م، ن، ه، ە، و، ۆ، وو، ی، ێ ).**

تیپە خاڵدارەکان( ١٦)ەن، بە هەموویان (٣٠) خاڵیان هەیە.

تیپەکانی: (ب،ج،خ،ز،غ،ف،ن) یەکی (١) خاڵ.

تیپەکانی: (ت،ق،یـ، ێـ ) یەکی (٢) خاڵ.

تیپەکانی: (پ،چ،ژ، ش،ڤ ) یەکی (٣) خاڵ.

- تیپەکانی ئەلفوبێی عەرەبی، جگە لە (١)ئەلف، کە بەجووڵە دادەنرێت، بەپێی شوێن و شێوەی گۆکردنیان لە ناودەمدا، دەکرێن بە پێنج بەش:

تیپە گەروویییەکان:( و،ح،خ،ع،غ،**ه**).

تیپە مەلاّشووییەکان:( ج،ز،ی،ك،ق،ش).

(١) تیپە زمانییەکان: (ص،**ط**،ت،د،س،ر،ل،ن).

(٢) تیپە ددانییەکان: (**ث**،**ذ**،**ظ**،**ض**).

تیپە لێوییەکان: (ب،م،و،ف).

سەرنج: (یـی) لـە شـێوەزاری ناوەڕاسـت لەهەنـدێ وشـە بـەدەر دەکـەوێ، وەك: (**مەیی، گەیی، هەیی**،....**هتد**).

## ڕێنووس Orthography

بێگومان ڕێنووس، واتا: وێنەی نووسینی دەنگەکانی زمان. دیـارە ڕێنـووس هۆیەکی کاریگەری ئاسانکاریی خوێندنەوەو نووسینە، خوێندنەوەش، تێگەیـشتنی مەبەستی نووسەرە، لەوەی کە ویستوویەتی بە وشەی نووسراو دەری ببڕێ.

خوێندنەوەی دروست ئەوەیە: کە بتوانین بە کەمترین هەڵوەستە، چـاو بەسـەر زۆرتـرین وشـەدا بگێـڕێن و یەکسەر تێیـان بگـەین، بۆیـە بـۆ چارەسـەری هـەموو گیروگرفتێکی ڕێنووسی زمانەکەمان، پێویستە ئەو چارەسەرانە پەسند بکـەین کـە خوێندنەوەو نووسین ئاسانتر دەکەن.

چـالاکیی خوێندنــەوە، بــە وردە وردە ڕاهــاتنێکی یەکبینــە و لــە ژێــر چـاودێری و ڕێنماییـدا پەیـدا دەبێـت، گەشـە دەکـات، پـەرە دەسـێنێت و لـە ڕوخـسارێکی تایبەتیـدا شـێوەگیر دەبێـت. هـەروەك توانـستی وشـە و تیـپ ناسینەوەش، بە هـۆی مەرجـە پەیوەندییەکـەوە پەیـدا دەبێـت، کـە پێـی دەڵـێن: یاسای پەیوەستبوونConditioning Law of association کە ئەویش بـە ڕاهـاتن پەیدا دەبێت، بەجۆرێك خوێنـەر وای لێ دێـت، هـەر بـە بینینـی وشـە یـان تیپەکـە دەنگەکەی بیردەکەوێتەوە و ئـەو دەنگـەش واتـای وشـەکەی بـیر دەخاتـەوە، جـا لەبەرئەوەی خوێندنەوە واتازانینە و واتازانینیش بەوە باشتر دێتەدی، کـە خۆمـان بەوە ڕابێنین، نووسینەکە وشە وشە و پچڕ پچڕ نەخوێنینەوە، بـەڵکو هـەموو ئـەو چـەند وشـانەی کـە بەسـەریەکەوە واتایـەکی تـەواو دەبەخـشن، بـە نیگایـەك بخوێنینەوە، بەمەش دەتوانین وا خۆمان ڕابێـنین کـە خێـرا بخوێنینـەوەو هـەر بـە بینینی وشەکان، یەکسەر بە قووڵی واتاکانیان تێبگەین و کارمان تێبکەن.

هەندێ تیپ، لە زمانی کوردی و زۆر زمانی تریشدا، لـە دەنگێـك زۆرتریـان هەیـە، جاروباریش دوو تیپ دەکەونە پاڵ یەك و دەنگێکی تایبـەتیی جیـاواز پێـك دێـنن، ناوبـەناویش نیمـچە دەنگێکـی شـاردراوە لـەنێوان دەنگـەکانی دوو تیپـدا خـۆی دەردەخات، بۆیە ڕاست نییە بۆ هەر دەنگێك تیپێك دابنێین و زۆرکردنـی شـێوەی

تیپەکانیش دەبێتە هۆی خاو و خلیچکی و لەنگی و گرانیی خوێندنەوەو نووسین، لەجیاتی ئاسانکردنیان، کەواتە زمانی کوردی یەکێ لەو زمانانەیە کە ژمارەی ((پیت) و /دەنگی/ ) لە پەیوەندییەکی یەك بەیەکی دانین، چونکە ئێمە لە خوێندنەوەدا(واتا) دەخوێنینەوە نەك ( تیپ)، لەلایەکی تریشەوە ئێمە لە خوێندنەوەدا، چەند وشەیەك بەسەریەکەوەو بە شێوەو مەزەندە دەناسینەوە و لەواتاکانیان دەگەین، بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات حونجەیان بکەین و فۆنیمەکانیان یەکە یەکە جیابکەینەوەو لێکیان بدەین و دەریان ببڕین، ئینجا تێیان بگەین. ئێستاش، با وەك بەرکولێك، هەندێ لە گرفتە دیارەکانی ڕێنووسی کوردی، بخەینە بەرچاو و چارەسەریشیان بۆ پێشنیاز بکەین، بەمەبەستی چەسپاندن و بڕیار لەسەردان و گشتاندن و پێڕەوکردنیان لەلایەن دامودەزگا فەرهەنگی و ڕووناکبیری و پەروەردەیی و بوارەکانی ڕاگەیاندنەوە لەسەراپای باشووری کوردستاندا:

( ١) ئەلفوبێی کوردیی بە تیپی عەرەبی، بەمجۆرە دەقی پێ بگیرێت:
**(ئـ،ا،ب،پ،ت،ج،چ،ح،خ،د،ر،ڕ،ز،ژ،س،ش،ع،غ،ف،ڤ،ق،ك،گ،ل،ڵ،م،ن،ھ، ە،و،ۆ،وو،ی،ێ)**.

تیپەکانی زمانی کوردی، بەپێی لکان و نەلکانی دواییەکانیان بەیەکترەوە، دووجۆرن:

یەکەم: ئەو تیپانەی دەتوانرێت دواییەکانیان بە تیپێکی ترەوە لە وشەیەکدا، یان لە وشەیەك و پاشگرێکدا بلکێنرێت، پێیان دەوترێت: (تیپە لکاو)، کە ئەمانەن: (ئـ،ب،پ،ت،ج،چ،ح،خ،س،ش، ع،غ،ف،ق،ك،گ،ل،ڵ،م،ن،ھ).

دووەم: ئەو تیپانەی، کە ناتوانرێت دواییەکانیان بە تیپێکی ترەوە لەوشەیەکدا، یان لە وشەیەك و پاشگرێکدا بلکێنرێت، پێیان دەوترێت:( تیپە نەلکاو)، کە ئەمانەن: ( ر،ڕ،ز،ژ،د،ا،ە،و،وو،ۆ،ی،ێ ).

**(٢) پلەی دەنگە بزوێنی واو:**

**تیپی (و):**

١- (و)ی کورت (u)، کە بۆری عەرەبی دەگرێتەوە، وەك: (کوڕ، قوڕ، لوڕ،....تاد)، بەیەك(و)ی، بێ نیشان دەنووسرێت، بەلاّم ئەم تیپە، لەشێوەی

نووسیندا هەر شێوەی( و)ی، کۆنسۆنانتەکەی هەیە، بەلاتینی (W)، بەڵام لە ڕاستیدا لە ڕووی (سیاق)ەوە، لە یەکتر جیاوازن.

٢- ( و)ی، درێژ (û) ، کە بە دوو( وو)دەنووسرێت، وەك: (کووڕ، پوور، ژوور، مێژوو، ....تاد).

لە زمانی کوردیدا، ( و-u) و ( وو- û)، دوو فۆنیمن، چونکە گۆڕینی (و) و (وو)، جیاوازی دەخاتە نێوان وشەکانەوەو وشەی نوێ پەیدا دەکات، وەك: کوڕ و کووڕ ، بۆ نموونە، بۆیە بۆ تێکەڵ نەکردنیان لە ڕێنووسدا، پێویستییان بە دوو نیگاری جیاوازە، وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

دەنگی / وو/ لە زمانەکەماندا، لەبنچینەدا هیچ کێشەیەکی نییە، هەرچەندە دوو هێما (نیشانە) بۆ دەنگێك بەکارهێنراوە، بەپێی ڕوخساری دەنگەکە، تاکو لە دەنگی /و/ جیابکرێتەوە. ئەوەی ئەو کێشەیەی لە زمانی کوردیدا ناوەتەوە، دەرکەوتنی سێ واوی بەدوایەکە لەو وشانەدا کە بەدەنگی /وو/ کۆتاییان دێت، لەباری خستنەسەردا، دەبێتە سێ واو، کە زۆر ئاسایییە، ئەگەر واوی خستنەسەرەکە، کەمێك لە / وو/ ەکە، دوور بخرێتەوە، وەك: (ڕەژوو و ئاگر، بەڕوو و مازوو ، مێژوو و جوگرافیا...تاد) ئەوە کێشەیەك دروست ناکات.

(و-W)ی، سەرەتای وشە، خۆی لە بنچینەدا یەك (و)واوە و سیمای نیمچە کۆنسۆنانتی هەیە، بۆیە کاتێك بەلاتینی دەینووسین، پێویستمان بە بزرۆکەیەك دەبێت، وەك: wilat , wirya ، ئەم نیمچە کۆنسۆنانتەش، بەیارمەتی ئەو بزرۆکەیە، ئازادیی دەرکەوتنی دەدرێتێ و گۆدەکرێت.

٣- (و) ی کراوە (O)، بە واوێکی نیشانەی (٧) لەسەر دەنووسرێت، وەك : (خۆر، کۆڕ، چۆڵ، دۆڵ....).

٤- واوی کۆنسۆنانت (نەبزوێن)(W)، ئەگەر لە پێش و پاشی تیپێکی بزوێنەوە هات، بە واوێکی بێ نیشان، یەك(و)دەنووسرێت، وەك: داو، ڕاو، پیاو... . Daw – Raw- Pyaw

٥- دوو دەنگە (دیفتۆنگ)ی،/وێ/، وەك: شوێن، نوێن، کوێ، خوێ، ..... . پێویست ناکات تیپێکی تایبەت و سەربەخۆی بۆ دابنرێت، چونکە دەنگێکی ڕەسەنی کوردییەو لە دوو تیپی (و) و (ێ) پێکهاتووە و هەمیشە چۆن بنووسرێت، وا دەخوێنرێتەوە.

٦- دەنگی/ وی/ یش، هەر دەنگێکی ڕەسەنی کوردییەو لە دیالێکتی کرمانجیی باکوور و لە شێوەزارەکانی تری، وەك: لوڕی و گەرمیان و سلێمانییشدا هەیەو لە دوو تیپی (و) و (ی) پێکهاتووە، وەك: (سویر، دویر، ژویر، زویر...)، پێویستە هەر چۆن گۆ دەکرێت هەرواش بنووسرێت و پێویست بە تیپێکی تایبەت ناکات.

٧- واوی سەرەتای وشە، وەك: ( ولات، وریا، ورد، ورچ، وتی.... . پێویستە بەیەك واو(و) بنووسرێت نەك دوو(وو)، چونکە لە زمانی کوردیدا، بزوێن لەسەرەتای وشەوە نایەت، سەرەڕای ئەوەی ئەگەر ( وو- û)، بزوێن بوایە، دەبوو ( ئـ) لە پێشیەوە پەیدا ببێت و بوترێت(ئووشە، ئووریا)، کەوا نا وترێت، دیارە واوی سەرەتای ئەو وشانە، (W)ە، کە نەبزوێنە، وشەش لەزمانی کوردی بە نەبزوێن دەست پێ دەکات.

٨- (و)ی بزوێن، وەك : (کوڕ ، گورج، گورگ....)، لە (و)ی نەبزوێن، وەك: (وەرە، چاو، ڕاو..)، بە شێوە جیانەکرێنەوە.

٩- (و)ی پێکەوەبەستن(واوی عەتف)، بەشێوەیەکی سەربەخۆ، بۆ پێکەوەبەستنی دوو وشەو دوو دەستەواژەو دوو ڕستەیش بەکاردێت و نالکێنرێت بە هیچ کامێکیانەوە، وەك: (من و تۆ، ڕێ و بان، ئێمە و ئێوە، من گوڵەکان دەڕوێنم و تۆش ئاویان بدە ... تاد).

١٠- تیپی(وو)لەم وشانەی خوارەوەدا:

| **جۆری یەکەم** | **جۆری دووەم** |
|---|---|
| ووتی | وتی |
| وورچ | ورچ |
| کاووڕ | کاوڕ |
| باووك | باوك |

دەردەکەوێت کە ( ووتی - وورچ ) لەگەڵ ( کاووڕ ، باووك) دوو باری جیاوازن، بۆ نووسینی ئەم وشانەش دروستتر وایە بە جۆری دووەم بنووسرێن، چونکە:

١– لـە نموونــەكانی ـ (ووتــی، وورچ) دا، دەنگــی/ و/ی یەكـەم، نیمـچە ڤاوڵـەو دەنگی/ و/ی دووەم بزرۆكەیە( ڤاوڵە)، كەلەم ئەلفوبێیەدا وێنـەی بـۆ نەكێشراوە، كەواتە وشەكانی (وتی، ورچ) لەیەك بڕگە پێك دێن، نەك دوو بڕگە، هەروەهایش لە ڕووی بڕگەی دەنگسازییەوە ( phonology )، بەم شێوەیەی لی دێت:




٢–نموونەكانی ( كاووڕ ، باووك) لەگەڵ دوو نموونەكەی(ووتی، وورچ)دا جیاوازن، چونكە/ و/لەم نموونانەدا، تەنیا لـە نیمـچە ڤـاوڵ پێكهـاتوون و، لەگـەڵ وشـەكانی پـاش خۆیانـدا هێـشووە كۆنـسۆنانتیان دروسـت كـردووە، لەبەرئـەوە ئـەم وشـانە لەیەك بڕگە پێكهاتوون، نەك دوو بڕگە، بەم شێوەیەی خوارەوە:




١- **گرفتی تیپی ( ی ):**

١– تیپی (ی) ی بێدەنگ ( واتە: y)، وەك:

یـاد، یـار، یـاڵ،......لـە زمـانی کوردیـدا، یـەك فۆنیمـە نـەك دوو، هەرچـەندە هەندێجار کورت و هەندێجاریش درێژ گۆ دەکرێت، بەڵام واتا ناگۆڕدرێـت و فـۆنیمی تر ناهێنێتەکایەوە، بۆیە پێویست بە نیگاری تر ناکات.

٢- تیپی (ی)ی دەنگدار ( واتە: $\hat{\mathrm{i}}$)، لە وشەکانی، وەك:

زەوی، پـەری ،کـانی، خـانی....، یـەك فۆنیمـە نـەك دوو، هەرچـەند هەنـدێجار کـورت و هەنـدێجاریش درێـژ گۆدەکرێـت، بـەڵام واتـا ناگۆڕدرێـت و فـۆنیمی تـر ناهێنێتەکایەوە و پێویست  بە نیگاری تر ناکات، ئەم دوو دەنگی/ی/ یە، بە تیپـی عەرەبی بەیەك شێوە دەنووسرێن، بەڵام بە تیپی لاتینی جیاوازن، کە ($\hat{\mathrm{i}}$ - y)یە.

٣- تیپی (ی) بزوێنی ( دەنگداری) فرەکورت ( بزرۆکـە)، کەلـە ئـەلفوبێی لاتینیدا، نیشانەی (i) ی دراوەتیێ، وەك:

من min، ژن  Jin، کوردستان Kurdistan ......، کە لە نووسینی کوردی بـە ئـەلفوبێی عـەرەبی وێنـەی نییـە و پێویـست ناکـات، تیپێکـی سـەربەخۆی بـۆ دابنرێت.

٤- بڕگەی ( یە) لە دوای تیپی(ی)وە:

پێویستە ئەگەر بڕگەی ( ی)، بەدوای(ی)درێژ یان(ێ)کـراوەدا هـات(ی)، لـە پاڵیدا بنووسرێت و پێوەی بلکێنرێت، وەك: (ئەم دێیە، ئەو ڕێیە، ئەو کانییە...) ، نەك: (ئەم دێ یە، ئەو ڕێ یە، ئەو کانی یە).

٥- تیپی (ی) ی کۆتایی وشە:

ئەگەر(ی)ی، خستنەسەر( ئیزافە) یان(وەسف) چووە سەر ئەو وشانەی بە(ێ) یان(ی)ی، درێژ کۆتاییان دێت، بۆ ئاسانیی خوێندنـەوە و نووسـین، پێویـستە بـە دوای وشەکەوە بلکێنرێت، وەك: ترێی سـپی، کـانیی ئـەو دێیـە...، نـەك: تـرێ ی سپی، کانی ی ئەو دێ یە....

٦- نیــشانەکانی(ی)ی، دەنگــدارو( ی)ی بێــدەنگ، واتــە: ($\hat{\mathrm{i}}$) و () ) لــە ئەلفوبێی تیپـی عەرەبیـدا، هـەردووکیان هـەمان هێمـای(ی) یـان هەیـە، بـەڵام لـە ڕاستیدا لێك جیان و لەکاتی بەدوای یەکترهاتنیاندا، دەبێـت هـەردووکیان پێکـەوە بلکێنرێن، وەك: زەوییەکە، ڕێوییەکە، دیارییەکە.. نەك: (زەوی یەکە، ڕێوی یەکە، دیاری یەکە).

٧- ئەگـەر سـێ تيپـى(ى) بـەدواى يـەكتردا هـاتن، دەبێـت بەسـەريەكەوە بنووسـرێن، وەك:(بنـچينەييەكان، كۆتاييـەكان، لادێييـەكان) نـەك (بنـچينەيى يەكان، كۆتايى يەكان، لادێ ييەكان)... .

٨- (ێ)ى، خستنەسەر( ئيزافە)، يان بۆ پێكەوەبەستنى ناوو ئاوەڵناو، لەگەڵ وشـەكەى پێـشەوەيدا پێكـەوە دەنووسـێنرێن، وەك:( ناسـكە هـەرمێى وەڕاز(*)، ماسيى دوكان..)نەك (ناسكە هەرمێ ى وەڕاز ، ماسى ى دوكان..).

٩- هەر وشەيەك، بە تيپە بزوێنى (ى) و( ێ) يـان هـەر بزوێنێكـى تـر كۆتـايى هاتبێت، هەر شتێكى بەدوا داهات، ناوگرێكى نەبزوێن(ى) يەكى نەبزوێنى دەخرێتە سـەر و لەگـەڵ وشـەى يەكەمـدا پێكـەوە دەنووسـێنرێن، وەك: ( نوێيـە، ماڵييـە، هەرمێيە، سێيەم) نەك: (نوێ يە، ماڵى يە، هەرمێ يە، سێ يەم).

١٠- گرفتى(ى)ى كورت و(ى)ى درێژ:

پێويـست ناكـات(ى) ى درێـژ، بـە نيـشانەيەك لـە(ى) ى كـورت جيابكرێتـەوە، چونكە ئەگەر(ى)، لە دواى تيپى دەنگدارەوە هات، يا ڕۆڵى جێناوى لكاوى بينيبێ دەنگەكەى بە كورتى گۆ دەكرێت و لە دەم دێتە دەرەوە، وەك: ڕاى كرد، داى نا، بۆى برد.

١١- هەر كاتێك تيپـى(ى) كەوتـە دواى دوو تيپـى بـێ دەنگـەوە، درێـژ لـەدەم دێتە دەرەوە، وەك: خستى، ڕشتى...تاد.

١٢- (يى) : ئەم ( يى) يە، لە زۆر نووسيندا، لـە دەسـتوورى خـۆى لاى داوەو، بەهەڵە دەنووسرێت، وەك: هەولێريى، ڕۆشنبيريى، چونكە ئەم ( يى ) يە، هەميشە لەدواى ئەو وشانەوە دێت، كە بە تيپى بزوێن كۆتاييان هاتووە و، بۆ( دانـە پـاڵ) بەكادرێت، وەك: بەرزنجـەيى، قرگـەيى، چـوارتايى، جـوانڕۆيى، بـاڕۆيى، گـەدايى، برايى، تارمايى و ....تاد.

١٣-(ى) ى ئامرازى پێوەندى، بەتايبەتى دواى ئەو وشـانەى بـە(ى)كۆتاييـان دێت، دەبێت بنووسرێت، بەڵام پێويستە پێكـەوە بلكێنـرێن( نـەك بـە جيـا)، وەك: مراويى نێر ( نەك مراوى ى...) ، سينيى چا، ( نەك سينى ى چا) .... .

---

(*) ناوى دێيەكە لە ناوچەى شارباژێڕ.

١٤- هەموو ( ی-Î)یەکی ناوەڕاستی وشەی کوردی (درێژە) و هەر بەیەك (یـ)دەنووسرێت و نیشانەی تایبەتی ناوێت، وەك: (پەنیر، شیر، هەنجیر، تیر، سیر...تاد).

**٢- (ر)و( ڕ) :**

له زمانی کوردیدا، (ر) و(ڕ)، دوو نرخیان هەیەو، دوو فۆنیمی جیان، چونکە لەناو سیستەمی دەنگزانیی زمانی کوردیدا دوو نرخی جیایان هەیە، بۆیە لەهەر شوێنێکدا (سەرەتا ، ناوەڕاست، یان کۆتایی وشە) دەربکەون، شێوەیان چۆنە دەبێت وا بنووسرێن و، ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت: ( لەبەرئەوەی کە هەموو (ر) یەك کە بکەوێتە سەرەتای وشەی کوردیی ( قەڵەو)ە، بۆیە لە نووسیندا، پێویست ناکات نیشانەی قەڵەوی (٧) بۆ دابنرێت)، ئەمە بۆچوونێکی نادروستە و دەرنەکەوتنی (ر)ی لاوازی سەرەتای وشەی کوردی، یاسایەکی دەنگزانییە لە زمانی کوردیدا و پەیوەندی بە(ڕ)ی، قەڵەوەوە نییەو، ئەوانەی وا دەڵێن، دەبێت ئەوەش بزانن، کە زۆربەی ئەو لامانەی(ل) بە دوای ئەلف(ا)دا دێن لە زمانی کوردیدا، قەڵەون، وەك: ماڵ، خاڵ، پاڵ، هەڤاڵ، گاڵ، شاڵ، ناڵ،داڵ لاڵ، کاڵ، تاڵ....تاد. ئەگەر (وا) بێت، کەواتە نابێت نیشانەی قەڵەوی (٧) بۆ( ل) ی دوای (ا) دابنرێت کە ئەمەش نابێت....!

(ر) و (ڕ) لە زمانی کوردیدا، دوو فۆنیمی جیان، چونکە لەم زمانەدا جووتە وشەی وا هەیە کە لەهەمان دەوروبەردا ئەم دوو دەنگە جیاوازەیان تێدا دەردەکەوێت و واتای جیایان پێ دەبەخشن، وەك:( کەر – کەڕ)، ( برین – بڕین)، ( تێر – تێڕ)، (بەرە – بەڕە)، (کوران– کوڕان) ....تاد، لەدەوروبەری (کە( ...)) و( بـ(....) ین) و ( تێـ( ....) ) دا دەردەکەون، ئەم دوو دەنگە، لە زمانی عەرەبیشدا هەن، وەك: لە وشەی ( کریم) و ( رحیم) دا، دەردەکەون، بەڵام لە سیستەمی دەنگزانیی زمانی عەرەبیدا بە دوو شێوەی جیای هەمان فۆنیم دەژمێردرێن، چونکە ناتوانن هەردووکیان لە هەمان دەوروبەردا دەربکەون و بە ئاڵوگۆڕکردنیان واتاکان بگۆڕدرێن. واتا، فۆنیم شتێکی ڕووتە (abstract)، چەند دەنگێکی جیا دەنوێنێ لە زمانێکی تایبەتیدا، ئەم دەنگانە شێوەی جیا، بەپێی ئەو دەوروبەرە جیاوازانەی تێیاندا دەردەکەون، دەگرنە خۆ.

دەنگسازی ( phonology)، ئەو بەشەی زانستی زمانە، لەو یاسایانە دەكۆڵێتەوە كە بەهۆیانەوە دەنگەكانی زمانێكی دیاریكراو بۆ برگە دروستكردن لێك دەدرێن و یەك نرخ دەدەن بە كۆمەڵە دەنگێكی جیاواز، كە لەوانەیە، هەمان كۆمەڵە دەنگ لە زمانێكی تردا دەربكەون و كۆمەڵە نرخێكی تێدا پیشان بدەن، واتا دەنگزانی (phonetics )، شتێكی گشتییەو دەنگسازی (phonolog)، تایبەتییە، فۆنەتیك پێمان دەڵێ: (ر) و (ڕ) ، (س) و(ص)، (ل) و(ڵ) چۆن دروست دەكرێن و بۆ جیاوازن، بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی ئەم دەنگانە، سەر بە چ زمانێكن، كەچی لە ئاستی فۆنۆلۆجیدا (ر) و (ڕ) لە زمانی كوردیدا، دوو نرخیان دەدرێتێ و لە عەرەبیدا یەك و ( س) و ( ص) لە زمانی كوردیدا، یەك نرخیان دەدرێتێ و لە عەرەبیدا دوو..تاد. بەوپێیە، (ر) و (ڕ) دوو فۆنیمی جیان، چونكە لەناو سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی كوردیدا، دوو نرخی جیایان هەیە، بۆ نموونە، جیاوازیی نێوانیان، وەك جیاوازیی نێوان ( پ) و ( ج) یان ( ك) و ( ش) یان هەردوو فۆنیمێكی تروایە، بۆیە لەهەر شوێنێكدا دەربكەون، شێوەیان چۆنە دەبێ وا بنووسرێن.

**(یەكەم) گرفتی نووسینی وشەی عەرەبی:**

وشەی عەرەبی لە كوردیدا چۆن بنووسرێت؟ بۆ نووسینی وشەی عەرەبی لە كوردیدا، دوو بۆچوون هەیە:

١- دەبێت وشەی عەرەبی لە كوردیدا، وەك خۆی و بێ دەستكاری بنووسرێت، وەك: (**حَج**) ، (**مَذهب**) ، (**زَكاة**)، (**صَلاة**)، (**وَصف**).

٢- بە ڕێنووسی كوردی بنووسرێت( بكوردێنرێت) وەك چۆن كورد گۆی دەكات، بەمەرجێك واتای بنچینەیی وشەكە نەگۆڕدرێت، وەك: (حەج، مەزهەب، زەكات، سەلات، وەسف)... . و ئەگەر نەتوانرا وشەكە بە كوردی بنووسرێت ئەوا پێویستە لە نێوان دوو كەوانەدا، بە عەرەبی بنووسرێت. ئێمە بۆچوونی دووەم بە پەسند دەزانین و پێویستە وا بنووسرێت.

**(دووەم) *چەند سەرنجێكی گرنگ:**

١- ئەوەی لە زمانزانیدا ( زانستی زمان)دا، ئاشكرابێت ئەوەیە، كە دەبێت لە برگەدا دەنگی بزوێن هەبێت، هەر لەبەرئەوەشە كە ژمارەی برگەكانی هەر وشەیەك

هێنــدەی ژمــارەی دەنگــە بزوێنــەکانی ئــەو وشــەیە دەبێــت، بــۆ نموونــە، لــە وشەی(گۆران) دا، دوو بزوێن هەیـەو ئەمـەش بۆتـە هـۆی بـوونی دوو بڕگـە، وەك: (گۆ–ران)، بـەلاَم، وشـەی(گـۆرانی)، سـێ بڕگەیـە ( گـۆ–را– نـی) ، چـونکە سـێ بزوێنی تێدایە.

٢– یەکێك لەو ڕەخنانەی لە گشت شـێوە ڕێنووسـێکی کـوردی بـە ئـەلفوبێی عەرەبی دەگیرێت ئەوەیە، کە بزوێنی ( و– u) لە کۆنسۆنانتی ( و–w) و بزوێنـی ( ی – î) لە کۆنسۆنانتی ( ی – y) لێك جیانەکراونەتەوە.

ئەو دوو دەنگە بزوێنە( و – u) ، ( ی – î) کەلە گۆکردن و کاردا، لەگەلٚ ( و– w)، ( ی–y) ی کۆنسۆنانت جیاوازن و، دەبوو لە ڕێنووسدا نیگاریان، مۆرکی ئەو جیاوازییەی پێوە دیاربوایە.

٣– چۆن ڕێنووس پێوەندیی بە فۆنەتیکەوە هەیە، پێوەندی بـە ڕێزمانیـشەوە هەیـە، بۆیـە پێویـستە دەسـتوورەکانی ڕێنـووس لەبـەر تیـشکی ڕێزمانـدا تەماشـا بکرێن و پێکەوە گونجان و نەگونجانیان ڕەچاوبکرێت.

بزوێنـی (ی–î) لە زمانی کوردیدا یەك فۆنیمە، نەك دوو، هەرچەندە هەنـدێجار کورت و هەندێجاریش درێژ گۆدەکرێت، بەلاَم بەمـە واتـا ناگۆڕدرێـت و فـۆنیمی تـر ناهێنێتەکایەوە، کە فۆنیمی تریش نەبوو، ئیتر پێویست بە نیگاری تـر ناکـات. لـە دەیان وشەی وەك( بیر، تیر، لیر، شیر، پیر، میر، سـیر، هـەجیر، پـەنیر...) دا کـە بزوێنی(ی) درێژ بەدەمدا دێت، کە ئەگەر کـورتیش بکرێتـەوە، وشـەی نـوێ پەیـدا نابێت و، دیارە هـەموو (ی–î) یـەکی ناوەڕاسـتی وشـەی کـوردی درێـژەو هـەرگیز کـورت نابێـت، تـەنیا مەگـەر وشـەیەك دوو( ی–î) تێـدا بێـت و(هێـز – stress) بکەوێتە سەر یەکێٚکیان، ئەوکاتە ئەوی تریان کەمێك کـورتتر گۆدەکرێـت، ئەمـەش دیاردەیـەکی فۆنەتیکییـەو ئاشـکرایە هـەر بزوێنێـك هێـزی لەسـەر بێـت زۆرتـر دەردەکەوێت،( ی–î) ی کۆتایی وشەیش کە هەنـدێجار کـورت دەردەبڕێـت، هـۆی ئەوەیـە کـە هێـزی لەسـەر نییـە، یـان بۆتـە ( ی–y) ی کۆنـسۆنانت، بەوپێیـە، نووسینی بزوێنی ( ی–î) چ بە دوو ( ی) و چ بە ( ی) یەکی کەشیدە لەسەر نییە( کۆڕی زانیاریی کورد وتەنی) هەڵەیە.

بەم پێیە، نیشانەی (i̇)، کورتە بزوێن بێت یان هێز، لەبەرئەوەی دەوری برگە جیاکردنەوە دەبینێت، بۆ نووسین جیاوازی ناکات و پێویستی بە نیشانە هەیەو دەبێت لە ئەلفوبێی عەرەبیشدا نیگاری بۆ دابنرێت، بۆ نموونە ئەم وشانە ( ئایین Ayin، مایین Mayin، مەییو Meyiw، گەییو Geyiw، پاییز Payiz ....).

**(سێیەم) نووسینی ژمارە، لە (١١ تا ١٩):**

ئەگەر سەرنجی ژمارە (١٢) بدەین، دەبینین لە کوردیدا، بە پێنج جۆر دەبیسترێت: (دوانزدە، دوانزە، دوانگزدە، دوانگزە، دوازدە)، لەم وشانە پێك دێت:

( دوو+ ان + نیز+ دە)، کە ( ان) ژمارە دابەشکارییە، ( (نیز) وشەی (عەتفی فارسی) یە بە واتا ( لەگەڵ))، جا، بۆ سووکی و ئاسانی گۆکردن، هەندێك گۆڕانکاری تێدا ڕوویداوە، وەك:

لە وشەی (نیز)، برگەی (نی) فڕێ دراوە و (ز) هێڵراوەتەوە و بووە بەو (دوانزدە، سیانزدە، پانزدە).

لە هەندێ ناوچەدا، بەتایبەتی سلێمانی، تیپی( د) ی وشەی( دە)، دەکەن بە (گ) و لەگەڵ تیپی (ز)، شوێنگۆڕکێیان پێ دەکەن و بەمجۆرە گۆی دەکەن: ( دوانگزە، سیانگزە، پانگزە، شانگزە...)

(٣) لە هەندێ ناوچەی تردا، تیپی (ن) لە ئامرازی (ان) فڕێ دەدەن ( کلۆری دەکەن) و دەڵێن: یازدە، دوازدە، سێزدە،چواردە، پازدە، شازدە..).

(٤) لە هەندێ ناوچەی تریشدا، تیپی(د)لە وشەی(دە)لادەبەن یان کلۆری دەکەن و دەڵێن: ( یانزە، دوانزە، ...تاد)

(٥) ژمارە(یازدە، دوازدە، سێزدە، چواردە، پازدە، شازدە، حەڤدە، هەژدە، نۆزدە،....) گۆڕانێکی کەمی بەسەردا هاتووە و پەسندترینیانە.

(٦) شوێنگۆڕکێی دوو تیپ لەوشەیەکدا: لە هەندێ وشەدا، شوێنگۆڕکێ بە دوو تیپ دەکرێت، بێ ئەوەی کار بکاتە واتای وشەکە، کە شتێکی سروشتییە لە هەموو زمانێکدا، بۆیە بەکارهێنان و نووسینی هەردووکیان، دروستە، وەك:

جەرگ، جگەر، برِوانە، بنواڕە، زیخ، خیز، ڕفان، فـڕان، جـوێن، جنێـو، مێرووڵـە، مێلوورە،..تاد، بەڵام ئەگەر بەو شوێنگۆڕکێیە، واتا گۆڕدرا، نابێ بکرێت.

**(چوارەم)- بایەخ نەدان، بە تیپی( ب) لە گۆکردن و نووسیندا:**

**لە هەندێ فرمانی داخوازی و پێبەندکاریدا، پێشگری (ب) ، بایـەخی پێ نادرێت و نانووسرێت، کە پێویستە بۆ پاراستنی بوونی، بایەخی پـێ بدرێت و بنووسرێت، بەڵام لەبەرئەوەی لە چاوگی ناسادەدا کە دەیکەینـە کـاری داخـوازی، دەتـوانرێ (ب)بنووسـرێ یـا نەنووسـرێ، کـە پێویـستە بنووسرێ، وەك:**

| | | |
|---|---|---|
| **هەڵ بپەڕە** | **نەك** | **هەڵپەڕە** |
| **دابېەزە** | **نەك** | **دابەزە** |
| **ڕابکات** | **نەك** | **ڕاکات** |
| **وەربگرە** | **نەك** | **وەرگرە** |
| **دابوەشێیت** | **نەك** | **داوەشێیت** |

**(پێنجەم) بایەخ نەدان، بە تیپی (ت)، لە گۆکردن و نووسیندا:**

لـە هەنـدێ وشـەدا، لـە وتـن یـان نووسـیندا، بایـەخ بـە تیپـی(ت) نادرێـت و نانووسـرێت، کـە پێویـستە بـۆ پاراسـتنی بـوونی، بوترێـت و بنووسـرێت، یـان بـا بنووسرێت، ئەگەر نەوترێت و گۆنەکرێت، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| **دەفڕێت** | **نەك** | **دەفڕێ** |
| **دەکڕێت** | **نەك** | **دەکڕێ** |
| **دەنوێت** | **نەك** | **دەنوێ** |
| **دەستەسڕ** | **نەك** | **دەسەسڕ** |
| **دەستاودەست** | **نەك** | **دەساودەس** |

**(شەشەم) بایەخ نەدان بە تیپی (د) لە نووسین و گۆكرندنا:**

لە هەندێك وشەدا، بایەخ بە وتن یان نووسینی(د) نادرێت، كە دەبێت بوتریت و بنووسرێت، خۆ ئەگەر بنووسرێت و لە گۆكرندا نە وترێت ئەوە ئاساییيە، وەك ئەوەی بنووسرێت:

| | | |
|---|---|---|
| كڕاندی | نەك | كڕانی |
| دڕاندی | نەك | دڕانی |
| هەژاندی | نەك | هەژانی |
| فڕاندی | نەك | فڕانی |

**(٣) گرفتی وشەی لێكدراو:**

وشەی لێكدراو، لە زمانی كوردیدا، ئەركێكی گرنگی لە ئەستۆدایە، چونكە دەبێتە هۆی فراوانبوون و گەشەكردنی زمانەكەمان و هێنانەكایەی وشەی نوێ بە واتای نوێ.

بۆ دروستكردنی وشەی لێكدراو دوو بنەما هەیە:

یەكەم: لە پێكگەیاندنی دوو وشەی سەربەخۆ، یان زۆرترو، پێكهاتنی وشەیەكی نوێ، بە واتایەكی نوێ لەڕستەدا، ئەگەرچی وشە نوێیەكە، واتە وشە (لێكدراوەكە)، لە چەند وشەیەكیش پێكهاتبێت، مامەڵەو ڕەفتاری تەنیا وشەیەكی لەگەڵدا دەكەین و بەو وشە لێكدراوە نوێیانە دەوتریت(وشەی دروستكراو)، وەك:

– وشەی ( دوو ڕوو)، كە بە یەكێك دەوترێت، بێباربێت لە ژیانداو، لە دوو وشە پیكهاتووە،(دوو) و( ڕوو) و ئەمانەیش چەند نموونەیەكن:

| **وشەی سادە (سەربەخۆ)** | **وشەی لێكدراو (دروستكراو )** |
|---|---|
| مزر+ە+سێو | مزرەسێو |
| شا + سوار | شاسوار |
| سەر + خۆش | سەرخۆش |
| گوڵ + بە + دەم | گوڵبەدەم |

دووەم: لە پێکگەیاندنی ئامرازێك بە وشەیەکی سەربەخۆ، جا، ئەگەر ئامرازەکە خرابێتە پێش وشەکەوە، ئەوا پێی دەوترێت:( پێشگر) و ئەگەر خرابێتە پاش وشەکەوە، پێی دەوترێت:( پاشگر) و بەو وشە لێکدراوەی لەم پێکگەیاندنە پەیدا دەبێت، دەڵێن:( وشەی ڕەگدار)، وەك:

| وشە | ئامراز | وشەی ڕەگدار |
|---|---|---|
| کڕ | یار | کڕیار |
| باخ | ەوان | باخەوان |
| خۆر | اك | خۆراك |

ئەو ئامرازانەی دەخرێنە سەر وشە دوو جۆرن:

یەکەم: ئەوانەی کە واتای ئەو وشەیەی(کە دەخرێتە سەری)دەگۆڕن و وشەیەکی نوێ سازدەکەن، وەك:

| وشە | ئامراز | وشەی نوێ |
|---|---|---|
| بەر | وانکە | بەروانکە |
| هێڵ | ەك | هێڵەك |
| فڕ | ۆکە | فڕۆکە |

دووەم: ئەوانەن کە دەخرێنە سەر وشە، واتاکەی ناگۆڕن، بەڵکو دەبێتە هۆی دەرخستنی فرمان(کار)، کاتی فرمان، باری ناو و جێناو و ئاوەڵناو لەگەڵ یەکتردا، یان پیشاندانی باری کۆ، وەك:

| وشە | ئامراز | وشەی نوێ |
|---|---|---|
| ژن | ان | ژنان (چەند ژنێك پیشان دەدات) |
| جوان | تر | جوانتر ( ئاوەڵناوی بەراورد) |
| هات | دە | دەهات ( کاتی فرمان دەردەبڕێت) |
| کاڵ | ێ | کاڵێ ( پێی دەناسێت) |

## ڕێزمانی وشەی لێکدراو

**ڕێبازی یەکەم:**

**١- ئەگەر یەکەم وشەی، وشە لێکدراوەکە بە ( تیپە نەلکاو) کۆتایی هاتبێت، ئەوا بەبێ یارمەتی دەدرێنە دەم یەکتر و هیچ گرفتێك لە نووسینیاندا نییە، وەك:**

| وشەی شادە | وشەی لێکدراو |
| --- | --- |
| دار ، بەڕوو | داربەڕوو |
| چاو، کاڵ | چاوکاڵ |
| پەڕۆ ، کۆن | پەڕۆکۆن |
| شا ، توو | شاتوو |

٢- ئەگەر وشەی، وشە لێکدراوەکە بە ( تیپە لکاو) کۆتایی هاتبێت، وەك ( دڵ پاك)، ئەوا ئەم جۆرە وشە لێکدراوە، هەندێ گیروگرفتی نووسینی تێدا دەبێت، چونکە دەشێت بە دوو شێوە بنووسرێت، یان دوو وشەکە پێکەوە بنووسرێن (دڵپاك)، یان بە جیا( دڵ پاك)، بەڵام کامیان ڕاستە؟! بۆ ئەمە دوو بیروڕا هەیە:

یەکەم: دەبێت ئەو وشە لێکدراوانە پێکەوە بلکێنرێن، چونکە یەکەم وشە، بە تیپێك کۆتایی هاتووە، کە دەشێت بلکێت بە وشەی دووەمەوەو نووسەر لە کاتی نووسیندا، دەست لە نووسین هەڵناگرێت و سفتتریش دادەڕێژرێت، لەوەی کە بە جیا لە یەکتر بنووسرێن.

دووەم: نابێ لە وشەی لێکدراودا، وشەکان پێکەوە بلکێنرێن، چونکە دەبێت هەر وشەیە، قەوارەی خۆی بپارێزرێت، وەك دانەیەکی دەنگیی سەربەخۆ. خاوەنانی ئەم بیروڕایە دەڵێن: (بۆچی لامان گران نییە وشەی(کلاّفە دەزوو، کۆتەرە دار، گوێ سەربانە،( گوێ سەبانە)، تۆپەڵە قوڕ،....) بە جیا بنووسین، کەچی پێمان گران بێت وشەی( دڵ تەڕ، چین چین، دەنگ گڕ، نووك تیژ، ماسی گرە،،....)) بە جیا بنووسین، هەر لەبەرئەوەی کە یەکەم وشە، لە نموونەکانی یەکەمدا بە تیپە نەلکاو کۆتایی هاتووە و لە نموونەکانی دووەمدا، بە تیپە لکاو، بۆیە ڕاستتر و گونجاوترو ئاسانتریش وایە، کە وشەی لێکدراوی بەبێ یارمەتی دراوە دەم یەکتر، پێکەوە بنووسرێت، وەك:

( **ملپێچ، پێشنوێژ، داوێنپاك، ڕاستگۆ، تێبینی، باوکمردوو**،....).

**ڕێبازی دووەم:**

ئەگەر وشەی لێکدراو بە بۆنەی ئەم ئامرازانەوە درانە دەم یەکتر، دیسان هیچ گرفتێك لە نووسینیاندا نییە:

تیپە بزوێنی (ە)، کە دەخرێتە نێوان هەردووکیانەوە، وەك: ( بەرد+ ە+پێ= بەردەپێ)، هەروەها: ( گەردەلوول، بەردەباز، ڕەشەبا، مێرگەپان، کلکەبێڵ، دەسکەچەقۆ...)

ئامرازی(ەو)، وەك: بانەوبان، ساڵەوساڵ، شاخەوشاخ، ماڵەوماڵ، شارەوشار..تاد.

**٣- ئامرازی (او)، وەك: چلاَوچڵ، پشتاوپشت، گەرماوگەرم، دەماودەم، دەستاودەست، شەواوشەو، جەژناوجەژن...تاد.**

**ڕێبازی سێیەم:**

ئەو وشە داڕێژراوانەی، کە بەو ئامرازو پاشگرانەی واتای وشەکە دەگۆڕن، بووبێتە وشەی داڕێژراو، بە دوو جۆر بەبێ گرفت پێکەوە دەنووسرێن:

یەك: ئەگەر وشەکە لەوانەبێت کە بە تیپە نەلکاو کۆتایی هاتبێت، ئەوا بە ئاسانی و بەبێ گرفت دەردرێنە دەم یەکتر، وەك:

- **دار + ستان = دارستان**.
- **ئاسن + گەر = ئاسنگەر**.
- **مزر + ۆکە = مزرۆکە**.

دووەم: ئەگەر وشەکە بە تیپە لکاو کۆتایی هاتبێت، ئەوا، وشەو پاشگرەکە، بە ئاسانی دەردرێتە دەم یەکتر، وەك:

- **هەڵووك + ێن = هەڵووکێن**.
- **چاو + یلکە = چاویلکە**.
- **داس + ولکە = داسولکە**.
- **کرێ + کار = کرێکار**.

**ڕێبازی چوارەم:**

ئەگەر وشە لێکدراوەکە، بە داتاشین، واتە بە فڕێدانی بڕگەیەکی وشەیەك لە دوو وشە لێکدراوەکە، بووبێتە وشەی لێکدراو، دوو ڕێچکە بۆ یەکگرتنیان هەیە:

**یەکەم**: وشە داتاشراوەکان، ئەگەر لەوانە بوون کە پێکەوە بلکێنرێن، پێکیانەوە دەلکێنین، ئەگینا جیا بە جیا دەیان دەینە دەم یەکتر، وەك: وشەی (جوامێر)، کە لە بنچینەدا، لە دوو وشەی داتاشراو پێکهاتووە، وشەی(جوا)کە کورتەی (جوان)ە، دووەم، وشەی(مێر)، کە کورتەی وشەی(مێرد)ە و هەروەها:

- مرواری.
- نیوەڕۆ.
- بۆگەن.
- باگوردان، ..تاد.

**دووەم**: ئەگەر:

١- وشەی دووەمی وشە لێکدراوەکە، بە هەمزە( ئـ) دەستی پێ کردبوو، ئەوا لە لێکدانی ناودا، هەمزەکە فڕێ بدرێت، واتە ئەگەر ویستمان وشەی(بەرد) و وشەی(ئاش)کە بە هەمزە دەستی پێ کردووە، بدەینە دەم یەکتر، ئەوا هەمزەکەی لێ لادەبەین و ئینجا دەیاندەینە دەم یەك، وەك:
- **بەرد+ئاش=بەرداش** (**نەك بەردئاش**).
- **ناواخن** (**نەك ناوئاخن**).
- **خۆشاو**(**نەك خۆشئاو**)......**تاد**.

٢- ئەگەر یەکەم وشەی وشە لێکدراوەکە، بەتیپە بزوێنی(ە)کۆتایی هاتبوو، وەك: ( بە، لە) و دووەم وشەی بە هەمزەی(ئـ)دەستی پێکردبوو، وەك (ئەو، ئەوێ) ئەوا داتوانرێت: بۆ سووکی، تیپە بزوێنی(ە)لەیەکەم وشەو تیپی دەنگیی /ئـ / لەدووەم وشە فڕێ بدەین و بیاندەینە دەم یەك، وەك:
- **بەئەو** – **بەو**.
- **لەئێرە** – **لێرە**.
- **بەئەوان**– **بەوان**.
- **لەئەمەودوا**– **لەمەودواو**.......**تاد**.

## بەشی شەشەم

**گرفتی پێشگر لە نووسیندا**

**یەکەم: پێشگر، ئەو مۆرفیمەیە، کە دەلکێنرێت بە پێشەوەی وشەو بۆ دروستکردنی واتایەکی نوێ، بۆ نموونە( لکاندنی مۆرفیمی(نە)ی نەرێ(نەفی) بە پێشی فرمانەوەوە، بۆ نەکردنی)، وەك:**

**- چوو-نەچوو ، هات- نەهات**

**- کرد- نەکرد ، خەوت- نەخەوت ....**

یان.... .

| پێشگر | | وشەو پێشگرەکەی |
|---|---|---|
| دە | ڕێزمانییە | دەچێت ، دەهات |
| نە | = | نەهات، نەدی |
| مە | = | مەگری، مەڕۆ، مەچۆ |
| نا | = | ناپیاو، نارەسەن |
| بێ | = | بێهۆش ، بێباك |
| دا | (داڕێژە) | دابڕا، دابەزی |
| ڕا | = | ڕاهات، ڕاپەری |
| دەر | = | دەرچوو، دەرهات |

دووەم: ئەو پێشگرانەی کە دەخرێنە سەر وشەکە، ئەگەر بە تیپە لکاو کۆتاییان هاتبوو، ئەوا دەلکێنرێن بە وشەکەوە، وەك:

| پێشکر | پێشگرو وشەکە |
|---|---|
| هەڵ | هەڵکەوت، هەڵکشا |
| ب | بڕۆ، بخۆ، بمرە، بژی، بکە ، بنووسە... |

## بەشی حەوتەم

**گرفتی ئامرازی پێوەندیی(ی )لە نووسیندا:**

لە زمانی كوردیدا، دەتوانرێت ناو: بە ڕاناو، بە ئاوەڵناو،.... تەواو بكرێت، بەڵام ئەو تەواوكردنە، بەبێ یاریدەی تیپە ناوگری(ی) نابێت، وەك:

هەیاسەی زیو

براكەی تۆ

كاڵەكی گەییو

جا ئەگەر وشە تەواوكراوەكە:

بە تیپە لكاو كۆتایی هاتبوو، ئەوا بە ئاسایی و بێ گیروگرفت، ئامرازی(ی) پەیوەندی پێوە دەلكێنرێت، وەك:

| | |
|---|---|
| **گۆشت، بەرخ** | **گۆشتی بەرخ** |
| **كراس، سپی** | **كراسی سپی** |
| **گوڵ، سوور** | **گوڵی سوور** |

ئەگەر بە تیپە نەلكاویش، كۆتایی هاتبوو، ئەوا بە ئاسایی و بێ گرفت، دەتوانرێت ناوگری(ی) بلكێنرێت بە وشە تەواوكراوەكەوە، وەك:

| | |
|---|---|
| **( هەیاسە، زیو )** | **هەیاسەی زیو** |
| **( چیا، قەندیل )** | **چیای قەندیل** |
| **( گوێز، هەورامان )** | **گوێزی هەورامان** |

## بەشی هەشتەم

**گرفتی تیپە ناوگری ( و ) ی عەتف:**

**( و)ی عەتف، ناوگرێكە، بۆ پێكەوەبەستنی دوو وشە، دوو دەستەواژە، دوو ڕستە، بەكاردێت لە نووسیندا و نالكێنرێت بە هیچیانەوە ، وەك:**

**کوڕ و کچ ، دارو بەرد ، سووروسپی.... .**
**دانا دەخوێنێتەوە و دارا دەینووسێت.**
**دەرگای حەوشەکە و پەرژینی باخەکە، لێکەوە نزیکن.**

کەواتە، (و)ی عەتف لە نووسینی کوردیدا، نابێت بلکێنرێت بە وشەکەی پێش خۆیەوە، سا ئیتر وشەکە بە تیپە لکاو یان نەلکاو کۆتایی هاتبێت)، بەڵام دەبێت لەگەڵیدا بخوێنرێتەوە.

## بەشی نۆیەم

### گرفتی پاشگر لە نووسیندا

| ( أ ) | ( ب ) |
|---|---|
| **لە پاش تیپە دەنگییەکانەوە** | **لە پاش تیپە بزوێنەکانەوە** |
| ١- دا | ١- دا |
| ٢- تر- ترین | ٢-تر- ترین |
| ٣- ێ – ێك | ٣- یێ – ییێك |
| ٤- ەوە | ٤- وە – یەوە |
| ٥- ەکە – ەکان | ٥- یەکە – یەکان |
| ٦- ەم – ەمین | ٦- یەم – یەمین |
| ٧- ە | ٧- یە |
| ٨- ان | ٨- یان |

لە لکاندنی ئەم پاشگرانەدا بە وشەوە، هەندێ گرفت ڕوو دەدەن و دەبنە هۆی سەر لێ شێوان لە نووسیندا، ئەمانەی خوارەوە چەند پڕۆژە ڕێگەیەکن بۆ چارەسەرکردنیان:
ڕێگەی یەکەم

١- ئەگەر ئەو وشەیەی، پاشگرەکەی دەخرێتە سەر، بە تیپە دەنگی کۆتایی هاتبوو، ئەوا بەبێ یاریدە، پاشگری(دا، تر، ترین، ێ، ێك، ە)ی دەچێتە سەر، بەڵام ئەگەر:

ا- تیپە دەنگییەکە، تیپە لکاوبوو، ئەوا پاشگرەکەی پێوە دەلکێنرێت، وەك:

| وشە | پاشکر | وشەو پاشگر | نموونە |
|---|---|---|---|
| هاوین | دا | هاوینـــدا | لـــە هاوینـــدا |
| کـــەرکووك | دا | کەرکووکـــدا | بـــە کەرکووکـــدا |
| جوان | تر- ین | جوانتر- جوانترین | گوڵێکی جوانتر، جوانترین گوڵ |
| نان | ی – ێك | نانێ – نانێك | |
| گوڵ | ە | گوڵە | ئەو گوڵە |

ب- تیپە دەنگییەکـە، تیپـە نـەلکاو بـوو، ئـەوا پاشـگرەکەی پێـوە نالکێنرێت، وەك:

| وشە | پاشگر | وشەو پاشگر | نموونە |
|---|---|---|---|
| بازاڕ | دا | بازاڕ دا | لەبازاڕدا ، بەبازاڕدا |

٢- ئەگـەر وشـەکە، بـە تیپـە دەنگـی کۆتـایی هـاتبوو، دەشـێت ئـەم پاشـگرانەی بخرێتـە سـەر( وە، کـە، کـان، م، مـین) بـە یاریـدەی تیپـە ناوگری(ە)، ئینجا ئەگەر:

ا- تیپە دەنگییەکە لکاوبوو، ئەوا پاشگرەکەی پێوە دەلکێنرێت، وەك:

| وشە | پاشگر | وشەو پاشگر | نموونە |
|---|---|---|---|
| هات | ەوە | هاتەوە | دەهاتەوە |
| کەرکووك | ەوە | کەرکووکەوە | لەکەرکووکەوە |
| هەشتەم | ە ( م مین ) | هەشتەم – هەشتەمین | |
| هەنگ | ە ( کە- کان ) | هەنگەکە – هەنگەکان | |

تیپە دەنگییەکە، نەلکاوبوو، ئەوا، پاشگرەکەی پێوە نالکێنرێت..وەك:

| وشە | ناو پاشگر | وشەو پاشگر |
|---|---|---|
| بەهار | ەوە | لە بەهارەوە |
| نارد | ەوە | ناردەوە |
| سەد | ە ( م – مین ) | سەدەم – سەدەمین |
| دار | ە ( کە- کان ) | دارەکە – دارەکان |

دووەم: پاشگری ( وە– ەوە):

پاشگری(وە)، بێ یاریدە دەکرێتە پاشکۆی ئەو وشانەی بە تیپە بزوێنــی (ا، ۆ، ە، ێ )کۆتاییان دێت، وەك:

| وشە | پاشگر | وشەو پاشگر | نموونە |
|---|---|---|---|
| خوا | وە | خواوە | لە خواوە |
| تۆ | وە | تۆوە | لە تۆوە |
| هێلکە | وە | هێلکەوە | بە هێلکەوە |
| خوێ | وە | خوێوە | بە خوێوە |

پاشگری(ەوە):

لە دوای تیپە بزوێنی(وو)ەوە، بێ یاریدە دەکرێتە پاشکۆ، وەك:

| وشە | پاشکر | وشەو پاشگر | نموونە |
|---|---|---|---|
| هێشوو | ەوە | هێشووەوە | بە هێشووەوە |
| زوو | ەوە | زووەوە | لە زووەوە |

لە دوای تیپە بزوێنی(ی)ەوە، بەیاریدەی ناوگری(ی)، دەکرێتە پاشکۆ، وەك:

خۆشی بە ( خۆشی) + ی+ ەوە= بە خۆشییەوە

بەیانی لە ( بەیانی) + ی + ەوە = لە بەیانییەوە

| وشە | ناوگر | پاشكر | وشەو پاشگر | نموونە |
|---|---|---|---|---|
| خۆشی | یـ | ەوە | خۆشییەوە | بە خۆشییەوە |
| بە یانی | یـ | ەوە | بەیانییەوە | لە بەیانییەوە |

سێیەم: نیشانەكانی ناسیاوی( كە، كان / ەكە، ەكان):

یەكەمیان (=كە–كان)ە، كە بێ یاریدە، دەكرێتە پاشكۆی ئەو وشانەی، بە تیپە بزوێنی( ا، ۆ، ە، ێ ) كۆتاییان هاتووە، وەك:

| وشە | ناوگر | پاشگر | وشەو ناوگرو پاشگر |
|---|---|---|---|
| كەوا | .... | كە- كان | كەواكە – كەواكان |
| | | | كەوایەكە- كەوایەكان * |
| چەقۆ | ..... | كە- كان | چەقۆكە- چەقۆكان |
| | | | چەقۆیەكە - چەقۆیەكان * |
| پە نجەرە | ...... | كە- كان | پە نجەرەكە- پە نجەرەكان |
| تەشوێ | ...... | كە- كان | تەشوێكە – تەشوێكەكان |

دووەمیان(ەكە – ەكان)بەبێ یاریدە، دەكرێنە پاشكۆی ئەو وشانەی كە بە تیپە بزوێنی(وو)كۆتاییان هاتووە و بە یاریدەی ناوگری(یـ)دەكرێنە پاشكۆی ئەو وشانەی بە تیپە بزوێنی(ی)كۆتاییان هاتووە، وەك:

| وشە | ناوگر | پاشكر | وشەو ناوگرو پاشگر |
|---|---|---|---|
| خانوو | و | ەكە- ەكان | خانوووەكە – خانوووەكان * |
| شووتی | یـ | ەكە – ەكان | شوتییەكە – شوتییەكان |

* لەمانەدا، مۆرفیمی ناسراوییەكە، بەهۆی هاتنی بزوێن لە پێش بزوێنی مۆرفیمەكەوە، وادەكات كە بزوێنی (ە – e) لەناو بچێت، بەڵام شێوەیەكی تریش هەیە بۆ خۆ لادان لەو تێچوونەو، ناوگر دێتە ئاراوە، وەك:

– كەوایەكە، چەقۆیەكە...تاد.

جا ئەگەر لە کۆتایی هاتوو بە( ی– î) ناوگری فۆنەتیکیی بوێت، ئەوا لە کۆتایی هاتوو بە ( وو– û) یش هەروایە و دەبێت بە:

**خانووەکە** xanûweke ، **خانووەکان** xanûwekan

چوارەم: پاشگری(ان)، بەهۆی ناوگری(یـ)ەوە، دەکرێت بە پاشکۆی ئەو وشانەی بە تیپە بزوێنی(ا، ۆ، ێ، ی) کۆتاییان هاتووە و بێ یاریدە دەکرێن بە پاشکۆی ئەو وشانەی بە تیپە بزوێنی(ە)کۆتاییان هاتووە، وەك:

| وشە | ناوگر | پاشگر | وشەو ناوگرو پاشگر |
|---|---|---|---|
| **چرا** | **یـ** | **ان** | **چرایان،( ئەم چرایانە )** |
| **چەقۆ** | **یـ** | **ان** | **چەقۆیان، ( ئەم چەقۆیانە )** |
| **جێ** | **یـ** | **ان** | **جێیان، ( ئەم جێیانە )** |
| **تانجی** | **یـ** | **ان** | **تانجێیان، ( ئەم تانجییانە )** |
| **کۆتەرە** | ..... | **ان** | **کۆتەران، ( ئەم کۆتەرانە )** |
| **مووروو** | **و** | **ان** | **مووروان ، موورووان ( ئەم موورووانە )** |

تێبینی: کاتێ نیشانەی کۆ(ان)دەخرێتە سەر ئەو وشانەی کە بەتیپە بزوێنی(ە) کۆتاییان هاتووە، وەك:(کۆتەرە، چۆلەکە)،دەبێت تیپە بزوێنی(ە)فڕێ بدرێت، ئینجا کۆبکرێتەوە، دیارە ئەمەش بەهۆی هاتنی دوو بزوێنەوە بە دوای یەکدا، کە بەهێزەکە، بێهێزەکە لەناو دەبات.

پێنجەم: پاشگری (ە)، بەهۆی ناوگری(یـ ، و)، دەکرێن بە پاشکۆی ئەو وشانەی، بە تیپە بزوێنەکان کۆتاییان دێت، وەك:

| وشە | ناوگر | پاشگر | وشەو ناوگرو پاشگرو نموونە |
|---|---|---|---|
| **دەرگا** | **یـ** | **ە** | **ئەو دەرگایە** |
| **دۆ** | **یـ** | **ە** | **ئەو دۆیە** |
| **تەماتە** | **یـ** | **ە** | **ئەم تەماتەیە** |
| **ڕێوی** | **یـ** | **ە** | **بەو ڕێوییە** |

| | | | |
|---|---|---|---|
| تەشوێ | یـ | ە | بەم تەشوێیە |
| تەرازوو | و | ە | بەو تەرازووە ( تەرازوووە ، Terazûwe ) |
| مازوو | و | ە | بەو مازوو ( مازوووە Mazûwe ) |

**شەشەم:**

**پاشگری ( ەم – ە مین ):**

ئەم پاشگرە بە یاریدەی ناوگری(یـ)، دەكرێت بە پاشكۆی ئەو وشانەی بە تیپە بزوێنەكان، جگە لە بزوێنی(وو)كۆتاییان هاتووە، وەك:

| وشە | ناوگر | پاشگر | وشەو ناوگرو پاشگر |
|---|---|---|---|
| پە نجا | یـ | ەم- ەمین | پە نجایەم- پە نجایەمین |
| نۆ | یـ | ەم- ەمین | نۆیەم – نۆیەمین |
| دە | یـ | ەم- ەمین | دەیەم – دەیەمین |
| سێ | یـ | ەم- ەمین | سێیەم – سێیەمین |
| سی | یـ | ەم- ەمین | سییەم – سییەمین |

**حەوتەم :**

**نیشانەی ( ێ – ێك – ەك ):**

ئەم پاشگرە، بە یاریدەی ناوگری(ی)، دەكرێت بە پاشكۆی ئەو شانەی بە تیپە بزوێنەكان كۆتاییان هاتووە، وەك:

| وشە | ناوگر | پاشگر | وشەو ناوگرو پاشگر |
|---|---|---|---|
| برا | یـ | یـ- ێك | برایێ – برایێك ( برایەك ) |
| سەكۆ | یـ | یـ- ێك | سەكۆیێ- سەكۆیێك ( سەكۆیەك ) |
| پە نجەرە | یـ | یـ- ێك | پە نجەرەیێ – پە نجەرەیێك ( پە نجەرەیەك ) |
| هەرمێ | یـ | یـ- ێك | هەرمێ یێ – هەرمێ یێك ( هەرمێیەك ) |
| تا نجی | یـ | یـ- ێك | تا نجی یێ – تا نجی یێك ( تا نجییەك ) |
| تەرازوو | یـ | یـ- ێك | تەرازوویێ – تەرازوویێك ( تەرازوویەك ) |

**(١) (دا)ی پێشگر و(دا)ی پاشگرو(دا)ی کار، لە ئاستی وشەسازی زۆر بەکاردێن، بەڵام دەبینین لە نووسینیاندا، هەرکەسە بە ئارەزووی خۆی بە وشەکەی پێش خۆیەوە دەلکێنێت و گەلێك جاریش لێی جیادەکاتەوە، بۆیە لێرەدا نووسینی(دا)ی، پێشگرو پاشگر لەگەڵ کاری(دا)کە لە چاوگی(دان)ەوە وەرگیراوە ڕوون دەکەینەوە:**

**١- ئەگەر مەبەستی ڕەستەکە ( لە ..دا)، (بە ....دا) وەك ئامرازی پەیوەندی بەکارهاتبوو، وەك:**

**- لەگەڵ مندا وەرە بچین بۆ شار.**

**- بەڕێی چەوتدا مەڕۆ.**

ئەوە(دا) بە وشەکەی پێش خۆیەوە دەلکێنرێت، دەبینین،(لە...دا)، ( بە...دا) وەك ئامرازی پێوەندی بەکارهاتوون.

**٢- ئەگەر(لە..دا) (بە ...دا)، ئەو( دا) یە، هەست کرا لە جێی( ڕا) بەکارهاتووە، بۆ نموونە:**

لەماڵی ئەوانڕا تا ئێرە بەپێ هاتین.

بەچاوانیڕا دیارە کە غەمگینە.

لەتاریکییدا هیچ دیارنەبوو. یا لەتاریکیڕا هیچ دیار نەبوو.

ئەوا دەتوانین(دا)لە شوێنی(ڕا) و بە پێچەوانەیشەوە بەکاربهێنین، کەواتە، لەو بارەیشدا دەلکێنرێت بە وشەکەی پێش خۆیەوە.

کاتێ ( لە....دا/ بە ...دا) وەك پێشگرو پاشگر یان ئامرازی پێوەندی بەکارهات، ئەوا لە ڕستەکەدا (دا)بە وشەکەی پێشیەوە دەلکێت، وەك:

**- پێت خۆشە کە لە بواری ڕاگەیاندندا کاردەکەیت؟**

* سەبارەت بە کاری(دا) کە کارێکی سادەی نزیکی ڕاگەیاندنە و لە چاوگی(دان) وەرگیراوە، لە ڕستەدا وەك (کاری) ڕستەکە ڕەفتار دەکات و بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەنووسرێت، پێویستیی بە(لە/ بە) نییە، وەك:

- باخەوانەکە، درەختەکانی ئاودا.

- سەرێکی ماڵەوەم دا.

- دیارییەکەم دا بە نەخۆشەکە.
- دیاریەکەم بە نەخۆشەکە دا.

**٢- لەو ڕستانەی سەرەوەدا، چونکە (دا) وەك کار بەکارهاتووە، بۆیە دەتوانین کاتەکانیان بگۆڕین، دەمی کارەکە کە ڕابوردووی سادەی ڕاگەیاندنە، بیکەینە ڕابوردووی تەواوی ڕاگەیاندن، وەك:**

- سەرێکیماڵەوەم داوە / دایە.

یا ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن، وەك:

- کە ئەو هات، من سەرێکی ماڵەوەم دابوو.

یا ڕابردووی بەردەوام، وەك:

- سەرێکی ماڵەوەی دەدا.

یا ڕانەبردوو، وەك:

- سەرێکی ماڵەوە دەدەم.

کەواتە: هەر کاتێك(دا) لە ڕستەدا ڕۆڵی کار(فرمان)ببینێت، ئەوا سەربەخۆ دەنووسرێت و نابێت بلکێنرێت بە وشەکەی پێش خۆیەوە، بەپێچەوانەوە بە وشەوە دەلکێت.

**٣- لەبەرئەوەی کاری(دا)کارێکی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە و لەچاوگی دان وەرگیراوە و بەهۆی ئەوەی کە چاوگ سەرچاوەی داڕشتنی هەموو کارێکە بۆیە دەتوانین، هەر ئەم کاری(دا) یە، بە شێوازی ئەرێ و نەرێ بۆ کەسی دووەمی تاك و کۆ، بکەین بە ڕستەیەکی داخوازی(فەرمان)، وەك:**

- سەرێکی ماڵەوە بدە/ مەدە.
- سەرێکی بازاڕ بدەن/ مەدەن.

هەروەها کاری( ڕانەبوردووی دانانی - "ئینشائی")، وەك:

- دەبێت سەرێکی بازاڕ بدەم.
- پێویستە سەرێکی نەخۆشخانە بدەین.
- خۆزگە سەرێکی نەخۆشخانەمان بدایە(بدابایە).
- لەوانەیە سەرێکی شار بدەم .

- پێویستە سەرێکی شار بدەیت.

**٤- ئەم کاری(دا)یە، دەتوانین چاوگەکە خۆیشی کە(دان)ە، وەك ناو بەکاری بهێنین، وەك:**

- دانی دەرمان بە نەخۆش پێویستە.
- دانی گوڵ نیشانەی خۆشەویستییە.

**ئامرازی (تر- ترین)، لەگەڵ وشەی (تر):**

١- ئامرازەکانی(تر- ترین)، لە زمانی کوردیدا زۆر گرنگن و لەگەڵ ئاوەڵناوی چۆنیەتی، بۆ پلەی(بەراورد و باڵا) زۆر بەکاردێن. بۆ پلەی بەراورد، (تر) هەمیشە بەراوردی نێوان دوو شت دەکات، دەلکێنرێت بە وشەکەی پێش خۆیەوە و کارێکیشی دەچێتە سەر، کە کاری ناتەواوە، و وشەکە دەبێتە تەواوکەری کارە ناتەواوەکە، کە:(بوو،ە ، دەبێت )ە، وەك:

- باخەکەی من لە هی تۆ جوانترە.. ( کاتی ئێستا).
- باخەکەی من لە باخەکەی تۆ جوانتربوو... ( کاتی ڕابوردوو).
- باخەکەی من لە باخەکەی تۆ جوانتر دەبێت.( کاتی ڕانەبردوو یان داهاتوو).

دەبینین(تر)، لەهەرسێ ڕستەکەدا، دوو شتی بەراورد کردووە و لکاویشە بە وشەکەوە، کە باخی(من) لەگەڵ هی( تۆ) یەو، کاری ناتەواویشیان بۆ هەرسێ دەمەکە وەرگرتووەو، لەبەرئەوەی کاری ناتەواو پێویستی بە تەواوکەر هەیە، بۆیە(جوانتر) وەك ئاوەڵناوی پلەی بەراورد لە هەرسێ ڕستەکەدا، بۆتە تەواوکەری کارە ناتەواوەکان، بەڵام کاتێك دەچینە پلەی(باڵا)، کە بەهۆی (ترین)ەوە، پەیدا دەبێت و شتێك، پلەی باڵا لەناو شت و کەلوپەلەکانی تردا بەدەست دێنێت، واتە، لەگەڵ هەموویان بەراورد دەکرێت، نەك دوو شت، وەك:

- شەوبۆ زیرەکترین قوتابیی پۆلەکەیەتی.

**واتە(قوتابییەك و کۆمەڵێك قوتابی)هەیە، کە یەکێکیان پلەی باڵا وەردەگرێت لە هەموویان زیرەکتر، ژیرتر، باشتر....دەبێت. لەم بارەشدا(ترین) بە خودی وشەکەوە دەلکێت، وەك:**

- زیرەكترین.
- ژیرترین.
- باشـترین..، نابێـت لێـك جیابكرێتــەوە و لــە لاتینیــشدا هــەروا دەنووســرێت و جیاناكرێتەوە، وەك: Qelemekey min lewey to ciwantire

٢-وشەی( تر) مان هەیە، كە لە ئامرازی(تر)جیاوازە، بە واتای:(دی، دیكە، ئیدی، ئیدیكە، هیدیكە، ئیتر، هیتر، ئیتریش، هیتریش، ئیدیكەش، یـەكێكی تـر، یـەكێكی دی ...تاد)دێت، ئەمەیان پێویستە سەربەخۆ(واتە بە جیا) لەوشەكەی پێش خـۆی بنووســرێت، چــونكە لێــرەدا بەمەبەســتی بــەراورد بــەكار نــەهاتووە، بــەڵكو داواكارییەكی نوێیە، بۆ نموونە:

- جگە لەم ئۆتۆمۆبیلەی ئێستام، نیازم وایە ئۆتۆمبێلێكی تر(دی، دیكـە، ئیـدی، ئیدیكە، هیدیكە، ئیتر، هیتر، ئیتریش، هیتریش، ئیدیكەش، یـەكێكی تـر، یـەكێكی تریش..) بكرم.
- جگە لەم بڕوانامەیە، نیازم وایە بڕوانامەیـەكی تـر (دی، دیكـە، ئیـدی، ئیدیكـە، هیدیكە، ئیتر، هیتر، ئیتریش، هیتریش، ئیدیكەش، یەكێكی تر، یەكێكی تـریش..) بە دەست بهێنم.

**كەواتە دەتوانین بڵێین: ئەگەر( تر- ترین) بەمەبەستی پلـەی بـەراورد و باڵا، لـە نێـوان دوو كـەس، نـاو، شـت، ..تـاد، یـان ناوێـك و چـەند ناوێك و چەند شتێك بەكارهات، ئەوا( تـر- تـرین) ەكـە بـە وشـەكەی پـێش خۆیـەوە دەلكێنرێـت. بــەڵام، ئەگــەر(تــر) بــەواتای (دی، دیكــە، ئیــدی، ئیدیكــە، هیدیكە، ئیتر، هیتر، ئیتریش، هیتریش، ئیدیكەش...تاد) بەكار هات، ئـەوا بە جیا دەنووسرێت و بە وشەكەی پێش خۆیەوە نالكێنرێت.**

**خاڵبەندی** ( **التنقيط** punctuation )

نووسین، گوتەیەکە، لە جیاتیی ئەوەی بە دەنگ بوترێت، بە نووسین دردەخرێت. واتە، نووسین قسەی نووسراوە. ئێمە، کاتێک دەمانەوێت لە قسەکرندا بیرو هەستی خۆمان بە ڕوونی و بە وردی دەبڕین، شان و دەست و پەنجەو چاوو بڕۆو هەندێك لە ماسولکەکانی دەمووچاوویشمان دەبزوێنین، هەروەك ئاوازو دەنگی هەندێك لە وشەکانمان کورت ودرێژ، بەرز و نزم دەکەینەوە، ساتیك بمانەوێت ئەو بیروباوەڕو هەست و نەستانەمان بە نووسین ڕابگەیێنین، بۆ ئەوەی واتاکانمان بە هەموو سۆزو ڕازو قۆڵپ و هەنسك و هەناسەیەکەوە دەربخەین، پێویستمان بەوە دەبێت، هەندێك نیشانەو هێما دابنێین، بەدانانی ئەو هێمایانە دەوترێت((خاڵبەندی)).

بێگومان چەوت دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی، گەلێك لە نەبوونی خراپترە، زانایانی زمان(زمانزانان) نیشانەکانی خاڵبەندییان کردووە بەسێ جۆر:

بۆ (پێکبەستن)پێکەوە بەستن:

کۆمای خاڵدار (**الفاصلة المنقوطة**)، semicolon ;)

جووتە خاڵ ( **النقطتان الشارحة** colon: )

تاکە تەقەڵ ( **الشرطة** single Dash)

بۆ لێك جیاکردنەوە:

خاڵی ڕاوەستان ( **النقطة** full- stop.)

نیشانەی پرس ( **علامة الاستفهام** Question Mark؟ )

نیشانەی سەرسووڕمان ( **علامة التعجب** Exclamation Mark!)

کۆمای جیاکردنەوە ( **الفاصلة– الفارزة** single Comma،)

بۆ خستنە نێوان:

جووتە کۆما( **الفارزة المزدوجة** Pair of Commas ،.....، )

جووتە تەقەڵ ( **الشرطتان** Pair of Dashes –.....– )

**جووتە کەوان** ( **القوسان** Pair of Parentheses (...) )

جووتـە كـەوانی سـەركووڕ ( **العضادتان القوسان المعقوفان** Pair of Brackets [.....] كۆمـای ئـاوەژوو ( **المربعة**، التنـصیص Inverted Commas "......" ) یان ( Quotation Mark )

بەپێی بایەخ و زۆر بەكارهێنان، هێما و نیشانەكانی خاڵبەندی، ئەمانەن:

**١- تاكـە كۆمـا(بـۆر)- نیـشانەیەكە بـۆ جیاكردنـەوە، جیاكردنـەوەی وشـەیەك، یـان بەشـی ڕستـەیەك لـەوانی تـر، جیاكـاریی كۆمـا(بـۆر)، لـەهی نیـشانە جیاكارەكـانی تـری هاوچەشـنی، سـووكترە و بـە زۆری لـەم شوێنانەدا، بەكاردەهێنرێت:**

**١- بۆ جیاكرنەوەی مانگ و ڕۆژ لە ساڵ، وەك:**

**٩ی حوزەیران، ١٩٤٧.**

**٢- بۆ جیاكردنەوەی بەشەكانی ناونیشانی شوێنێك: خانووی ژمارە ١٠، كۆڵانی ٢٥، گەڕەكی سەرشەقام، سلێمانی، كوردستان.**

٣- لە دوای سەرەتای پیشەكیی نامەیەكدا:

**خۆشەویستم ئازاد،...**

بەدوای كۆتایی پێهێنانی نامەیەكدا:

**دڵسۆزت، كامەران.**

لە نێوان وشە پێوەندیدارەكاندا:

**چالاكییە سەرەكییەكانی زمان چوارن:**

**گوێگرتن، ئاخاوتن، خوێندنەوەو، نووسین.**

٦- بەدوای تكاكارییەكدا:

توخوا، وامەكە.

تكات لێ دەكەم، وازی لێ بێنە.

٧- بـەدوای نـاوی كەسـێكدا، كـە ڕووی قـسەی تـێ بكرێـت، بـۆ ئـەوەی زۆرتـر دەربكەوێت:

**- منداڵینە، دوام كەون .**

**- ئاری، لەگەڵ تۆمە.**

**- كاكە، واخێرا لێ مەخوڕە.**

- **دایە لێم ببورە.**

٨- بە دوای سووکە داخوازییەکدا، کە داخوازییەکە توندوتیژ نەبێت.

- **خێراکە، وەرە ژووریٚ.**
- **دانیشە، بیٚ دەنگ بە.**

٩- بەدوای ئەو جۆرە وشانەدا، کە گوتە، یان ڕستە دەست پیٚ دەکرێت، بۆ ئەوەی زۆرتر دەربکەون، وەك: بەڵیٚ، نەخێر، باشە، وایە، وانییە، ئۆی، گوایا، ئاخ، ئۆف، بۆچی، کەی، یەکەم، دووەم..هی تریش:

- **بەڵیٚ، وابوو.**
- **نەخێر، وانەبوو.**
- **باشە، با وابێت.**
- **وایە، تۆ ڕاست دەکەیت.**
- **ئۆی، ئەوە بۆ ڕۆیشت؟!**
- **ئۆخەی، ڕزگارمان بوو.**
- **وەی، لەم گەرمایە!**
- **یەکەم، کیٚ دەیەوێت بچێت بۆ سەیران؟**
- **دووەم، کیٚ حەزدەکات بچین بۆ سەرچنار؟**

١٠- بۆ جیاکردنەوەی ئەو ژمارانەی دەکەونە ناو ڕستەیەکەوەو پێوەندییان پێکەوە نییە:

- **ئێستا تریٚ لەبازاڕدا، بەپێی چەشنەکانی، کیلۆی بە:٢٠٠٠،٣٠٠٠،٤٠٠٠، دینار دەفرۆشرێت.**

١١-بەدوای ڕستۆکە(clause) یەکی ناسەرەکی، کە ڕستەیەکی پیٚ دەست پیٚ بکرێت:

- **هەرکە فیکە لیٚ درا، یارییەکە دەستی پیٚ کرد.**
- **دوای زەنگ لێدان، پۆلەکە ئارام بوو.**
- **هێشتا نانیان دەخوارد، کارەبا کوژایەوە.**

١٢-بۆجیاکردنەوەی گوتەی قسەکەرێك لەوانەی تری ڕستەکە:

- **مامۆستا وتی:((ئیشی ئەمڕۆ، مەخەنە سبەینیٚ)).**

**- سمكۆ هاواری كرد، ((خەڵكینە خێراكەن)).**

١٣-كە لە ڕووی ڕێزمانەوە، وەك یەك بن و بەڕیزیش بەدوای یەكتر هاتبن:

**- قسەكەر، بیستۆكەكە هەڵدەگرێت، پارە دەخاتە پارەدانەكەوە، ئەوسا دەست دەكات بەقسەكردن.**

*** ئەو كارانەی ناو ڕستەكە:(هەڵدەگرێت، دەخاتە، دەست دەكات) ،یەك بكەریان هەیە، كە ئەویش قسەكەرەكەیە.**

***هەریەكێك لەبەشەكانی ڕستەكە، بەبكەروكارو بەركارەوە، واتای تەواوی خۆی دەبەخشێت.**

***ئەوبەشانە، بەڕیز بەدوای یەكتردا هاتوون.**

***بۆیە دەوترێت، ئەوبەشانە لەڕووی ڕێزمانەوە وەك یەك وان.**

١٤- لەنێوان مەرج و وەڵامەكەیدا، بەتایبەتیی ئەگەر ڕستەی مەرج درێژ بێت،

**- ئەگەر هەوڵ بدەیت و تێ بكۆشیت، بەهەموو ئاواتەكانت دەگەیت.**

١٥- لەنێوان سوێندو وەڵامەكەیدا:

**- بەخوا، وازناهێنم.**

**- بەسەری باوكم، گاڵتەت لەگەڵدا ناكەم.**

١٦- لە نێوان بەشەكانی ڕستەیەكدا، كە بەراوردو پێچەوانەییەك پیشان بدات:

**- تۆ چەند باش بیت ئەو ئەوەندە خراپ دەبێت.**

**- تا زۆرتر چاوت پێی بكەوێت، زیاتر خۆشت دەوێت.**

١٧- لە پێش ڕستەیەكەوە(حاڵ) یان(وەسفی)تێدابێت:

**- دوێنی بەشەكەتی، گەڕانەوە ماڵەوە.**

**- شێرزاد، پیاوانە هاتە پێشەوە.**

**- باران، نم نم دەبارێت.**

**- ئاسۆ، بەسواری هات.**

**- لەو دێیە كچێكم دی، قژكاڵ و لێو ئاڵ.**

١٨- بۆ جیاكردنەوەی وشەی لێكچو و هاوتا، بۆ ئەوەی خوێنەر، لە خوێندنەوەیاندا سەری لێ تێك نەچێت:

- ئێوارە درەنگ گەیشتینە ناوشار، شار چۆن شارێك، یەك پارچە چراخان بوو.

**سەرنج:**

بۆ پێکبەستنی دوو ڕستۆکەی واتا ناتەواو Independent Clause، کۆمای خاڵدار( ; ) لە جیاتی کۆما( ، ) دادەنرێت:

**– ئێستا نزیکەی هەشت و نیوە; پێش تاریکی داهاتن ناگەینە ناوشار.**

بەڵام، ئەگەر ڕستۆکەکان زۆر کورت بوون، ئەوا کۆمایان لە نێواندا دابنرێت باشترە. ڕەشەبایەك هەڵی کرد، چەپەرەکانی هەڵکەندو، پردەکەی ڕووخاند.

١٩ – بۆ لێك جیاکردنەوەی هەر یەکێك لەو وشەو فرێزانەی، کە دوا بە دوای یەك دێن:

**– ئەمانە، ناوی کچن: شارا، تارا، شنە، سەرگوڵ، سازگار، شەوبۆ.**

**– بەڕۆژ، قوتابی لە قوتابخانەدا، کاسب لە بازاڕدا، جووتیار لە کێڵگەدا، خەریکی کارن.**

**– کۆڵان بە کۆڵان، ماڵ بە ماڵ، دوکان بە دوکان، هەموو شارت بەدوادا گەڕاین.**

٢٠– بۆ دەرخستنی هەندێك قسە، کەلە پێشەوەی ڕستە دەردەبڕێت:

**– بەگشتی، ئەم کارە ئاسان نییە.**

**– لە کۆتاییدا، زۆر سوپاستان دەکەم.**

**– بۆ نموونە، بڕوانە ئەم نووسینە.**

**– یەکەم، ئێمە هەموو براین. دووەم، هەمووومان هاوولاتین.**

**– بەڵام، نابێت تۆ ئەوەندە لە خۆت بایی بیت.**

٢١– دوای ئەو وشانەی کە بە جەختاندنەوە( جەخت لەسەرکردنەوە) دەگوترێن، بۆ زۆرتر دەرخستنیان:

**– ئێمەی کورد، مێژوومان زۆر کۆنە.**

**– من، وەك دەزانیت، یەك قسەم.**

**– هەرچۆنێك بێت، ئەو کوڕە براتە.**

**– دڵنیابە، ئەوەی دەی چێژین، ژانی لە دایکبوونێکی نوێیە.**

**- ئـــەوەی ڕاســتی بێــت، لەناخـــەوە حـــەزم نـــەدەكرد لـــەو ئیـــشەدا بەشداربم.**

٢٢- پــــێش ئــــەو ئامرازانــــەی، كــــە دوو بەشــــی ڕســــتەیەكی لێكدراوCompound Sentenceپێكەوە دەبەستن، وەك:(كە، بەڵام، چـونكە، تاكو، بەڵكو، ئینجا، ئەگینا، پاشان،....).

**- سمكـۆ یەكێكـە لـەو ڕۆڵـە مەزنانـەی، كـە لەسـەر داوا ڕەواكـەی نەتەوەكەی، شەهید كرا .**

**- باوكم چووە بۆ بازاڕ، بەڵام دایكم لەماڵەوەیە.**

**- خۆشم دەوێیت، چونكە مرۆڤێكی ڕاستگۆیت.**

**- تۆ لێرە ڕاوەستە، تاكو دەچم كتێبەكەت بۆ دێنم.**

**- شیعرەكە تێ بگە، ئینجا لەبەری بكە.**

**- كتێبەكەم بۆ بهێنەوە، ئەگینا هی ترت نادەمێ.**

**- بەیانی دەچم بۆ كۆیە، پاشان لەوێوە دەچم بۆ هەولێر.**

**- كە چوویت بۆ سلێمانی، منیش دێم لەگەڵتا.**

٢٣- لـــە نێـــوان بەشـــەكانی ڕســـتەیەكدا، كەلەیـــەك بـــچن و ئـــامرازی پێكەوەبەستنیان لە نێواندا نەبێت:

- مامۆسـتا لـە پۆلەكـەدا، بـەبێ وەسـتان، وانەكـەی خوێنـدەوە، بـەراوردی دەركرد، ئەوجا(ئەوسا) وەڵامی پرسیاری قوتابییەكانی دەدایەوە.

٢٤- دوای ئەو زنجیرە ئاوەڵناوانـەی، كەهەریەكـەیان بـەجیا، یـان بـەدوان وسیانیان پێكەوە، وەسفی ناوێك دەكەن:

**- كـچێكی جـوان و، هـێمن و، بێـدەنگ( واتـە: كـچەكە سـێ سـیفەتی هەیە).**

**- كـچێكی جوانی هێمنـی بێدەنگ( نێوانـەكانیان پێویـست بـە كۆمـا ناكات، چونكە هەرسێ ئاوڵناوەكە یەك( سیفەت) پیشان دەدەن.**

(٢) جووتە كۆما(بۆر)( ،....،) **الفارزة المزدوجة** Pair of Commas:

جووتــە كۆمــا(بــۆر)، كەلــە دوو كۆمــا(بــۆر) پێكهــاتووە، وەك یــەك نیــشانەی خاڵبەندی بەكار دەهێنرێت. ئـەم جووتـە كۆمایـە، هەمیـشە وشـەیەك، یـان چـەند

وشەیەکی گوتەبڕ دەگرێتە خۆی. ئەو وشانەی بەم جووتە کۆمایە دەورە دەدرێن، بەشێکن لەڕستە، بەڵام بەشێکی سەرەکی نین، ئەگەر لاش ببرێن، ڕستەکە واتای تەواوی خۆی هەر دەبەخشێت. ئەمەیش ئەوە دەگەیێنێت، کە گوتەی نێوان جووتە کۆماکە، لە ڕووی ڕێزمانەوە بۆ پێکهاتنی ڕستەیەکی واتاداری سەرەکی(سەربەخۆ) هیچ شتێکی پێویست نییەو، تەنانەت ئەگەر لاش ببرێت هێشتا لە ڕستەکەدا ( کاراو کارو بەرکار، یان تەواوکەرێکی تری کار هێشتا هەر دەمێنێت)، بڕوانە ئەم نموونەیە:

تۆ، وەك بزانم، بەڵێنەکەت بیرچۆتەوە.

**جووتە کۆما، لە زمانی کوریدا، بە زۆری لەم شوێنانەدا بەکاردەهێنرێت:**

لەسەرەتاو کۆتایی ئەو جۆرە وشەو دەستەواژانەی کە وەك تێ هەڵکێشێکی گوتە بڕین( parenthetical بەکار دەهێنرێن، بەڵام لەڕاستیدا شتێکی سەرەکی نین:

تۆ، وەك بزانم، بەڵێنەکەت لە بیرچۆتەوە.

ئەم کتێبە، قسەکەشت پێ دەبڕم، زۆر کۆنە.

ئێستا، بۆ نموونە، بڕوانە ئەم ڕستەیە.

لەسەرەتا و کۆتایی ( لەجیاتی– بەدەل oppositive) دا.

( **بەدەل)، وشە یان دەربڕینێکە، کە یەکسەر بەدوای ناوێکی تردا بێت و هەمان واتای ئەو ناوە، یان ئەو شتە ببەخشێت:**

مامۆستاکەمان، دکتۆر سامان، زۆر یارمەتیی دام.

دراوسێیەکەمان، وەستا کاوە، گواستییەوە بۆ گەڕەکی سەرشەقام.

نازدار، کچە بچکۆلەکەم، دە ساڵانە.

٣– لەسەرەتاو کۆتایی ڕستۆکەیەکی دیاری نەکراو(جملە غیر محددە non-restrictive clause) ڕستۆکەی دیاری نەکراویش، بەو ڕستۆکە ناسەرەکییە دەوترێت، کە بەشێوەیەکی گشتی ناوێکی پێ وەسف دەکات، کە لە ڕستۆکەیەکی سەرەکییدا باس کرابێت، وەك:

ئەو پیاوە، پۆشتەو پەرداخە، بازرگانێكی ناسراوە.

باوكی ئازاد، كە خانەنشینە، لە هەولێر دادەنیشێت.

ئەو ژنە، كە لەبەرخۆیەوە قسە دەكات، درواسێمانە.

**٤- تەنیا یەك وشەی دەروگیراو، قسەكە ببڕێت و واتای ڕستەكە بپچڕێنێت:**

**- كچەكەت، نازیٚ، شێتی كردووم.**

**لێرەدا، وشەی(نازیٚ) قسەكە دەبڕێت. تۆ لە گوتنی وشەی( نازیٚ) دا، بۆ ئەوەی وشەكە دەربكەوێت و سەرنجی گوێگر ڕابكێشێت، دەنگتی بۆ دادەگریت، لە نووسینیشدا، بۆ ئەوەی ئەو دەنگ داگرتنە دەربخەیت، وشەی نازیٚ، دەخەیتە ناو دوو كەوانەوە(نازیٚ).**

ئەگەر وشە قسە بڕەكە، بكەوێتە پێشەوەی ڕستەكە، یان دواوەی، تەنیا یەك كۆما دادەنێیت. ئەو خاڵەی دەكەوێتە پێشەوەی ڕستەكە، یان دواوەی، شوێنی كۆماكەی تر دەگرێتەوە، وەك بڵێیت:

نازیٚ، كچەكەت شێتی كردووم.

كچەكەت شێتی كردووم، نازیٚ.

٧-بەڵام، ئەگەر گوتە لێك هەڵكێشراوەكە، ڕستۆكەیەك، یان ڕستەیەكی سەربەخۆ (independent)، واتە، (كاراو كارو بەركارو تەواوكەری كارو واتایەكی تەواو هەبوو)، ئەوكاتە، ناتوانریٚ بە دوو كۆما باش سەرنجی خوێنەری بۆ ڕابكێشرێت، بۆیە لەو بارەدا، لە جیاتیی جووتە كۆما، جووتە تەقەڵ ( -........-) ، یان جووتە كەوانێك (...) دادەنرێت، بۆ نموونە:

- ..... چونكە هەوا زۆر ساردبوو....

- ..... هەوا زۆر ساردبوو.....

ڕستۆكەی یەكەم، بە تەنیا، واتایەكی تەواو نابەخشێت، شتێكی ئاساییە، كە چاوەڕێی گوتەیەكی تر بكەین واتاكەی تەواو بكات، ئەم ڕستۆكەیە، سەرەكی نییەو ناسەرەكییە و، كە ڕستۆكەیەكی ناسەرەكی، دەبێتە هۆی گوتە بڕینی ڕستەیەك، دەخرێتە نێوان جووتە كۆمایەكەوە، وەك ئەوەی بڵێین:

– باوکم بڕیاری دا، چونکە هەوا زۆر ساردبوو، هەموو جلی زستانە لەبەر بکەین.

ڕستۆکەی دووەم، واتاکەی تەواوە و دەتوانێت بە تەنیا خۆی واتایەکی ڕوونی ڕەوانی تەواو ببەخشێت. کە گوێمان لێی دەبێت، یان کە دەیخوێنیتەوە، چاوەڕێی گوتەیەکی تر ناکەین واتاکەی تەواو بکات. بەم چەشنە ڕستۆکەیە دەوترێت، ڕستۆکەی سەرەکی، یان(سەربەخۆ) Independent Clause کە ڕستۆکەیەکی سەرەکی دەبێتە هۆی لێك پچڕانی ڕستەیەك، ناتوانرێت بە جووتە کۆما، لە ڕستەکەدا دابمەزرێت و، مەبەستەکەی پێ بهێنرێتەدی، بۆیە لەو بارەدا، یان جووتە تەقەڵێك–.....–، یان جووتە کەوانەیەك (......) لە شوێنی جووتە کۆماکە بەکاردەهێنرێت، بۆ نموونە:

باوکم بڕیاری دا – هەوا زۆر ساردبوو– هەموومان جلی زستانە لەبەربکەین.

یان: باوکم بڕیاری دا ( هەوا زۆر ساردبوو) ، هەموومان جلی زستانە لەبەربکەین.

کۆمای خاڵدار ( ; ) (**الفاصلة المنقوطة** semicolon) :

ئیستێکە( ڕاوەستانێکە)، بۆ جیاکردنەوە، لە کۆما(بۆر) بە هێزترە. لە بنەڕەتدا، خاڵبەندی لەسەر زنجیرە تاکە ئێستێك(ڕاوەستانێك)دامەزراوە و بەکارهێنراوە، کە ئەمەیە:

کۆما (،) بۆ یەك ڕاوەستان بەکاردێت.

کۆمای خاڵدار( ; ) بۆ دوو ڕاوەستان بەکاردێت.

دوو خاڵی لەسەریەکتر( : ) بۆ سێ ئەوەندەی یەك ڕاوەستان.

خاڵی وەستان (.) بۆ چوارئەوەندەی یەك ڕاوەستان بەکاردێت.

**بەم پێیە، کۆمای خاڵدار، بۆ ڕاوەستانێکە، کە لەهی کۆما درێژترە و لە هی خاڵی وەستان کورتتربێت و بە زۆری کۆمای خاڵدار، لەم شوێنانەدا بەکاردێت:**

لە جیاتیی(کۆما و ئامرازی لێك بەستن)، کە پێکەوە لە نێوان دوو ڕستۆکەی سەربەخۆدا، دادەنرێن، کە پێوەندییان پێکەوە هەبێت و واتای ڕستەکەش ناگۆڕدرێت، وەك:

ئازاد دڵشادبوو، بەڵام نازدار پەست بوو.

ئازاد دڵشاد بوو، نازدار پەست بوو.

من شەممە لێرە نابم، بەڵام یەكشەممە دەتوانیت بم بینیت.

من شەممە لێرە نابم، یەكشەممە دەتوانیت بم بینیت.

سەرنج: لێرەدا، كۆما، بۆلێك جیاكردنەوەی دوو ڕستەی هاوتا(چوونیەك co-ordinate) بەكارهێنراوە، كە بەهۆی ئامرازێكی پێكبەستنەوە، پێكەوە لكێنراون، لەم بارەدا ئەگەر ئامرازی پێكبەستنەكە لابرێت، دوو ڕستەكە بەكۆمای خاڵدار لێك جیا دەكرێنەوە.

٢- لەنێوان دوو ڕستەدا، كەیەكێكیان هۆی ئەوی تریان بێت.

- **كارزان باشترین قوتابییە،خۆی زۆرماندوو دەكات.**

- **ڕێی سلێمانی گیراوە، بەفر زۆر باریوە.**

- **كاوە بەیەكەم دەرچوو، ئەمساڵ خۆی زۆر ماندوو كرد.**

٣- لەنێوان هەندێك لەو ڕستە درێژانەدا، كە پێكەوە واتایەكی ڕوون و ڕەوان دەبەخشن:

- **ئێمە لەسوورێكی چوار سەعاتی بەناوشاردا؛ زۆرشتی نایابمان دی؛ باخی گیانەوەران؛ بازاڕی ڕازاوەو فراوان؛ مۆزەخانەو گەلێك شوێنی دڵگیری جوان.**

(لێرەدا، دانانی كۆمایەكی خاڵدار، لەشوێنی (لەجیاتی ) تاكە كۆمایەك ، یارمەتی خوێنەر دەدات، لە ناوەڕاستی ئەم ڕستە درێژەدا، هەناسەیەكی ڕاوەستانی لەهی كۆما درێژتر بدات و، ڕوونتر، واتای ڕستەكە تێ بگات). بۆجیاكردنەوەی شوێنی بەكارهێنانی كۆمای خاڵدار لەهی كۆما، بڕوانە ئەم نموونەیەش:

- بۆ بەرچایی، شیر، ماست، هێلكە، چا، بۆقاوەڵتی، برنج، بامیێ، بۆ ئێوارە، گۆشتی برژاو.

٤-دوای هەر ڕستۆكەیەك لەو ڕستۆكانەی، كە ژمارەیان سیان زیاتر بێت وەك زنجیرە بەدوای یەكدا هاتبن:

– ڕۆژی نەورۆز ئاگر کرایەوە، هەموو شەقامەکان ڕازێنرانەوە، دەهۆڵ و زوڕنا لێ درا، لەهەموو لایەکەوە کرا بەسەماو هەڵپەڕکێ.

دووخاڵ (:) (**النقطتان** colon):

دووخاڵ ، ئەوەپیشان دەدات، کەئەو وشانەی یەکسەر بەدوایدا دێت، ڕوونکەرەوەیەکن بۆ گوتەکەی پێشەوە. واتە، تۆ کە نیشانەی جووتە خاڵ بەکاردێنیت، ئەوە بەخوێنەر دەڵێیت، کە وتەکانی دوای خاڵەکە، ڕوونکەرەوەیەکن بۆ ئەوانەی پێشەوەیان. گۆتەی پێش دووخاڵەکە، بەزۆری، نەك هەمیشە، ڕستۆکەیەکی سەربەخۆ دەبێت، هەندێجاریش، ڕستۆکەی شوێنکەوتوو دەبێت. ئەم نیشانەی خاڵبەندییە، بەزۆری لەم شوێنانەدا بەکاردێت:

دوای سلاَو، لەنامەیەکی بازرگانیدا:

**گەورەی بەڕێز:**

لەپێش زنجیرەیەك شتدا:

ئەم جۆرەخواردنانە،چەورییان زۆرە:

**کەباب، گیپە، قاورمە.**

لەماڵەوە، داوایان لێ کردم ئەم شتانە بکڕم:

**پیاز، تەماتە، بامێ، شووتی.**

کۆلیجی ئادابی زانکۆی دهۆك چوار بەشە:

**بەشی زمانی کوردی، بەشی مێژوو.**

**بەشی زمانی ئینگلیزی، بەشی جوگرافیا.**

٣–لەپیشاندانی نموونەدا:

لەڕستەی کوردیدا، لەپێشەوە بکەر(کارا)، ئینجا بەرکار، دوای ئەویش، کار دێت :

– کیژان شیعری خوێندەوە.

٤– لەنێوان گوتن و گوتراودا:

مامۆستا گوتی:((ئیشی ئەمڕۆ مەخەنە سبەینێ)).

پێشینان وتوویانە: ((ڕێوی لەکونی خۆی هەڵگەڕێتەوە، گەڕ ئەبێت)).

٥- پاش گوتەیەك، كە ڕستۆكەیەكی بەدوادا بێت و واتای گوتەگە ڕوون بكاتەوە، یان فراوانتری بكات:

- دادوەر، دووئەركی گەورەی هەیە: پشتی بێتاوان و زۆرلێكراو بگرێت و تاوانبار و زۆرداریش سزا بدات.

٦-پێش لێكدانەوەی واتای گوتە یان وشەیەك :

- ژێرزاری : شاردراوە، پێچراوە.
- شادی : خۆشی.

**خاڵی ڕاوەستان** ( . ) (**النقطة** full-stop ) :

ئێمە، كە لەڕستەی قسەكردنێكمان دەبینەوە، ڕادەوەستین. هەروەهایش، كە لەڕستەی نووسینێكیشمان دەبینەوە، نیشانەیەك بۆ ڕاوەستان دادەنێین، بەوپێییە، خاڵی ڕاوەستان دادەنێین، خاڵی ڕاوەستان، ئەوە دەگەیێنێت، كە گوتەیەكی واتای تەواوی نووسراو، كۆتایی هاتووەو نابێت لەگەڵ ئەوەی پاش خۆی تێكەڵ بكرێت. ئەم نیشانەیە، بەزۆری لەم شوێنانەدا، بەكاردێت:

١- بەكۆتایی ڕستەیەكی واتا تەواودا:

- **دۆزینەوەی نەوت لەكوردستاندا، زۆرشتی گۆڕی.**
- **شوانەكە، مەڕەكانی لەوەڕاند.**

٢- لەكۆتایی ڕستەیەكی داخوازی، یان تكادا، كە بەجەختكردنەوە نە وترێت:

- **ئەو كتێبەم بۆ بێنە.**
- **تكایە، پەنجەرەكە دابخە.**
- **تكایە، دوا مەكەوە.**

**نیشانەی پرس** ( ؟ ) ( **علامة الاستفهام** Question Mark):

ئەم نیشانەیە، ئەوە پیشان دەدات، كەتۆ بیرۆكەكەت بەتەواوی دەربڕیوە، بەڵام دەتەوێت وا لەخوێنەر بگەیێنێت، كەتۆ لەجیاتی ئەوەی شتێكی بۆ باس بكەیت، شتێكی لێ بپرسیت، وەك :

- **منداڵەكە نووست.**

**- منداڵەکە نووست؟**

**- دەرگاکەی داخست.**

**- دەرگاکەی داخست؟**

بێگومان خوێنەر، دەبێت دوا وشەی پرسەکە بەدرێژکردنەوەو دەنگ لێ هەڵبڕینەوە بخوێنێتەوە.

١-دوای گوتەیەك، کە بەکورتی پرسێك کۆتایی دێت:

**- ئەمڕۆ دەرەوە زۆر ساردە، وانییە؟**

٢- دوای وشەیەك کە واتای پرس ببەخشێت:

- چی؟ چۆن؟ بۆچی؟ کەی؟کێ؟ کوێ؟ کام؟ کوا؟

**نیشانەی سەرسووڕمان ( ! ) ( علامة التعجب exclamation mark ) :**

ئـەم نیـشانەیە، کەلـەدوای وشــە ،دەسـتەواژە، یـان ڕسـتەیەك دادەنرێـت، هەژانی هەسـت و سـۆز پیـشان دەدات، ئەگـەر هەژانەکـە سـووك بـوو، کۆمـای بـۆ دادەنرێت:

بڕوانە ئەو دیمەنە جوانە، بڕوانە، بـەڵام ئەگـەر هەژانەکـە توندوتیـژ بـوو، ئـەوا نیشانەی سەرسووڕمانی بۆ دادەنرێت، وەك :

هەستە درەنگە، بجووڵێ !

هەژانی توندوتیژ، هەنـدێجار، وەك داگیرسـان و هەڵچوونێك، شـێوەی قیـژەو، قیڕەو، نەڕە وەردەگرێت، هەندێجاریش، نرکەو، ناڵەو، زیڕەو، کسپە دەنوێنێـت. جاروبـاریش وەك سـۆزێکی گـەرمی سەرسـووڕمان، یـان گەشـکەبوون، خوێنـەر دەبزوێنێت و ڕای دەتەکێنێت.

**چەشنەکانی بەکارهێنانی ئەم نیشانانە، بە زۆری ئەمانەن:**

١- لە دەربڕینی هەستێکی بە هێزدا، یان لەپڕ جۆشاودا:

- خێرا، بڕۆ دەرێ!

**- خوایە، لەو جوانییە!**

٢- لە جەختاندنی فەرمانێكدا، یان باوەڕو هەستێكدا، كە سوور بێت لەسەری و توند دەری ببڕێت:

- **هەر ئێستا، دەبێت ببێت!**

- **جارێكی تر، لەم باسە نادوێینەوە!**

٣- بۆ پیشاندانی گاڵتە پێكردن، یان پێ ڕابواردندنێك:

- **تۆ گونجاوترین كەسیت، كە باسی مرۆڤی تەمەڵمان بۆ دەكەیت!**

- **هەموو كارێكی گران بۆ تۆ ئاسانە!**

٤- لە كۆتایی گوتەیەكی وشیاركەرەوەدا:

- **نەكەی بەم تاریكەشەوە بڕۆیت!**

- **خۆت نەخەیتە ئەو گێژاوەوە!**

٥- لە كۆتایی دەربڕینێكی پێ خۆشبووندا:

- **خۆشی لە خۆت!**

٦- لە كۆتایی داخ و خەم دەربڕیندا:

- **ئەی دەستی شكاوم!**

- **وەی داخی گرانم!**

٧- لە كۆتایی دەربڕینێكی خۆشەویستیی دەرخستندا:

- **بە قوربانت بم!**

- **وایش بێت، باشە!**

٩- لە كۆتایی گوتەیەكی هاندان و وروژاندندا:

- **كوڕینە، خێراكەن، فریاكەون!**

١٠- بە دوای نزاكرندا:

- **یاخوا بەخێر بێیت.**

- **خوا ئاگادارت بێت!**

١١- لە كۆتایی هاوار لێ هەڵسان و داوای فریاكەوتندا:

- **ئەی هاوار، فریام كەون!**

- **خێرتان دەگات، بمگەنێ!**

**تاکە تەقەڵ**( - ) ( **الشرطة** Single Dash ) :

**نیشانەیەکە، بەشەکانی پێشەوەی(واتە پێش تاکە تەقەڵەکە)، بە تەواوی گوتەکەی پاشەوەی(واتە پاش تاکە تەقەڵەکە)ڕوون دەکاتەوە، وەك:**

– سۆران و، هیواو، ئازاد– هەرسێکیان دانراون بۆ لیژنەی پاك و خاوێنی.

– کارتۆنێك هێلکە، دوو تەنەکە ڕۆن، سێ کیلۆ تەماتە– هەر ئەمانەت دەوێت؟

جگە لەوانەی سەرەوە، تاکە تەقەڵ بۆ ئەم مەبەستانەیش بەکاردێت:

١– لە پێشەوەی دەربڕینێك، کەبەشێك بێت لە ڕستەیەك و، بویستڕێت بە پارسەنگێکی تایبەتییەوە دەربکەوێت:

– ئەوەی دەمێك بوو ئاواتم بوو، بۆم هاتەدی– کە لەو مرۆڤە چەپەڵە ڕزگارم بوو.

– من، ئەوە بڕیارێکەو داومە– ناچم بۆ لایان.

٢– لە جیاتیی(دوو خاڵی لەسەریەکتر) بۆ نیشاندانی لیستێك شت(بەلاَم دوو خاڵی لەسەر یەك لەگەڵ تەقەڵدا پێکەوە، وەك ئەمە،......:، دامەنێ.):

– سۆران ئەم شتانەی بۆ فرۆشتن داناوە– دوو ڕادیۆ، سێ تەلەفزیۆن لەگەڵ دوو جلشۆردا.

٣– هەندێکجاریش وەك:( دوو خاڵی لەسەریەك) بۆ ڕوونترکردنەوەی گوتەیەکی پێش خۆی بەکاردێت:

– ئەم جۆرە جلشۆرە– جل دەشوات و وشکیشی دەکاتەوە.

– ئێمە هەندێکجار پێویستیمان دەبیت بەوەی، کە لەسادەیی شت بنووسین– نووسینێك، کە خوێندەواری ڕەمەکیش بتوانێت تێی بگات.

٤– جارجاریش، بۆ سەرنج ڕاکێشان، پێویست دەکات، کە بەدانانی تاکە تەقەڵ خوێنەر وا لێ بکەین، لە خوێندنەوەی وشەیەکی قەشەنگدا، یان لە دەربڕینێکی چاوەڕێ نەکراودا ئیستێك بکات، وەك: بەیانیان، کە دەمڕوانییە–چاوی کوڕەکەم، خۆم تێدا دەبینی.

٥– جاروباریش، جێی کۆمای خاڵدار– دەگرێتەوە:

– ئەو زۆر حەز لە ئۆپرا دەکات، من ڕقم لێی دەبێتەوە.

٦– پێش گوتەیەكی كورتكراوە، كە بەیەكێك لەو جۆرە وشانە دەست پێ بكات (هەموو، گشت، یەك یەك، دوو دوو، ئەمە...هی تری وایش) :

– ئازاد و سوارە و سۆران – هەموو دامەزران.

– ئەوان پیاوەكانیان – یەك یەك دەپشكنی.

– منداڵەكان ڕیز دەبوون و – دوو دوو دەچوونە ژوورەوە.

– دەی ویست هەرپارە كۆبكاتەوە و هیچی تر– ئەوە خۆشترین ئاواتی بوو.

٧– بۆپیشاندانی زمان گرتنێك، لەئاخاوتنێكدا:

**بەڵێ، م– من و، ت– تۆ، ب – براین.**

٨–بۆ پیشاندانی كوتوپڕ پچڕانی گوتەیەك :

**ببوورە، گەورەم، بەڵام – ئەو لەمێژەوە هەر وابووە.**

٩– لەپێش وشە، یان دەربڕینێكی دووبارەكراوەدا:

– ئەو مەزنە – مەزنی وەك ناودارانی كۆن .

– نووسینەكەی پڕ بەهایە – پڕ بەهایەكی بێ هاوتا.

١٠–لەنێوان ژمارە و ژمێردراودا، وەك :

| | |
|---|---|
| **یەكەم** – ... | **یان** ١–... |
| **دووەم** – ... | **یان** ٢–... |
| **سێیەم** – ... | **یان** ٣–... |

١١– بەپێشەوەی ڕستەدا، لەجیاتی دووبارەكردنەوەی ناوی ئەو دووكەسەی پێكەوە گفتوگۆ دەكەن، یان بۆپیشاندانی دەستپێكردنی گوتەیەكی نوێ :

گفتوگۆی ژن و پیاوێك.

– ئافرەت، بەلای تۆوە كوێ خۆشە؟

– ئەو شوێنە خۆشە، كەدڵ لێی خۆشە.

– ئەی كام جلەت بەلاوە جوانە؟

– ئەوەی كە ژنی تر لەبەریدا نەبێت .

– ئەی كام پیاوت لاپەسندە؟

– ئەوەی زۆر گوێ بگرێ و كەم قسەبكات، كە كردیشی مەدحم بكات .

**ئەكادیمیای كوردی**

**ڕێكەوتی ١٢/٤/ و ٨/٩ ی ٢٠٠٩ ، لە هەولێر ئامادەی كردووە**

## پاشکۆکان

**دوو هەوڵی بەسوود:**

پاش بلاوکردنەوەی ڕێککەوتننامەی یازدەی ئازاری (١٩٧٠)،کە ئاشتی و ئارامی باڵیان کێشا بەسەر کوردستاندا، ژمارەی چاپەمەنیی کوردی، تادەهات بەرەو زوور هەڵدەکشاو هەوڵی ئەوەیش درا کە ڕێنووسی کوردی لە قاڵبێکی پوخت و باشتردا خۆی بگرێت، ئەوەبوو دوای (١٧)ی تەمووزی (١٩٦٨)چەند دەزگایەکی ڕووناکبیری کوردی دامەزرا، وەك: (کۆڕی زانیاری کورد ) و (زانکۆی سلێمانی) و پێشتریش(بەڕێوبەرێتیی گشتی خوێندنی کوردی) هەرلە کاردابوو. ئەم دەزگایانە، بەشێکی زۆر نووسەرو ڕووناکبیرانی کوردیان لەدەوری خۆیان کۆکردبۆوەو جڵەوی کاری گرنگیان لەڕووی ڕێزمان و ڕێنووسەوە کەوتبووە ئەستۆ، دووان لەم دەزگایانە ،هەر لایەکیان بەپێی بوارو دەسەڵات و کاروباری خۆی، ڕۆڵێکی دیاریان لەمەیدانی ڕێنووسی کوردیدا گێڕا، باشتروایە، وردتر بڕوانینە ئەرك و کۆششی ئەو دوو دەزگایە:

یەکەم: بەڕێوبەرێتیی گشتی خوێندنی کوردی :

*بۆچارەسەرکردن و یەکخستنی ڕێنووسی کوردی لەکتێبەکانی خوێندندا، بەڕێوەبەرێتیی خوێندنی کوردی(کە ڕاستتر وابوو بوترێت(بەڕێوبەرێتیی بەکوردی خوێندن)، بڕیاری ژمارە (١٨)ی ڕێکەوتی (١٩٧٢/٣/٢٠)ی، دا و بەسەر هەموو ئەو لیژنانەی، کە ئەرکی دانانی کتێبی کوردییان پێ سپێردرابوو، بلاوی کردەوە، بەمە ڕێنووسی کوردیی نێو کتێبی قوتابخانەکان یەك شێوەی وەرگرت، ئەمەی خوارەوە پوختەی ئەو بڕیارەیە کە ئەوکات بۆ(یەکخستنی ڕێنووسی کوردی) پەیڕەو کرا:

ئەو وشە عەرەبییانەی کە دەکەونە نێو نووسینی کوردییەوە، دەشێت بە ڕێنووسی کوردی بنووسرێن.

دەشێت بڕگە(وو) لە وشەدا بەدوو(واو) بنووسرێت، وەك: (ووتی، وورچ، کاووڕ).

دەشێت بڕگەی( یی) لە وشەدا بەدوو(ی)بنوسرێت، وەك (مایین، گەییشت، ڕۆییشت، شایی).

٤. پێشگری(ئە) لەسەرەتای فرمانی موزاریعەوە، دەشێت (دە) بنووسرێت، بۆئەوەی هەموو لایەك تێی بگەن، وەك:(ئەنووسم: دەنووسم، ئەچێت : دەچێت ...تاد).

٥. هەندێ تیپ لە وشەی کوردیدا هەن، لەگێرەی عەرەبی دەچن، دەبێ بەدوو تیپ بنووسرێن، وەك:(کەللە، شەممە...) .

تیپی(ت)، هەندێجار لەهەندێ وشەدا دەنووسرێت، ناخوێندرێتەوە، یان هەر نانووسرێت ،بەلأم پێویستە لە وشەکەدا بنووسرێت، وەك:(دەچێت، دەڕوات، دەنووسرێت، دەشوات....تاد) .

پاشگری(دا) نابێ (د)پشتگوێ بخرێت و دەبێ بنووسرێت، وەك: لەزستاندا، لەژیانمدا، نەك لەزستانا، لەژیانما...تاد.

تیپی(د) لەهەندێ وشەدا، لەخوێندنەوەدا کلۆر دەکرێت یان هەر نانووسرێت، وەك:(چانم، چاندم، گۆبەن، گۆبەند، منالْ، مندالْ....تا)پێویستە بنووسرێت.

نابێت وشەی (لێکدراو) بەهیچ جۆرێك بەیەکەوە بنووسرێت، وەك: (گوێلێگرتن، گوێ لێ گرتن، هەڵدەچێت ، هەڵ دەچێت ).

پاشگری (دا، تر، ترین)دەشێت، وەك: پاشگرەکانی تری زمانی کوردی بلکێندرێن بەدوای ئەو وشەیەوە، کە دەچێتەوە سەری، جا ئەگەر وشەکە بەتیپی دەنگی کۆتایی هاتبوو و لەو تیپانەبوو کەبتوانرێ پێوەی بلکێندرێت، وەك:(لەهاویندا، جوانترین).

١١– دەشێت، ڕاناوی لکاو بەو وشەیەوە بلکێنرێت کە دەخرێتە سەری، ئەگەر وشەکە بە تیپێك کۆتایی هاتبوو کە بتوانرێت پێوەی بلکێنرێت، وەك:(یاری مان کرد، یاریمان کرد، دڵ تان ناشکێنم، دڵتان ناشکێنم..تاد).

١٢– ئەر پاشگری(ی– ێك)، کران بە پاشگری ئەو وشانەی کە بە تیپی بزوێن کۆتاییان دێت، دەشێت ناوگری(ی)بخرێتە نێوانیانەوە، چونکە نابێ دوو تیپی بزوێن لە وشەکەیەکدا، بەدوای یەکتر دابێن، وەك:

– کەوا + ی + ێك= کەوایێك.

– چەقۆ + ی + ێك = چەقۆیێك.

١٣- خوێنـدەواران زۆرجـار تیپـە بزوێنـی واوی کـورت( و) و واوی درێـژ( وو) تێکەڵ دەکـەن، کورتەکـە بـە درێـژو درێژەکـە بـە کـورت دەنووسـن، وەك: خـول، خوول، مەنووسە: مەنوسە...تاد).

١٤- لەکاتێکدا(یە)بـەدوای وشـەکەیەوە بێـت، کـە دوا تیپەکـەی بـزوێن بێـت، دەبێت بە جیا بنووسرێن، چونکە دوو تیپـی بـزوێن پێکـەوە نـالکێنرێن و، دەبێـت یان تیپێکی تریان لە نێواندا بێت، یان بە جیـا بنووسـرێن، وەك:(چـییە: چـی یـە، کێیە: کێ یە...). (ی) دووەم ( نەبزوێن)ە.

* لەوکاتـەدا ئـەم بڕیـاری یەکخـستنە بلأوکرایـەوە، تـا دوا ڕۆژەکـانی سـاڵی (١٩٧٥)(بەڕێوەبەرێیتی گشتیی بە کوردی خوێندن)لەسەر ئـەم ڕێوشـوێنە (٢٨٣) کتێبی خوێندنی بە قەوارەی (٦٨٥٧١٣) لاپەڕەدا پێ چاپ کردووە.

* ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەم ڕێنووسە بدەین، دەبینین، هەندێ گیروگرفتـی ڕێنووسـی کـوردی کـە پێـشتر چارەسـەرکراون، ئـەم دەزگایـە، ڕاسـتییەکەی چەسـپاندووە، وەك خاڵـەکانی (١، ٢، ٣، ٥، ٧، ١٠، ١٣)، دەربـارەی خاڵـەکانی ( ٦، ٨)، بۆچـــــوونی ئـــــەم بەڕێوەبەرێتییـــــە، دەربـــــارەی نووسـینی(دەچـێ)بـە(دەچـێت)،(مناڵـەکان)بـە(منداڵـەکان) دروسـت و ڕاسـترە، هەروەها دەربارەی پێشگر، ئەم بەڕێوەبەرێتییە تێیدا سەرکەوتوو بووە.

* گرنگیی بڕیارەکانی ئـەم بەڕێوەبەرێتییـە لەوەدایـە، کـە ڕێنووسـی کـوردی نـاو قوتابخانەکانی یـەك خـست و ئێـستا دەبیـنین زۆربـەی قوتابییـان ومامۆسـتایان و نووسەران پێڕەوی دەکەن.

دووەم/ کۆڕی زانیاری کورد(کۆڕی زانیاریی کورد- ڕاستە) ئەنجومەنی کۆڕ، لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە، بایەخی داوە بە دیاریکردنی ڕێنووسی کـوردی و لیژنەیـەکی تایبەتی بۆ ئـەو مەبەسـتە دانـا، لیژنەکـەش ڕاپـۆرتی خـۆی ئامـادەکردوو دای بـە ئەنجومـەن و ئـەویش کەوتـە لێکۆڵینـەوە و هەڵسەنگاندنی ڕاپۆرتەکـە، دواتـریش لیژنەیـــەکی هەمیـــشەیی بـــۆ دانایـــەوەو ڕاپـــۆرتی ئـــەو لیژنەیەشـــی، لـــە دوازدە کۆبوونەوەدا لێی کۆڵییەوەو بە بۆچوونی خۆی چارەسەری بەشێکی زۆر و گرنگـی کێشەکانی ڕێنووسـی دیـاری کـردوو خـستییە بەردەسـتی زانـاو شـارەزایان، تـاکو لـەماوەی شـەش مانگـدا بـیروڕای خۆیـانی لەسـەردەربڕن و هـەر پێـشنیازێکیان

هەبێت بۆیان بنێرن، بۆئەوەی بتوانن لەبەر ڕووناكیی ئەو بیروڕاو پێشنیازانەدا دوا بڕیاری خۆیانیان لەسەر بدەن، جاوا لە خوارەوە پوختەی ڕێنووسی(كۆڕی زانیاریی كورد)ئەوسا، دەخەینە پێش چاو:

(١) /و/ و /ی/ درێژ، هەریەكەیان یەك دەنگن و تیپی گیراو( مشدد) نین، بۆیە نابێت بە دوو(واو)و دوو( ی)بنووسرێن، بەڵكو دەبێت تەقەڵیان لەسەر دابنرێت.

(٢) لەبەرئەوەی دەنگی تیپی( ص) لە هەندێك وشەدا وەك( صەد، صەگ) دەكەونە بەرگوێ، دەبێت لە ئەلفوبێی كوردیدا هەبن.

(٣) ئەگەر دەنگی/ه/ لە كۆتایی وشەدا ڕوون نەبوو، واتە ئەگەر وەك سەر ((فەتحە)كورت بوو، ئەوا بەمجۆرە(دە، نە)دەنووسرێت، بەلاّم دەنگی/ه/ ڕوون و درێژبوو، ئەوا بە شێوەی(ه) دەنووسرێت، وەك:( دەه، جەه، بوەیه).

(٤) (چی) و (چ) بە جیا بنووسرێن، تەنیا لەبارێكدا نەبێت كە ئەو وشەیەی لە دوایانەوە دێت( ڕاناوی لكاو) بێ، ئەوسا پێكەوە بلكێن، وەك: چتان دی؟ چمان بەسەر كەسەوە نییە، چیم هەیە بۆ نیشتمانە.

( ٥) ژمارەكانی نێوان (١١، ١٩)، بەمجۆرە بنووسرێن:

( یازدە، دوازدە، سیازدە، چواردە، پازدە، شازدە، حەڤدە، هەژدە، نۆزدە).

(٦) ناوی بیانی دەبێت بە ڕێنووسی كوردی بنووسرێت.

(٧) تیپی(ت)ی قەڵەو لە وشەدا، وەك:(سەڵتە، گاڵتە، پاڵتۆ)، دەنگی وەك:(**ط**) دێتە بەرگوێ، پێویستە وەك خۆی(ت) بنووسرێت و نەكرێتە (**ط**).

(٨) وشەی داڕشتە، بەدەم ( بەسەر) یەكەوە بنووسرێت، وەك:(خورمژ، ڕێنووس، ڕێزمان).

(٩) لەو شوێنانەدا، كە وشەی (ئەم) دەچێتە سەر وشە، پێویستە پێكەوە بلكێندرێن، وەك:(ئەمرۆ، ئەمشەو، ئەمساڵ).

(١٠) وشەی گۆڕاو وەك:( هوشیار) بنووسرێت، نەك وشیار، ( پەسەند و گۆبەند) ) بنووسرێت، نەك ( پەسەن و گۆبەن).

(١١) كە ئامرازی( نەفی و نەهی و ئەمر و موزاریع) ، چوونە سەر كاری سادە، ئەوا وەك دەستوورێكی گشتی ئامرازەكە بە كارەكەوە دەلكێندرێت، وەك: (دەكوژێ، ناكوژێ، مەكوژە، نانوێ، نەدەنووست).

(١٢) ئەگەر ئامرازی(نەفی و نەهی و ئەمر و موزاریع)، کەوتنە میانی پێشگرو فیعلی( ئاوێتە– مرکب) ەوە، پێشگرەکە بەتەنیا دەنووسرێت و ئامرازەکەش بە فیعلەکەوە دەلکێت، وەك:( هەڵ دەگرێ، هەڵ بخات، هەڵ نەدەگرت).

(١٣) ناوی ناسادە ئەگەر پێکەوە یەك واتایان هەبوو، پێکەوە بلکێندرێن، وەك: (بەرگدروو، گوڵزار، دڵشاد) .

(١٤) بەڵام ئەگەر وشەی ناسادە، دوو واتای جیاوازیان هەبێت، ئەوا پێکەوە نانووسرێت، وەك (چارۆگە زەرد، چاو ڕەش).

(١٥) دوو وشەی هاوواتا، پێکەوە بنووسرێن، وەك:(پێوقەدەم، گفتوگۆ، گورجوگۆڵ، مشتومڕ، دەستوبرد).

(١٦) ئامرازی (نەفی)یان (نەهی)، دەلکێندرێت بەکارەوە، وەك (مەکوژە، بکوژە، ناگۆڕێ، نەمدین، نەکەی).

(١٧) ئامرازی (نەرێ– (نەفی)، نەهی)، ئەگەر کەوتنە نێوان پێشبەندو کارەوە، ئەوا پێشبەندەکە بەجیا دەنووسرێت، وەك: (هەڵ دەگرێ، هەڵ ناگرێ، هەڵبگرە، هەڵ نەگری).

(١٨) ئەو جووتە وشانەی بەهۆی ئامرازی پەیوەندی (**عطف**) ەوە بەدوای یەکتردا دێن، دەبێ بەجیا بنووسرێن و واوەکە، بەهیچیانەوە نالکێت، وەك:

(**ژن و پیاو**، **باوك و کوڕ**، **نان و دۆ**،**خوشك و برا**).

## سەرچاوەكان

د. ئەورەحمانی حاجی مارف، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢.

نووری عەلی ئەمین، ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی، چاپخانەی سەلمانی ئەعزەمی، بەغداد، ١٩٧٦.

جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، ١٩٧٦.

حامید فەرەج، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغداد، ١٩٧٦.

تاهیر سادق، ڕێنووسی چۆنیەتیی نووسینی کوردی، چاپخانەی شیمال، کەرکووك، ١٩٦٩.

مستەفا نەریمان، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، زنجیرەی زمان (٥)، بەغداد، ١٩٨١.

مەسعوود محەمەد، بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغداد، ١٩٧٨.

ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زەنگی کاروانی ڕێنووس، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢.

ڕاسپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی، کۆڕی زانیاریی عێراق (دەستەی کورد)، لە بەغداد، لە ١٨ ـ ١٩٨٥/١٢/١٩ گێڕاویە.

ڕاگەیاندننامەی کۆتایی سیمیناری زمانی کوردی، هەولێر ٢٠ ـ ١٩٩٨/٩/٢٢.

شاکر فەتاح ئەحمەد، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی و شێوەی چارەکردنیان، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢.

عومەر عەبدولڕەحیم، ڕێنووسی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢.

محەمەد مەعرووف فەتاح، نووسینی کوردی لە ڕوانگەی فۆنەتیکەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢.

وریا عومەر ئەمین، ئیملای کوردی و چەند تێبینییەك، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق ـ دەستەی کورد)، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢.

د. کامیل بەسیر، خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢.

بەدران ئەحمەد حەبیب، پرۆژەی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی، هەولێر، ٤/٥/٢٠٠١.

تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغداد، ١٩٢٩.

(١) لێکۆڵینەوە و تێبینی و سەرنج و ڕەخنە و پێشنیار و بۆچوون و ڕاسپاردەکانی بەشداربووانی کۆنفرانسی:(**بەرەو ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی**)، کە ئەکادیمیای کوردی ڕێکەوتی (٤/١٢ و ٨/٩ی ٢٠٠٩) لە هەولێر سازی کرد و ئەم بەڕێزانە ئامادەی بوون:

- د. فارووق عومەر سەدیق.
- د. هۆگر مەحموود.
- م. سەگڤان جەمیل محەمەد.
- م. تاریق سالح مەحموود.
- م.عەبدولستار فەتتاح حەسەن.
- د. هەڵکەوت حەکیم.
- د. ئازاد ئەحمەد.
- د. تالیب حوسێن.
- م. سادق ئەحمەد .
- د. سەباح ڕەشید.
- د. یوسف شەریف.
- م. سەلام ناوخۆش.
- م. عوسمان محەممەد هەورامی.
- د. فەرەیدون عەبدول بەرزنجی.
- د. عەبدولوەهاب خالید موسا.

پێداچوونەوەی کۆتایی لەلایەن ئەندامانی لیژنەی ڕێنووس:

١- م. جەمال عەبدول.
٢- د. ئازاد ئەحمەد.
٣- م. تاریق سالح.
٤- م. سەلام ناوخۆش.

# فەرهەنگی زاراوە مێژووییەکان

لێژنەی مێژوو

**چەند وتەیەکی پێویست :**

یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی لێژنەی مێژوو لە ئەکادیمیای کوردی ساغکردنەوەی تێرمینەلۆژیا و زاراوەکانە لە بواری زانستی مێژوودا بۆ ئەوەی شارەزایان و پسپۆرانی ئەم بوارە زانستییە یەکدەنگ وهاوبیر بن لە بەکارهێنانی ئەوانەی پێیان راستن و جێگیر دەبن. خوێنەرانی کورد پێویستییان بەوە هەیە کاتێ دەقێکی مێژوویی کوردی دەخوێننەوە تێرمینەلۆژیا و زاراوەکان کوردی بن و تا بکرێ و لە تواناادا بێ زاراوەی بیانی بەکار نەهێنن. لەم دیدەوە لێژنەی مێژوو ماوەیەك خەریکی ساغکردنەوەی کۆمەڵێ زاراوەی مێژوویی بوو. وا بەرکوڵەکەی بە چەند بەشێك لە گۆڤاری ئەکادیمی بڵاو دەکەینەوە. مەبەست لە بڵاوکردنەوەی ئەم زاراوانە بەم شێوەیە ئەوەیە کە شارەزا و پسپۆران لێیان ورد ببنەوە و تێبینی و بۆچوونەکانی خۆیان لە بارەیانەوە پێشکەش بە لێژنەی مێژوو بکەن، لە گۆڤاری ئەکادیمی یا هەر بڵاوکراوەیەکی تر کە پێیان باش بێ بڵاوی بکەنەوە. ئێمە لە لێژنەی مێژوو پێشوازی لە هەر تێبینی و راستکردنەوەیەك دەکەین کە لە بارەی زاراوە مێژووییەکانەوە پێشکەشمان دەکرێن، چونکە مەبەست لەم کارەمان خزمەتکردنی مێژووی کوردە. لە دواییدا ئەم زاراوانە لە دووتوێی فەرهەنگێکدا کۆ دەکرێنەوە و دەخرێنە بەردەم خوێنەران .

لێژنەی مێژوو لە ئەکادیمیای کوردی لەم ئەندامانە پێکهاتووە (پرۆفیسۆر جەبار قادر– سەرۆکی لێژنە، پ. ی. د. سەعدی عوسمان ، پ. ی. د . قادر محمەد حەسەن، دکتۆر حکیم مام بەکر و دکتۆر محەمەد کاکە سوور — ئەندامانی لێژنە). ئەندامانی لێژنە ئەم ئەرکەیان گرتە ئەستۆی خۆیان و کارەکەیان بە گوێرەی پسپۆری و پیتەکان لە نێو خۆیاندا دابەش کرد و بۆ ماوەیەکی باش سەرباری کارەکانی تریان لە زانکۆ ئەم ئەرکەیان بەجێ هێنا .

لە قۆناغە جیاوازەکانی کاری لێژنەی مێژوودا چەند مامۆستا و پسپۆرێکی تریش لە گەڵماندا بوون ، بەڵام بە هۆی دووریی شوێنی کار و ژیان و زەحمەتی هاتوچۆوە نەیانتوانی لە گەڵماندا بەردەوام بن. لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە رۆڵیان لە لێژنەی مێژوو بکەم وەکو پرۆفیسۆر عەبدولفەتاح بۆتانی، پ. ی . د. یاسین سەردەشتی، پ.ی. د. زرار سدیق و د. نیشتمان بەشیر.

هیوادارین لە داهاتوودا ژمارەیەکی زۆرتر لە شارەزا و پسپۆرانی مێژوو بەشداری لە کار و چالاکییە زانستییەکانی لێژنەی مێژوودا بکەن.

دەکرێ لە مەڕ هەموو ئەم زاراوانەی لێرەدا بڵاو دەکرێنەوە گفتوگۆی زانستی بکەین و ئەوەی پێویستی بە راستکردنەوە و پێداچوونەوە هەبێ راستی بکەینەوە وپێیدا بچینەوە.

بەشی یەکەم زاراوەکانی پیتەکانی (أ و ب ) دەگرێتە خۆ.

**پرۆفیسۆر جەبار قادر**
**سەرۆکی لێژنەی مێژوو**

## بەشی یەکەم

### پیتی – آ –

**آباد (فارسی):**

ئاوەدان، چێندراو، شوێنی نیشتەجێ. هەروەها دەکرێ بە پاشگری ناوەکان و گوزارشت لە ناوی چەند ناوچە یان شارێك دەکات، وەکو (احمد آباد، حیدر آباد، أمیر آباد) چونکە لەگەڵ ناوی گوند یان شارێك بەکاردەهێندرێت بەمەش ناوی دروستکەری شارەکە یان نۆژەنکەرەوەکەی بەدیار دەخات وەکو (حسن آباد).

**آبازە (تورکی):**

ناوی ئەبخازییەکانە لە زمانی تورکیدا، چەند کەسێك لە مێژووی عوسمانی ئەم نازناوەیان هەبووە، چونکە بەرەچەڵەك ئەبخازی بوون. ئەبخاز هۆزێکی قەوقازییە لە بنەڕەتدا لەسەر کەنارەکانی دەریای ڕەش دەژیان لە بەناوبانگترین ئەو کەسانەی ئەو نازناوەیان هەڵگرتووە ئەمانە بوون: ئەبازە پاشا (م ١٦٣٤ز) ئەبازە حسن (م ١٦٥٨ز) ئەبازە محمد پاشا (م ١٧٧١ز).

**آتشچی (تورکی):**

ئاگر خۆشکەر، لە سەردەمی عوسمانی بۆ ئاگر خۆشکەر لە شەمەندەفەرە بوخارییەکان بەکارهاتووە.

**اتقچەچی (تورکی):**

بەرپرسی باڵندەکانی ڕاو بوو، ئەو کەسە بوو کە ئەم باڵندانەی سوڵتانی لەلا بوو کە بۆ ڕاو دەچوون.

**آجر (فارسی):**

خشتی سوورکراو کە بۆ بیناکردن بەکاردێ. لەوشەی (ئاگر) وەرگیراوە.

**آخوند (فارسی):**

خاوەن، خێو، پیاوی ئاین، مامۆستا. وتراوە لە بنەڕەتدا لە زمانی جەغتائییەوە هاتووە — بۆ پیشەی مامۆستا، و هەندێ جاریش بەواتای جێگر بەکاردێت.

**آخیان روم (عەرەبی):**

برایـانی ڕۆم، ئەمـە ڕێکخراوێکـی نیمـچە ئـایینی – سـەربازی بـوو، کـە لـە کۆتاییـیەکانی سـەردەمی سـەلجووقی و سـەرەتاکانی سـەردەمی عوسمـانی لـە ناوچـەکانی ڕۆژئـاوای ئـەنادۆڵ پەیـدابوو. لـە بنەڕەتـدا لەسـەر بنـەمای سـەندیکا پیشەگەرییەکان دامەزرابوو. دواتـر لەگـەڵ هێزەکـانی عوسمـانی ڕۆڵیـان بـینی لـە فراوانخوازیەکانی عوسمانی لە سەرەتای دامەزران و بەهێزبوونی ئەم دەوڵەتە.

**آرپە أمینی (تورکی – عەرەبی):**

ئالیك دابینکەر، ئـەو کەسـە بـوو کـە ئـەرکی دابینکردنـی ئـالیکی ئاژەڵـەکانی تەویلەکانی سوڵتانی پێ سپێردرابوو. هەروەها لە سەردەمی عوسمانی بەگرنگترین ئەفسەرانی خزمەتی دەرەکی کۆشکی سوڵتانی دەگوترا.

**آستان قدس (فارسی – عەرەبی):**

شوێنی پیرۆز، زاراوەیـەك بـوو لـە عێـراق بـاو بـوو بـۆ ئامـاژەکردن بـە شـوێنە پیرۆزەکان تیایدا.

**آشجی باشی (فارسی – تورکی):**

لـەڕووی زمانەوانییـەوە بـەمانای سـەرۆکی چێـشت لێنـەران دێـت. لـەڕووی زاراوەشەوە بەرپرسی تیپێك بوو لە تیپەکانی سوپای عوسمانی.

**آغا (تورکی):**

لە زمانی فارسی مانای پیاوی مەزن و گەورە و لە تورکی عوسمـانی بـە واتـای سەرۆك یان سەرکردە و بەرپرسی کارێك دێت. لـەزمانی کـوردیش بـۆ دەرەبـەگ و سەرۆك هـۆز بـەکاردێت. لـە سـەردەمی عوسمـانی وەکـو نازناوێـك بـۆ هەنـدێك لـە خاوەن پلەو پایەکان بەکاردەهات چ سەربازی یـان مـەدەنی، وەك لـە زاراوەکـانی دواتردا بەدیاردەکەوێ.

**آغا الانکشاریة (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بـۆ سـەرۆکی هێزەکـانی ئینکـشاری بـەکاردەهات، کـە لەپێـشەوەی هـەموو ئەفـسەرانی دەوڵـەت بـوو، و لەگـەڵ سـەدری ئـەعزەم و وەزیرەکانی تر بەشداری لە دانیشتنەکانی دیوانی هومایۆنی دەکرد.

**آغا الاوجاق (توركی):**

لە سەردەمی عوسمانی بۆ سەرکردەی یەك ئۆجاق بەکاردەهات، کە یەکەیەکی هێزی ئینکشاری بوو.

**آغا یماقچی (توركی):**

پلەیەکی سەربازی بوو لە دەولەتی عوسمانی بەیارمەتیدەری ئاغای ئینکشاری دەگوترا.

**آغایان رکاب همایون (توركی – فارسی – عەرەبی):**

ئاغایانی کەژاوەی سوڵتان.

**آق (توركی):**

واتە سپی، زۆرجار دەبێتە پێشگری ناوەکان وەکو: آق سقر = (بازی سپی)، آق بایُق = (سمێڵی سپی). یان بۆ شوێن بەکاردێت وەکو: آق حصار = (قەڵای سپی)، آق تپە = (گردی سپی). یان هۆزەکان وەکو لەماددەی داهاتوودا دەیبینین.

**آق قوینلو (توركی):**

ناوی هۆزێکی تورکمانییە لەنێوان ساڵانی (١٤٦٧–١٥٠٨ز) فەرمانڕەوایی ئێران و عێراق و بەشێکی کوردستانیان کردووە.

**آقچە (توركی):**

لەرووی زمانەوانییەوە بەواتای سپیپات دێت، بەو دراوە زیوییە بچووکانە دەوترێت کە لە سەردەمی سوڵتانی عوسمانی ئۆرخان (١٣٢٦ – ١٣٦٠ز) لێدراون. وە بەهایەکەی ٣/١ پارەی عوسمانی و ١/٦٠ی دیناری زێڕی عوسمانی بوو.

**آلای (توركی):**

کەژاوە، تیپ، جوانکاری، ئاهەنگ. دەبێتە پاشگریش بۆ هەندێ ناو وەکو: میرآلای– کە پلەیەکی سەربازیە، کلین آلای– واتە کەژاوەی بووك.

**آلای بگ (توركی):**

نازناوێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی دەدرایە ئەفسەرێك لەژێر فەرمانداری (سەنجەق بەگ) کاری کۆکردنەوەی سەرباز بوو بۆ شەڕ. یان لەکاتی شەڕدا جێگای ئەوی دەگرتەوە.

**آلای چاویش (تورکی):**

زاراوەیەکی لێکدراوە لە سەردەمی عوسمانی بەکارهاتووە بۆ بانگەوازکەرێکی سەربازی کە نامە هەڵگرە و ئاگاداری دەرچوونی کەژاوە فەرمییەکان دەکات پێش بەڕێکەوتنیان.

**آلب ارسلان (تورکی):**

لەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای شێری ئازا دێت. ناوی یەکێك لە سوڵتانە سەلجوقییە دیارەکانە لە سەردەمی عەباسی و پاڵەوانی شەڕی (مەلازگرد)ی یەکلاکەرەوە بوو، کە لەساڵی (١٠٧١ز) لەنێوان دەوڵەتی عەباسی و ئیمپراتۆریەتی بیزنتی ڕووی دا.

**آلتون (تورکی):**

زێڕ، هەروەها بەواتای دراوی زێڕ دێت و زۆرجار ئەم وشەیە دەچێتە سەر زاراوەو ناوی کەسەکان وەکو: آلتون بغا = گامێشی زێڕین، آلتونچی = زێڕینگر، آلتون کۆپری = پردی زێڕین.

**آمدچی (فارسی – تورکی):**

لە ڕووی زمانەوانییەوە بەمانای خاوەنی گوڵ دێت. بەڵام بە سەرۆکی دیوانی سوڵتان دەگوترا کە کارەکەی بریتی بوو لە نووسینی نامە بۆ بابی عالی.

**آمدي دیوان همایون (فارسی – عەرەبی – فارسی):**

زاراوەیەکی لێکدراوە عوسمانییەکان بەکاریانهێناوە بۆ سەرۆکی دیوانی سوڵتان هەروەها هۆکاری پەیوەندیکردنە لەنێوان سوڵتان و حەرەمسەرا.

**أبدال (تورکی):**

پلەیەکە لە هەندێ تەریقەتی سۆفیگەری، هەروەها بەدەروێشی گەڕۆکیش دەگوترا.

**ابدالان روم (تورکی):**

ئەبدالانی ڕۆم، پێکهاتەیەکی ئاینی – سیاسی بوون لە تورکمانەکانی ئەنادۆڵ کە سەربەهەندێ تەریقەتی سۆفیگەری بوو، وەك مەولەوی و بەکتاشی. ئەم پێکهاتەیەش بەشێك بوو لە هێزە شەڕکەرەکانی دەوڵەتی عوسمانی پێش دامەزراندنی لەشکری ئینکشاری لەم دەوڵەتەدا.

**ابراهيمية (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەجۆرێك تفەنگ دەوترا كە لە ولآتی شام دا هەبوو بەناوی (ابراهيم پاشا)ی كوڕی محمد علی پاشا (م ١٨٤٨ز) ناونرابوو. بەشێوەیەكی بەرچاو درێژ بوو.

**ابن ناس (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەماليك بە كوڕی مەملوكی ئازادكراو دەوترا، و لەوانەیە بەكۆ بەشێوەی (اولاد ناس) بگوترێت.

**أتابك (توركی):**

دەربڕينێكی لێكدراوە لە "أتا" واتە باوك و (بگ) بەمانای مير. بەمانای سەرپەرشتيارو بەخێوكەری ميرە توركەكان دێت. لە سەردەمی سەلجووقييەكاندا ئەم نازناوە خرايە پاڵ هەندێك لە ميرە ديارەكان كە لەلايەنی باوكەوە خزمی فەرمانڕەوا بوون.

**أتابك عسكر (توركی – عەرەبی):**

لە گەورەترين ميرە زەبربەدەستەكان بوو، لەدوای نائب لە دەوڵەتی مەماليك.

**اتفاقية (عەرەبی):**

ڕێكەوتننامە، پێكهاتنێكە لەنێوان دوو لايەن، بەڵام ئەم پێكهاتنە نەگەیشتۆتە ئاستی پەيماننامە و لە ڕێكەوتنێكی ئاساييش بەهێزترە.

**الاتك (توركی):**

لچكی كراس، زاراوەيەكە لە هەردوو سەردەمی مەماليك و عوسمانی باو بوو، كاتێك لچكی كراسی سوڵتان ماچ دەكرا بۆ پيرۆزی و داوای لێخۆشبوون.

**إجارەلی (عەرەبی – توركی):**

(إجارە) واتە كرێ و (لی) ئامرازی گێڕانەوەیە لە زمانی توركی. زاراوەيەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ جۆرێك لە سەربازی بەكرێگيراو بەكاردەهات كە كاريان پاراستنی قەڵاكان بوو.

**إجازتنامە (عەرەبی – فارسی):**

مۆڵەتنامە، نووسراوی ڕێپێدان، لە سەردەمی عوسمانی بۆ ئەو نووسراوە بەكاردەهات كە دەدرا ئەو كەسەی بڕوانامەی لە زانستێك پێدراوە.

**أجزاخانه (عەرەبی – فارسی):**

دەربڕینێکی لێکدراوە لە (أجزا) واتە دەرمان و (خانە)ی فارسی واتە شوێن. لە سەردەمی عوسمانی بۆ دەرمانخانە بەکاردەهات.

**اجماع (عەرەبی):**

یەکدیگربوونی بۆچوونەکان لەبارەی مەسەلەیەکی شەرعییەوە.

**أجیال (عەرەبی):**

نەوەکان ، وەچەکان.

**الاجلاب (عەرەبی):**

واتە هێنراوەکان، گرووپێك بوون لە مەمالیك، سوڵتان بۆ خۆی هێنابوونی یان کڕیبوونی.

**الاجناد البحریة (عەرەبی):**

چینی سێیەم بوون لە سوپای مەملوکی، یەکەم کەس ئەو ناوەی لێنان سوڵتان ساڵح نجم الدین أیوب بن الملك الکامل محمد (١٢٤٠ – ١٢٤٩ز) بوو.

**الاحباس (عەرەبی):**

ئەو زەویانە بوون کە دەخرانە خزمەت سوپا، تاڕادەیەك لە ئەوقاف دەچێت.

**احتساب آغاسي (عەرەبی – تورکی):**

فەرمانبەرێکی عوسمانی بوو ئەرکەکەی بریتی بوو لە جێبەجێکردنی شەریعەت و ڕێسا کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان لە بازاڕ و گەڕەکەکاندا و دابینکردنی خواردەمەنی بۆ شار، وە دابینکردنی یاسا پەیوەستدارەکان بەخاوەن پیشەکان، هەندێك جار دەسەڵاتێکی قەزایی سنوورداری پەیڕەو دەکرد وەك گرتن و بەندکردن و سەپاندنی سزای دارایی.

**احتکار (عەرەبی):**

پاوانکردن، قۆرخکردن.

**اختیار (عەرەبی):**

لە (اختیار) واتە دەستنیشانکردن هاتووە، بەڵام زیاتر مەبەست پیاوی پیر و بەتەمەنە. تورکەکان زۆربەی کات کەسە بەتەمەنەکانیان دەستنیشان دەکرد بۆ ئەوەی لە ئەنجومەنی شارەکان ئەندام بن.

**اختام مسطحة (عەرەبی):**

مـۆری رووتـەخت، جـۆرە مۆرێـك بـوو لـە سـەردەمانی مێـژووی كۆنـەوە بەكاردەهات، وەك مۆری ئێستا تەخت بوو .

**إدارە تاریخچی (عەرەبی – توركی):**

زاراوەیەكە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی بەكارهاتووە بۆ ئەو دەزگایەی كە ئـەركی بـریتی بـوو لـە مێـژوو دانـان بـۆ هـەموو ئـەو بەڵگەنامانـەی لـە بەڕێوەبەرایەتییەكانی تر دەردەچوون.

**أدر (عەرەبی):**

كۆی (دار) واتە خانووە، لە سەردەمی مەمالیك وەكو زاراوەیـەك بـەكاردەهات بۆ شوێنی كار و دانیشتنی سوڵتان، و بە ئافرەتە پایە بەرزەكانی وڵاتیش دەوترا.

**إذن نامة (عەرەبی – فارسی):**

زاراوەیەكی عوسمانی بوو تایبەت بە بەڵگەنامەی گرێبەستی ژن هێنان كـە لـە یەكێك لە دادگا شەرعییەكان دەردەچوو.

**أردو (مەغۆلی):**

لە رووی زمانەوانییەوە بەمانای سـەربازگە دێـت، بـەڵام بـەزمانی دانیـشتووانی (پاكستان)یش دەگوترێ (اردو) لەڕووی وشە و ڕێزمانەوە هەردوو زمانی فارسـی و هینـدی، لـە پـاڵ هەنـدێك وشـەی تـوركی و عـارەبی تێدایـە، ئەمـە زمـانی موسوڵمانەكانی هیندستان بوو كە كرا بە زمانی فەرمی لە پاكستان.

**ارسلان (توركی):**

واتـا شـێر، لەوانەیـە بەشـێوەی (أصـلان)یـش بێـت كـە وەك نـاوی كـوڕان بەكاردەهات. نازناوی بنەماڵەیەكی لوبنانییە.

**أرسلانلي (توركی):**

لە (ارسلان) واتە شێر و (لی) كە ئـامرازی بۆگێڕانەوەیـە پێكهـاتووە، دراوێكـە لەسەر یەكێك لە رووەكانی شێر هەیە بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە.

**الازارقة (عەرەبی):**

دەستەیەكی خەواریجی زۆر توندڕەو بوون.

**ارناوؤط (تورکی):**

ناوی گەلێکە لە ڕەگەزی ئاری بە ئەلبان ناسراون، لەو ناوچەیەدا دەژین کە دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ئەدریاتیك.

**أزعر (عەرەبی):**

لەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای کلك بڕاو دێت، بەکۆمەڵە خەڵکێك دەگوترا کە لەیاسا دەردەچوون و ئاژاوە و پەشێوییان دەنایەوە لە کۆتاییەکانی سەردەمی مەمالیك و سەرەتاکانی سەردەمی عوسمانی بەکارهاتووە.

**اسبنجە (تورکی) :**

ناوێکی تری باجی (چفت رسم) بوو کە کریستیانەکان لە دەوڵەتی عوسمانی دەیاندا.

**إسپر (تورکی):**

بەشێکی دراوی زیوی عوسمانی (أقچە) بوو.

**أستاذ (فارسی):**

بەمانای مامۆستا و بەخێوکەر دێت. لە سەردەمی مەمالیك بەو کەسە دەوترا کە مەملوکی بەپارە دەکڕی و پەروەردەی دەکرد، ئینجا ئازادی دەکرد، پەیوەندی ئوستازی لە بەهێزترین پەیوەندییەکانی سەردەمی مەملوکی بوو.

**استبداد (عەرەبی):**

ستەمکاری، مەبەست دەسەڵاتێکی بەزەبر و زەنگە.

**أستدار (فارسی):**

پارە وەرگر، کاروباری تایبەتی سوڵتانی بەڕێوە دەبرد لەڕووی چێشتخانە و دار و دەستە و کارکەرەکانی سوڵتان.

**إستدار الصحبة (فارسی — عەرەبی):**

زاراوەیەکی مەملوکییە بەو کەسە دەوترا کە چێشتخانەی سوڵتانی بەڕێوە دەبرد، لەکاتی ئاسایی و سەفەرکردن لەگەڵ سوڵتاندا دەبوو.

**استفتاء (عەرەبی):**

ڕاپرسی، یان گەل پرسی، ئەوەیە کە بۆ هەندێ مەسەلەی چارەنووسساز (وەك: دەستوور، یان چارەنووسی گرووپێکی ئێتنیکی) سیاسەتمەداران پرس

بەگەل دەکەن و لەشێوەی دەنگدان کارەکە ئەنجام دەدرێ. لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی کۆمەڵەی گەلان چارەنووسی هەندێ میللەتی ئەوروپای بەم ڕێگەیە یەکلا کردەوە.

**الاستكشافات الجغرافية (عەرەبی – یۆنانی):**

دۆزینەوە جوگرافییەکان، مەبەست ئەو دۆزینەوانەیە کە لە سەرەتاکانی سەردەمە نوێیەکان (سەدەکانی ١٥–١٦) ئەوروپییەکان پێی هەستان لە ئەنجامدا چەندین ناوچە و کیشوەری گۆی زەوییان دۆزییەوە کە پێشتر نەناسراو بوون ، وەك هەردوو کیشوەری ئەمەریکا و ئوسترالیا و ڕێگای باشووری ئەفریقیا.

**استيد (هیندی):**

بەمانای خاتوونی بچووك دێت، فارسەکان لە هیندییەکانیان وەرگرتووە بۆ گوزارشتکردن لە هەسارەی زوهرە .

**إسطبل (لاتینی):**

تەویلەی ئاژەڵان کە بۆ ئەسپ و وڵاغ ئامادە کراوە.

**أسطرلاب (یۆنانی):**

ئامرازێکە فەلەکناسەکان بەکاریان دەهێنا، هەندێك بازنە و هێڵی لەسەرە کەلوەکانی ئاسمان دەنوێنێ.

**أسطه (فارسی):**

وەستای پیشەیەك، یان کرێکاری شارەزا لە کارەکەی خۆیدا. هەروەها پایەیەك بوو لە بەشی (حەرەمسەرا) لە دەرباری عوسمانی.

**أسطەباشی (فارسی – تورکی):**

باش وەستا، یان سەر وەستا کە گەورەی وەستایەکانە لە کارێکدا.

**اسطورة (یۆنانی):**

ئەفسانە، چیرۆکی دوور لە ڕاستی و بێ بنەما، ئەگەرچی بەپێی نوێترین بۆچوونەکان هەر ئەفسانەیەك لە بنەڕەتدا لەسەر ڕووداوێکی ڕاستەقینە بنیاد نراوە ، بەڵام دواتر زیادەی زۆری خراوەتە سەر و لەڕاستی دوور کەوتۆتەوە.

**اسكله (ئیتالی):**

زاراوەیەکی سەردەمی عوسمانییە، واتە (پرد) جا پردی ئاسایی بێت یان ئەو ئامرازەی کە بۆ بیناکردن بەکاردەهات. ئێستا لای کورد بەو مەبەستەی دوایی بەکاردێ.

**اسکودار (فارسی – عەرەبی):**

زاراوەیەکە لە سەردەمی عەباسی بەکارهاتووە بۆ تۆمارێك لە تۆمارەکانی دیوانی ئینشاء تیایدا ڕاپۆرتە هاتووەکان و هەروەها ناردراوەکان و ناوی نووسەرەکانیان تۆمار دەکرد. هەروەها ناوی ناوچەیەکیش بوو لەسەردەمی عوسمانی کە لەسەر کەناری ئاسیاوی گەرووی بسفۆر بوو.

**اسکي (تورکی):**

کۆن، هەروەها بەو کورسییە دەوترا کە بووك لەسەری دادەنیشت لە سەردەمی عوسمانیدا. زۆر جار لەگەڵ ناوێك لێکدەدرا وەك: إسکی شهر = واتە: کۆنەشار.

**اسلاف (عەرەبی):**

باب و باپیران، پێشینان.

**الاصلاح الدینی (عەرەبی):**

چاکسازی ئایینی، ئەو بزووتنەوانە بوو کە لە سەرەتاکانی سەردەمی نوێدا لە ئەوروپا سەری هەڵدا لەپێناو چاکسازی کردن لە کەنیسەی کاسۆلیکی و نەهێشتنی گەندەڵییەکانی. ئەم ئاراستە نوێیە چەندین وڵاتی ئەورووپای گرتەوەو چەندین ڕێبەری ئایینی نوێ پەیدا بوون، بەڵام لە هەموویان بەناوبانگتر مارتن لۆسەر (١٤٨٣–١٥٤٦ز ) بوو کە لە ئەڵمانیا سەری هەڵدا و لە ئەنجامدا مەزهەبێکی نوێی مەسیحی پەیدا بوو بەناوی (پرۆتستانتی).

**أطلس (یۆنانی):**

نەخشەی جوگرافی.

**اعتماد الدولة (عەرەبی):**

پایەیەکی گەورەی فەرمی بوو لە هەندێ سەردەمی مێژووی ئێراندا بەکاردەهات، بەتایبەتی لە کۆتاییەکانی سەردەمی سەفەوی و دواتر. وەك سەدری ئەعزەم وابوو.

**افتاء دار العدل (عەرەبی):**

دەزگایەکی ئایینی – دادوەری بوو لە دەوڵەتی مەمالیك کاری بریتی بوو لە یەکلاییکردنەوەی مەسەلە شەرعییەکان، و لە چوار قازی لە هەر چوار مەزهەبەکە پێکدەهات.

**إفريز (فارسی):**

جۆرێك بوو لە نەخش و جوانكاری سەر دیوار و دەرگا و پەنجەرە .

**أفشين (توركی):**

نازناوێك بوو لە ناوەڕاستی ئاسیادا بۆ میرەكان بەكاردەهات.

**أفندي (توركی):**

نازناوێك بوو لای عوسمانییەكان بۆ فەرمانبەران و پیاوانی ئاینی و ئەفسەرە بچووكەكانی سوپا بەكاردەهات. وە لە كۆتاییيەكانی سەردەمی عوسمانی بۆ ڕێزگرتن دەخرایە سەر ناوەكان.

**أفيون (یۆنانی):**

ئەفیون، ڕووەكێكە شێوەكەی لە سیر دەچێت و ماددەیەكی هۆشبەرە، بە(خەشخاش)یش دەناسرێت.

**إقامة (عەرەبی):**

لە زاراوەكانی سەردەمی مەمالیك بوو، بریتییە لە پێویستییەكانی سەربازان لە ئازووقە و ئالیك و كەلوپەلی تری سەفەركردن وەك خیوەت و شتومەك.

**إقبال (عەرەبی):**

نازناوێك بوو لە سەردەمی عوسمانی بەو كەنیزەیە دەوترا كە خزمەتی سوڵتانی دەكرد، ئەگەر بكەوتبایە بەر دڵی و ببوایە دایكی كوڕی دەبوو بە (قادین) بەمەش جێگای یەكێك لە ژنەكانی سوڵتانی دەگرتەوە.

**الاقطاع (عەرەبی):**

وشەیەكی عەرەبییە لە ڕووی زمانەوانییەوە دەكاتە (دابڕین)، مەبەست دابڕین یان تەرخانكردنی پارچە زەوییەكە بۆ كەسێك لەلایەن حكومەت یان دەسەڵاتدارێكەوە، وەكو پاداشتێك یان بەخشینێك لەجیاتی مووچە یان لەبری خزمەتێك كە ئەو كەسە پێشكەشی دەوڵەتی دەكات یان كردوویەتی. لە سەردەمی بوەیهی پەیدابوو دواتر لەلای سەلجووقییەكان پەرەی سەند و لە دەوڵەتی عوسمانیش گەیشتە ئەوپەڕی پەرەسەندن. ئەمە ڕژێمێكی ئابووری– كۆمەڵایەتی هێنایە كایەوە كە پێی دەگوترێ (الاقطاعیة) واتە (دەرەبەگایەتی) یان (فیودالیزم).

**إقليم (یۆنانی):**

هەرێم ، دەڤەر، ناوچە.

**أقنجي (تورکی):**

سوارەی نانیزامی بوون لە دەوڵەتی عوسمانی، وەکو پێشڕەو وابوون لە سوپای عوسمانیدا.

**إكسير:**

بەردێکی بەنرخە کە توانای گۆڕینی سیفەتی شتەکانی هەیە.

**التيلق (تورکی):**

دراوێکی زێڕی عوسمانی بوو بەرامبەر بە شەش قروش بوو.

**ألفي (عەرەبی):**

چینە میرێك بوون کە بەرزترین پلەیان لە لای مەمالیك هەبوو.

**إمام (عەرەبی):**

ڕابەر، پێش نوێژ.

**امصار (عەرەبی):**

شارەکان، شوێنە نشینگەییەکان.

**أمير اخور (عەرەبی – فارسی):**

میری تەویلەکانی سوڵتان ، یان سەرپەرشتیاری ئەسپ و وڵاغەکانی سوڵتان، کەسێکی گرنگ بوو لە هەردوو سەردەمی ئەیوبی و مەمالیك.

**الامبراطورية :**

ئیمپراتۆری، قەوارەیەکی سیاسییە کە لە دەوڵەت گەورەترە چونکە چەند وڵاتێك دەگرێتە خۆ.

**أمير جندار (عەرەبی – فارسی):**

پارێزەری گیانی سوڵتان.

**أمير الحج الشامي (عەرەبی):**

والی دیمەشقی عوسمانی، چونکە لە ساڵی ( ١٦٧١ ز)یەوە سوڵتانەکانی عوسمانی سەرکردایەتی کاروانی حەجیان بە والی دیمەشق دەسپارد، بۆیە ئەم نازناوەی لێ نرابوو.

**أمیر داد (عەرەبی – فارسی):**

دادوەر یان وەزیری داد بوو لەلای سەلجووقییەکان.

**أمیر زردکاش (عەرەبی – فارسی):**

ئەو میرە بوو کە بەرپرس بوو لە شوێنی پاراستنی چەك.

**أمیر سلاح (عەرەبی):**

سەرپەرشتیاری چەکە تایبەتییەکانی سوڵتان بوو لە سەردەمی مەمالیکدا.

**امیر شکار (عەرەبی– فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیکدا باو بوو بەو کەسە دەوترا کە سەرپەرشتی پێویستییەکانی ڕاووشکاری سوڵتانی دەکرد.

**أمیر طبر (عەرەبی– فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیکدا باو بوو، بەمیرێك دەوترا کە سەرپەرشتی تەورهەڵگرانی دەکرد لە کەژاوە سوڵتانییەکاندا.

**أمیر عشرة (عەرەبی):**

پایەیەکی سەربازی مەملوکی بوو بەمیرێك دەدرا کە سەرکردایەتی (١٠–٢٠) سواری دەکرد.

**أمیر مئة (عەرەبی):**

پایەیەکی سەربازی مەملوکی بوو بە میرێك دەدرا کە سەرکردایەتی سەد سوار و هەزار سەربازی دەکرد.

**أمیر نوبة النوب (عەرەبی):**

زاراوەیەکی مەملوکی بوو لە پایەبەرزترین سەربازەکان بوو.

**امیر البحر (عەرەبی):**

میری دەریا، سەرکردەی کەشتیگەل یان هێزی دەریایی بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، دواتر زاراوەی (قبودان دریا) بەکارهات کە دەکاتە (کاپتن یان قبطان).

**أنبارلر أمینی (فارسی – تورکی– عەرەبی):**

ئەمینداری کۆگا دەریاییەکان بوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

**أنتداب (عەرەبی):**

مانیـدات، شـێوازێکی دەسـەلاَتی ئیـستعماری بـوو کـە دوای جـەنگی یەکـەمی جیهانی لـە هەنـدێ لـە داگیرگـەکان پـەیڕەو کـرا، وەك قۆنـاغێکی پەرەسـەندووتر لەچاو داگیرکردنی ڕاستەوخۆ.

**انتفاضة (عەرەبی):**

ڕاپەڕین ، سەرهەڵدان.

**أنجمن (فارسی):**

ئەنجومەن، کۆمەڵە، لێژنە. لە سەردەمی عوسمانی بە ئەنجومەنی شورای بـالاَی ویلایەتە عوسمانییەکان وتراوە. هەروەها لەئێرانی سـەردەمی قاجـاریش (١٧٩٥–١٩٢٥ز) ژمارەیەك ئەنجومەن لەشارە گرنگەکان پێکهاتن کاتێ شۆڕشی مەشرووتە (دەستوورخوازی) لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەرپا بوو.

**انشقاق (عەرەبی):**

لێکترازان، جیابوونەوە. بەزۆری بۆ جیابوونەوەی باڵە سیاسییەکانی حیـزب و ڕێکخراوەکان بەکاردێ.

**اندرون (فارسی):**

ناوەوە یان ناوەخۆ، بەشی ناوەخۆی کۆشکی سوڵتانی عوسمانی بوو.

**اندرون مکتبی شاگردی (فارسی – عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو بۆ ژمارەیـەك لـە قوتابخانـە ناوەخۆییـەکانی سـەر بـە کۆشـکی عوسمانی بەکاردەهات.

**انساب العرب (عەرەبی):**

تۆرەمـە یـان ڕەچـەڵەکی عـارەب، لـە سـەردەمانی پێـشوو ڕەچـەڵەك لای عەرەبەکان زۆر گرنگ بوو ، بۆیە کەسانێك هـەبوون شـارەزابوون لـەم بـوارەدا کـە پێیـان دەگـوترا (نـسابە) و چـەندین کتێبـیش لـەم بارەیـەوە دانـدراوە کـە پێیـان دەگوترێ (کتب الانساب).

**انهیار (عەرەبی):**

داڕمان، داتەپین، زاراوەیەکە زۆرجار بۆ لەناوچوونی دەوڵەتێك بەکاردەهێنرێ.

**انكشاري (توركی):**

ئینکشاری، لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی لێکدراوی عوسمانییە لەهەردوو وشەی (یەنی) واتە نوێ و (چەری) واتە هێز یان لەشکر پێکهاتووە، بۆیە دەکاتە هێزی نوێ یان لەشکری نوێ. ئەمە لەشکرێکی پیادەی نیزامی عوسمانی بوو کە لە ناوەڕاستی سەدەی چواردەی زایینی پێکهات، لەو کریستیانانەی کە بەمندالّی دەهێنران و بۆ ئەم مەبەستە پەروەردە دەکران.

**الاهراء السلطانية (عەرەبی)**

زاراوەیەکە لە سەردەمی مەمالیك بۆ عەمباری تایبەت بە سولّتان بەکارهاتووە و تەنیا لەکاتی برسیەتی و قات و قڕی دەکرایەوە.

**اهل الحل والعقد (عەرەبی)**

گەلی دەمڕاست و قسەبەدەستان.

**اهل الخبرة (عەرەبی) :**

کەسێکی شارەزا بوو لە یەکێك لە پیشەکان ، ئەرکی چاودێری کردنی جۆری کالأکان و دیاریکردنی نرخەکانی پێ دەسپێردرا لە دەولّەتی عوسمانیدا.

**اوتلاق رسمي (توركی – عەرەبی):**

جۆرێك لە باج بوو لە سەردەمی عوسمانی لە ڕەوەندە کۆچەرەکان وەردەگیرا.

**اوتوراق (توركی):**

خانەنشینی پەککەوتوو، لە سەردەمی عوسمانی بەو سەربازە دەوترا کە بەتەمەن بوو یان کەم ئەندام دەبوو بەجۆرێك کە نەیدەتوانی کاری خۆی ئەنجام بدات، لەم کاتەشدا خزمەتی نەدەکرد و مووچەیەکی پێدەدرا.

**أوجاق (توركی):**

لە دەولّەتی عوسمانی بە یەکەیەکی سەربازی گەورە دەگوترا (ئۆجاق)، وەکو ئۆجاقی ئینکشاری و ئۆجاقی تفەنگچی.

**اوده باشي (توركی):**

سەرۆکی ئەو کەسانە بوو کە لە ژووره سەرەکییەکانی سولّتانەکانی عوسمانی کاریان دەکرد و جلوبەرگی لەبەر سولّتان دەکرد و یەکێك لە چوار مۆرەکەی سولّتانی لەلا بوو.

**أورطة (تورکی):**

یەکەیەکی سەربازی بچووکتر بوو لە (ئۆجاق) لەنێو لەشکری ئینکشاریدا، یەك ئۆجاق دەیکردە (١٦٥) ئۆرتە. هەر ئۆرتەیەکیش لە (١٠) سەرباز پێکدەهات.

**اورطه آغاسي (تورکی):**

سەرۆکی یەکەیەك بوو لە سەربازان کە ئەرکی پاراستنی کۆشکی سوڵتان بوو.

**أورطه باشي (تورکی):**

سەرکردەی (ئۆرتە)یەك بوو لە لەشکری ئینکشاریدا.

**أورطه چاویش (تورکی):**

یەکێك لە ئەفسەرە گرنگەکانی لەشکری ئینکشاری عوسمانی بوو کاری بریتی بوو لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و پێشکەشکردنی ڕاپۆرت بۆ ئەوەی بە مۆری ئاغای ئینکشاری مۆر بکرێ، هەروەها سەرپەرشتی ڕێوڕەسمی پاسەوانیەتی ئاغای ئینکشاری دەکرد.

**أوزباشي (تورکی):**

پلەیەکی سەربازی عوسمانی بوو کە سەرکردایەتی سەد سەربازی دەکرد.

**اوزبك (تورکی):**

ناوی گەلێکە لە گەلانی ئاسیای ناوەڕاست، تەتەرن لەڕووی ڕەگەزەوە دەوڵەتی ئۆزبەکەستان بەناوی ئەوانەوە کراوە، لەوانەیە بە شێوەی (یزبك)یش بگوترێ.

**أوزون (تورکی):**

درێژ، نازناوی میر (حەسەن)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئاق قۆینلۆی تورکمانیە، لەبەر درێژی پێی دەگوترا (ئۆزۆن حەسەن).

**أوغلی (تورکی):**

کوڕ، زۆربەی کات دەکرێتە پاشگر بۆ ناو، وەکو احمد أوغلی — واتە کوڕی ئەحمەد.

**أوقیه (یۆنانی):**

یەکەیەکی کێشە بەرامبەر بە چل درهەم و لە وڵاتی شام بەرامبەر بە دوو سەد گرام بوو.

**اولاد الناس (عەرەبی):**

زاراوەیەکە لە سەردەمی مەمالیك بە تیپێك لە سەربازان دەوترا کە تەنیا لە کوڕانی میرەکانی مەمالیك پێك هاتبوو.

**اولاق (تورکی):**

نامە بەر، لە زاراوەکانی سەردەمی عوسمانییە.

**أون باشی (تورکی):**

پلەیەکی سەربازی عوسمانی بوو، واتە سەرۆکی دە سەرباز.

**إیالە (عەرەبی):**

گەورەترین یەکەی کارگێڕی بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، کە لەنێوان سالآنی ١٥٩١ – ١٨٦٤ز. بەکار دەهات، دواتر لەجیاتی ئەو زاراوەی (ویلایەت) بەکارهێنرا، هەر ئیالەتێك چەند سەنجەقێکی لەخۆ دەگرت.

**ایبك (تورکی):**

یەکەم سوڵتانی مەمالیکە لە میسر لەدوای (شجرة الدر) کە ژنی سوڵتان صالح ایوب بوو، لە ساڵی ١٢٥٠ تاکو ١٢٥٧ز فەرمانڕەوایی کردووە.

**ایچ اوغلان (تورکی) :**

ئەو منداڵانە بوون کە لە دەوڵەتی عوسمانی بەپێی ڕژێمی دیڤشرمە کۆکرابوونەوە، بەڵام جیاکرابوونەوە بۆ قوتابخانەی دەربار. بۆ ئەوەی دواتر لە دەزگاکانی حکومەت کار بکەن.

**إیرادی جدید (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی بەکارهات بۆ داهاتە داراییە نوێیەکان، کە بۆمەبەستی چاکسازی کردن کۆدەکرانەوە لەو دەرەبەگانەی کە ئەرکە سەربازییەکانی خۆیان بەرامبەر دەوڵەت جێبەجێ نەدەکرد.

**إیلچی (تورکی):**

وەزیر یان سەفیر یان نێردراوی ئاشتی.

**ایل یازجیس (مەغۆلی – تورکی) :**

لە سەردەمی عوسمانی ئەو نووسەرەی ویلایەت بوو کە (دەفتەری مفصل)ی ئامادە دەکرد، کە هەموو سەرچاوەکانی داهاتی ناوچەکەی تێدا دیاری دەکرا.

**ایلخان (مەغۆلی):**

نازناوی فەرمانڕەوایانی تورك و تەتەر و مەغۆل بوو.

**إیماق (تورکی – مەغۆلی):**

کۆمەڵە هۆزێکن کە یەکێتییەکی سیاسییان لە نێواندا هەبێت.

**اینال (تورکی – مەغۆلی):**

یارمەتیدەر، هاوکار، هەروەها ناوێك بوو کە زۆر لە سولڵتان و میرەکانی مەمالیك پێی دەناسران.

**إیوان (فارسی):**

بریتییە لە هۆڵێکی گەورەی چوارگۆشەیی بۆ پێشوازیکردن، لە سێ لاوە دیواری هەیە، هەرچی لای چوارەمە ئەوە کراوەیە. لە کوردیش هەر (هەیوان) ی پێدەگوترێت.

**پیتی - ب -**

**بابا :**

باوك، هەندێ جار بەگەورەی پیاوانی تەریقەتەکان دەگوترا، وەك سەرۆکی تەکیەی بەکتاشی.

**باب السر (عەرەبی):**

دەرگایەکی تایبەتکراو بوو بە گەورە میرەکان لە دەرگاکانی قەلای الجبل لە قاهیرە (شوێنی نیشتەجێبوونی سولڵتانەکانی مەمالیك بوو).

**باب سرلطیف (عەرەبی):**

دەرگایەکی نهێنی بوو کە سولڵتانەکانی مەملوکی و گەورە میرەکان لەکاتی قەرەباڵغی ئاهەنگەکاندا لێی دەچوونە ژوورەوە.

**باب السعادة آغاسی (عەرەبی – تورکی):**

گەورە خزمەتکارانی ڕەنگ سپی لە کۆشکی سولڵتاندا.

**الباب العالي (عەرەبی):**

دەروازەی باڵا بینایەکی گەورەبوو تەنیا شەقامێك لە سەرای سولڵتانی جیای دەکردەوە، لە سەردەمی سولڵتانی عوسمانی محەمەدی چوارەم (١٦٤٨ – ١٦٨٧ز) دامەزراوە بەشێکی تەرخان کراوبوو بۆ صەدری ئەعزەم و خێزانەکەی، و

بەشەكانی تری تایبەت كرابوو بە كۆبوونەوەی گـەورە فەرمانبـەرانی دەوڵـەتی كـە كاروبـاری وڵاتیـان بـەڕێوە دەبـرد، بـەڵام بـەزۆری ئـەم نـاوە وەكـو گوزارشـت بـۆ كۆشكی سەدری ئەعزەم یان مەڵبەندی حكومەتی عوسمانی بەكاردەهات.

**باب المرز و الخمر (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك بەكارهات بۆ گوزارشتكردن لە داهاتێـك لـە داهاتەكانی دەوڵەت كە لە دروستكردنی مەی بەدەست دەهات.

**باد زهر (فارسی):**

بەردێكی ئیسفەنجی سووكە بۆ بەرگریكردن لە ژەهر بەكار دەهات.

**پادشاه (فارسی):**

گەورە و خاوەن. وەكو نازناوێك بۆ سوڵتانەكانی عوسمانی بەكارهاتووە، پێیـان دەگوت (پادیشاه ئال عوسمان) لە كوردیش (پادشاه) لەجیاتی ( شا) بەكاردێت .

**بارجە (؟):**

جۆرێك لە كەشتی چارۆگەداری عوسمانی بوو كە سەردەمەكانی پێـشتریش بـۆ گواستنەوە بەكار دەهات.

**بارگاە (فارسی):**

بارەگا، خیوەتی شا، بەو دیوانە دەوترا كە مۆڵەتی چوونە لای شای دەدا.

**بارود (؟):**

پێكهاتەیەكە لە خوێ، لە تەقەمەنی و چەكی ئاگردار بەكاردەهات، چـینییەكان یەكەم جار بەكاریان هێناوە، بەكارهێنانی لـە سـەردەمی مـەملوكی و سـەردەمانی دواتر باو بوو.

**بازرگان (فارسی):**

هەر (بازرگان)ی كوردییە، بەشێوەیەكی تایبەت بەو بازرگانـە گەورانـە دەگـوترا كە بەهۆی كاروانەكان لەگەڵ شوێنە دوورەكان بازرگانییان دەكرد.

**باش (توركی):**

سەرۆك، سەردار، سەركردە. دەكرێتە پاشگر بـۆ نـاو بـە مانـای سـەرۆكایەتی و سەركردایەتیی دێت وەكو:

أون باشی = (سەرۆكی دە)

أوز باشی = (سەرۆكی سەد)
بین باشی = (سەرۆكی هەزار)
**باش اسكی (توركی):**
لە سەردەمی عوسمانی بۆ سەرۆك سەربازەكان لە سوپادا بەكاردەهات و دەبوو لە هەموویان بە تەمەنتر بووایە.
**باش إمام (توركی – عەرەبی):**
زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ پێشنوێژی تیپێك لە سەربازان بەكاردەهات.
**باش چاویش (توركی):**
زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ یەكێك لە ئەفسەرانی یەكەی ئینكیشاری بەكاردەهات.
**باش چوخەدار (توركی – فارسی):**
گەورە خزمەتكارانی تایبەتی لە سەرای سوڵتانی عوسمانیدا.
**باش قادین (توركی):**
ژنی یەكەم بوو لەنێو ئافرەتەكانی سوڵتانی عوسمانی كە سوڵتان كوڕی لێی بووە.
**باش قلاقوز (توركی):**
لە سەردەمی عوسمانی بۆ ئەفسەرێك بەكاردەهات كە بە بەردەوامی لەبەردەم باب العالی دەوەستا لە ئەركەكانی وەستان بوو لە شوێنی تایبەتی لە شار بۆ ڕێگە گرتن لە پێشێڵ كردنی داب و نەریتەكان، و ڕێبەدیكردنی خەڵك .
**باش قومندان (توركی – فارسی):**
بە سەركردەی یەكەكانی پیادە دەوترا لە سوپای عوسمانی، دوای سەردەمی تەنزیمات كە لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩ – ١٨٠٧ز) ئەنجام درا.
**باش كاتب (توركی – عەرەبی):**
لە سەردەمی عوسمانی بۆ سەرۆكی نووسەران لە دیوانی دەوڵەت بەكاردەهات.
**باش مهندس (توركی – عەرەبی):**

سەرۆکی ئەندازیاران. بە گەورە ئەندازیارانی دەوڵەتی عوسمانی دەوترا.

**باش وکیل (تورکی – عەرەبی):**

سەرۆکی نوێنەران لە دەوڵەتی عوسمانی.

**پاشا (فارسی):**

زاراوەیەك بوو عوسمانییەکان بۆ وەزیر و گەورەپیاوانی ئیدارە لە دەوڵەتەکەیان بەکاریان دەهێنا، ئەوانەی دوو تەوغ و زیاتریان هەبوو بەم نازناوە بانگ دەکران.

**پاشماق شریف (تورکی – عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ نەعلێك بەکاردەهات کە گوایە هی پێغەمبەرە (د. خ) .

**پاطرونة (ئیتالی):**

زاراوەیەك بوو بۆ کەشتی سەرکردایەتی دووەم ، لە دەریاوانی عوسمانی بەکاردەهات.

**باغجیان روم (فارسی – تورکی):**

پێکهاتەیەکی سەربازی بوو کە باغچەوانە تورکمانەکانی لە ئەنازۆل بەخۆوە دەگرت، ئەم پێکهاتەیەش پێش دامەزراندنی سوپای ئینکشاری بەشێك لە سوپای عوسمانی پێك دەهێنا.

**بالیش (مەغۆلی):**

دراوێکی مەغۆلییە، لە سەردەمی جەنگیزخان بەکاردەهات.

**بالطةجی (تورکی):**

بەلتەچی ، تەوربەدەست، تیپێك بوو لە پاسەوانانی کۆشکی سوڵتان لە دەوڵەتی عوسمانی ژمارەیان چوارسەد کەس بوو، ئەرکیان بریتی بوو لە پاراستنی ئافرەتەکانی کۆشکی سوڵتان.

**البارونە (ئەوروپی):**

خانمە بارۆن. هەروەها بارون پلەیەکی کۆمەڵایەتی بوو لە ئەوروپا .

**بای (تورکی):**

دەوڵەمەند، بە فەرمانڕەوایانی تونس لە سەردەمی عوسمانی دەگوترا.

**پایرە (مەغۆلی):**

فەرمانی سوڵتانی، تەختەیەکە لە زێڕ لەسەر یەکێك لە ڕووەکانی وێنـەی سـەری شێر کێشراوە بە گەورە پیاوانی دەوڵەت دەبەخشرا.

**بتکجی (مەغۆلی):**

نووسەر، مەغۆلەکان بۆ بەخێوکەر (مامۆستا) بەکاریان دەهێنا.

**بَدرالدینلو (عەرەبی – تورکی):**

بەکەسێك دەگوترا کە لە شوێنکەوتووانی (بدرالدین السماوي/ ١٤١٦ز. مـردووە) بوو کە لە سەردەمی عوسمانی ڕێبەرایـەتی بزووتنەوەیـەکی ئـاینی دژ بەدەوڵـەتی کرد.

**بدروم (یۆنانی):**

ژێر زەمین کە وەکو کۆگا یان بەندیخانە یان شوێنی نیشتەجێبوون بەکاردێت.

**البدل العسکري (عەرەبی):**

باجێك بوو لە سەردەمی عوسمانی بەسەر مەسیحییەکان سـەپێندرا و بەرامبـەر بەوەی بەشدارییان لە خزمەتی سەربازیدا نەدەکرد بڕێك پارەیان دەدا . لـە سـاڵی ١٩٠٨ دوای گەڕانەوەی دەستووری عوسمانی کارکردن پێی ڕاگیرا.

**البدل المجرد (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك بەکاردەهات بۆ چەند جۆرێك لـە ئەسـپ و جلوبەرگ و تفاق کە دەگۆڕدرا بەوەی خراپ ببوو.

**البدنة (عەرەبی):**

ئەو بەشەی شوورەیە کە تاوەری تیادا نییە بەڵکو دەکەوێتە نێوان دوو تاوەر.

**البراءة السلطانیة (عەرەبی):**

بەخشینێك لەلایەن سوڵتانەوە بۆ کەسێك لە بابەتێك لە بابەتەکان لە سـەردەمی مەمالیك و عوسمانی بەشێوەی بڕوانامەیەك بوو.

**البروانه (فارسی):**

پەردەدار، کەسێکە سەردانی خەڵك بۆ لای پادشا یان دەسەڵاتدار ڕێکدەخات.

**البراج (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عەباسییەوە بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهات کە لە تاوەرەکانی کۆتری نامەبەر کاریان دەکرد هەروەها بەو کەسەش دەوترا کە لە بواری ئەستێرە ناسیدا کاری دەکرد.

**البرانی (عەرەبی):**

باجێك بوو کە باجگرەکان بەسەر خەڵکی گوندەکانی میسریان لە سەردەمی عوسمانی سەپاندبوو، لە وڵاتی شام بە مانای بەخشیش دەهات.

**البربر:**

نەتەوەیەکن لە ناوچەکانی باکوری ئەفریقیادا هەن، ناوی ڕەسەنی خۆیان (ئەمازیغ)ـە، بەڵام ڕۆمانەکان دواتریش عەرەبە موسڵمانەکان ئەم ناوەیان لێناون کە دەکاتە مرۆڤی کێوی و دوور لە شارستانی.

**بَربَر (تورکی):**

بە تورکی و ئینگلیزی بە مانای سەرتاش دێت. بنەماڵەیەکی لوبنانی بەم ناوە هەیە.

**تربط (فارسی):**

جۆرە ئامرازێکی مۆسیقایە لە عوود دەچێت.

**برجاس (فارسی):**

نیشانەی نیشانە شکێنیّ، لە ئاڵایەکی بچووك دەچێت کە لە بەرد دەچەقێندرێت.

**بَرجم، پرچم (فارسی):**

پەرچەم ئاڵا، بەیداخ.

**بَرکستوان (تورکی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەملوکی بەو کورتانە نەخشێنراوانە دەگوترا کە دەخرایە سەر پشتی ئەسپەکانی سوڵتانی و فیلەکان.

**بُرنجك (تورکی):**

جۆرە چنراوێکی تەنك و نەرم بوو لە سەردەمی عوسمانی بەکاردەهات.

**برنجي أورطة آشجي أوسطةسي (توركی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ ئەوکەسە بەکاردەهات کە ئەرکەکەی بریتی بوو لە دابینکردنی خواردن بۆ ئۆرتەی یەکەم.

**بُرنس (؟):**

جلوبەرگێك بوو ئینکشارییەکان لە ڕۆژە باراناوییەکان لە بەریان دەکرد. ئەم پۆشاکەش لەکاتی شەڕدا سولّتان بە دیاری بۆ ئەفسەرەکانی دەنارد.

**بَرید (فارسی):**

سیستەمی گواستنەوەی نامە شاهانییەکان یان فەرمییەکان .

**البَزة (عەرەبی):**

بەو جلوبەرگانە دەوترا کە لە پەمۆو کەتان دەچنران و ئەو کەسەی دەیفرۆشت پێی دەوترا بەزاز.

**بزر (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بە هێلکەی کرمی ئاوریشم دەوترا لە لوبنان.

**پُشت (فارسی):**

پشت ، عەبایەك بوو ئەستوور لە جلوبەرگی کۆچەران بوو لە سەردەمی دەوڵەتی مەمالیك.

**پُشتمیخ (فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەملوکی بەو دروشم یان سیمبوڵە دەوترا کە هەر میرێك پێی جیا دەکرایەوە.

**بشخانە (فارسی):**

زاراوەیەکی مەملوکی بوو بۆ جوانکاری چواردەوری ژوور یان چواردەوری پێخەف بەکاردەهات.

**بشلك (تورکی):**

دراوێکی عوسمانی بوو لە سەردەمی سولّتان سلێمانی دووەم (١٦٨٧ – ١٦٩١) لێدرابوو.

**بشمقدار (توركی – فارسی):**

زاراوەیەكی مەملوكی بوو بە هەڵگری نەعلەكانی سوڵتان دەوترا.

**پُشوتی (فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەملوكی بە "پُشت" فرۆش دەوترا. بگەڕێوە بۆ پشت.

**البطاقة (یۆنانی):**

لەسەردەمی مەملوكی بەو كارتە بچووكانە دەوترا كە لەسەر باڵی كۆتری نامەبەر دەناردرا.

**البَطال (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەملوكی بەو سەربازە یان میرە دەوترا كە لەكاروباری دەوڵەت دوور دەكەوتەوە بەهۆی تووڕەبوونی سوڵتان لێی یان بەهۆی گەورەیی تەمەنی یان بەئارەزووی خۆی.

**بطریق، بطریك ، بطریارك (یونانی):**

پاتریارك، پایەیەكی ئاینی مەسیحییە.

**بطسة (ئیسپانی):**

جۆرە كەشتییەكی گەورە بوو لە سەردەمی مەمالیك بۆ شەڕ و بازرگانی بەكاردەهات.

**بُقچە (توركی):**

بوخچە، پارچە قوماشێكە شتی تیادا هەڵدەگیرێ . هەروەها بە جۆرێك لە شیرنەمەنی دەوترێ و بە دروستكەرەكەش دەوترێ بقجەجی و بغجاتی.

**بَقسطاط (فارسی – توركی):**

لە سەردەمی مەمالیك باو بوو بۆ جۆرە نانێكی وشك كە ئەوەی سەفەری كردبایە لەگەڵ خۆیدا دەیبرد.

**بقیار (؟):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك بۆ جۆرێك لە مێزەری گەورە بەكاردەهات كە تایبەت بوو بە وەزیر و قەڵەم بە دەستان ، هەروەها بەجۆرێك لە فەرشی ڕەش دەوترا كە لە مووی وشتر دروست دەكرا.

**بگ، بیك (تورکی):**

بـەگ، سـەرۆك، مـیر، فـەرمانڕەوای میرنـشینێکی سـەربەخۆ، هـەروەها بـە دەسـەڵاتدارو بەڕێوەبـەری ناوچـەیەکیش دەگـوترا بەتایبـەتی (سـەنجەق) لـە سەردەمی عوسمانی.

**البکتاشیة (تورکی):**

تەریقـەتێکی سـۆفیگەری بـوو کـە (حـاجی بەکتاشـی وەلـی/ نیـوەی دووەمـی سـەدەی سـێزدە) دایمەزرانـد، ڕۆڵێکـی گرنگـی لـە مێـژووی دەوڵـەتی عوسمانیـدا هەبوو، هاوبەندییەکی بەهێزی لەگەڵ هێزی ئینکشاریدا هەبوو.

**بگتاش (تورکی):**

هاوکوف، هاوتـا، بـەردی ڕەق، هەرچـی بەگتاشـی بـوو ئـەوە کەسـێکی سـەربە تەریقەتی بەگتاشی بوو.

**بِکتَمَر (تورکی):**

میری ئاسنین، نازناوێك بوو زۆر لە میرەکانی مەمالیك هەڵگری بوون.

**بَکجي (تورکی):**

پاسەوان، بە پاسەوانی بەگ لە سەردەمی عوسمانی دەوترا.

**بگلربگ (تورکی):**

بـەگی بـەگان، پایەیـەك بـوو لـە سـەردەمی عوسمـانی دەدرا بـە فـەرمانڕەوای ولایەتەکان، ئەم پایەیە مافی ئـەوەی دەدایـە خاوەنەکـەی کـە نازنـاوی (پاشـا)ی هەبێت.

**بلاسە (فارسی):**

قوماشی ئەستوور، بەو فەرشانە دەوترێ کە لە موو دروست دەکرا.

**بلص (عەرەبی):**

پـارە بـە ناهـەق وەرگـرتن، ئـەو پارەیـە کـە لـە دەرەوەی بـاج وەردەگیرێـت بەخورتی.

**بَلَصقایة (تورکي):**

زاراوەیەك بوو لـە سـەردەمی عوسمـانی بـاو بـوو بـۆ دەفرێکـی بـچووکی بـارود بەکاردەهات.

**بَلَكجي (توركي):**

ماسی گر، بەپیاوانی سەر کەشتی لە دەریاوانی عوسمانی دەوترا.

**بُلوك (توركى):**

دەستە، تیپ، بە کۆمەڵە سەربازێك دەوترا کە یەکەیەکی بچووکیان پێك دەهێنا، هەر دوازدە بلۆك تیپێکیان پێك دەهێنا کە لە دەوڵەتی عوسمانی پێی دەوترا (ئۆرتە).

**بُلوك أمينى (توركى – عەرەبى):**

بە بەرپرسی ژمێریاری یەکێك لە بلۆکەکانی سوپای دەوڵەتی عوسمانی دەوترا.

**بُلوك باشى (توركى):**

سەرکردەی بلوك.

**بَند (فارسي):**

بەند، بەپەڕەگراف یان خاڵێك لە پەیمانەکان دەوترێ.

**بُندق (فارسى):**

جۆرە بەروبوومێکە دەخورێ. وە قوڕی سوورکراوەی خڕە کە بە بەردەقانی دەهاوێژرێ، هەروەها بە گوللەی خڕ دەوترا کە بە تفەنگ دەهاوێژرا.

**بُندقجى (فارسى – توركى):**

تفەنگچی

**بُندقدار (فارسى):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك باو بوو، بەو کەسە دەوترا کە کیسەی بوندقی لەدوای سوڵتان یان میر هەڵدەگرت.

**البُندقي:**

دینارێکی زێڕ بوو بەناوی شاری بوندقیەی ئیتاڵی کرابوو، لە سەردەمی دەوڵەتی مەملوکی بەکاردەهات.

**بَندة (فارسي):**

بەندە، نۆکەر، خزمەتکار، بەمانای دیلیش دێت.

**بَنديرة (ئيتالي):**

ئاڵا، بەیداخ

**بنیش (تورکی):**

جلی تایبەت بە سوارەکانی سوپای عوسمانی بوو، مێزەرێکی تایبەت بوو زاناکان لە هەندێك کات دا لەسەریان دەکرد.

**بَهادُر (تورکی – مەغۆلی):**

ئازا، بەجەرگ. دەکرا بە پاشگر بۆ ناوی شا و سوڵتانەکان وەکو ئاماژە بۆ هێز و ئازایەتییان.

**پهلوان (فارسی):**

ئازا، پاڵەوان، بەو کەسە دەوترا کە وەرزشێکی قورسی بێ هاوتای دەکرد.

**بوابان هُمایون (عەرەبی – فارسی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە پاسەوانانی دەرگای دەرەوەی سەرای سوڵتان دەوترا.

**بواردیە:**

تفەنگ هەڵگران، لە سەردەمی عوسمانی تیپێك بوون لە پاسەوانانی شەریفی مەککە، کە لە کۆیلە و ئازادان پێك هاتبوون.

**البوامتی (عەرەبی):**

بە هەر کەسێك دەوترا کە ساڵانە لە باجدان دوا دەکەوت.

**بوجك باشی (تورکی):**

بە سەرکردەی کۆمەڵێك فەرمانبەر دەوترا کە ئەرکیان بریتی بوو لە ، جێبەجێ کردنی فەرمانەکان بەسەر تاوانباراندا و ناردنیان بۆ بەندیخانە.

**بورجی (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە زوڕنا دروستکەر و فرۆشیاری دەوترا.

**بورزن (تورکی – فارسی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە زوڕنا ژەنیان دەوت.

**بورَك (تورکی):**

جۆرە کڵاوێك بوو ئینکشارییەکان لەکاتی ئاشتیدا لەسەریان دەنا هەرچی لەکاتی شەڕدا بوو کڵاوێکی درێژی هێڵداریان لەسەر دەنا.

**بوزە (توركی):**

خواردنەوەیەكی سەرخۆشكەرە لە جۆ یان لە برنج دروست دەكرێت، هەندێك خەڵك بەتایبەتی لەمیسر لە سەردەمی مەمالیك دەیانخواردەوە.

**بوستانجی (فارسی – توركی):**

یەكێك لە ئەندامانی تیپێكی نیزامییە مێژووی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان مستەفای دووەم (١٦٩٥ – ١٧٠٣ز).

**بوستانجی باشی (فارسی – توركی):**

سەرۆكی بوستانچیان، سەرۆكی تیپی بوستانچیان لە كۆشكی سوڵتانی عوسمانی، لە ئەركەكانی تری ئەفسەری بوستانچی، پشكنینی كەنارەكانی بسفۆڕ و مەڕمەڕە و بەڕێوەبردنی كەشتی سوڵتان لە كاتی سەیران بوو. هەروەها بە پشكنەری گشتی باغەكانی دەوروبەری ئەستانبۆل دەگوترا.

**بوسطة (ئیتالي):**

بۆستە، مەكتەبی پۆستە، بەو ئۆتۆمبێلە گەورەیە دەوترا كە پۆستەی بۆ شار و گوندەكان دەگواستەوە. ئەو كەسەی پۆستەی دەگواستەوە پێی دەوترا پۆستەچی.

**بوشناق (توركی):**

عوسمانییەكان بە بۆسنە و هرسكیان دەوت، هەندێك بنەماڵە لە وڵاتی شام هەن ئەو ناوەیان هەڵگرتووە.

**پولیتیكاجی (ئیتالی – توركی):**

لە سەردەمی عوسمانی بۆ كەسی سیاسەتمەدار بەكاردەهات.

**بیان نامە (عەرەبی – فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ بەیانی گومرگی بەكاردەهات. ئێستاش لە كوردیدا بۆ ڕاگەیاندننامە بەكاردێت.

**بیبرس (فارسی – توركی):**

پڵنگ، نازناوێك بوو هەندێك سوڵتان و میری مەمالیك هەڵیانگرتبوو لە سەروویانەوە (بیبرس البندقداری) (١٢٦٠ – ١٢٧٧ز).

**بَیدق (فارسي):**

بەسەربازی شەترەنج دەوترێ.

**البیدره (عەرەبی):**

زانستێکە کە لە بارودۆخی باڵندەکان دەکۆڵێتەوە.

**بیرام آلاي (تورکی):**

بەو کەژاوە دەگوترا کە سوڵتانی عوسمانی پێی دەچووە مزگەوت بۆ نوێژی جەژن. و هەندێك بنەماڵە هەن ئەو ناوەیان هەلگرتووە.

**بیرقدار (تورکی – فارسی):**

ئاڵا بەدەست لەکاتی شەڕ و کەژاوەی سوڵتانی لە سەردەمی هەردوو دەوڵەتی مەملوکی و عوسمانی باو بوو. بووە بە نازناوی هەندێك بنەماڵە.

**البَیرَمیة (تورکی – عەرەبی):**

تەریقەتێکی سۆفیگەری بوو کە (حاجی بێرەم/ ١٤٣٠ز مردووە) دایمەزراندووە.

**بَیرون (فارسی):**

بەشی دەرەکی بوو لە کۆشکی سوڵتانی عوسمانی.

**پیش گیرەج (فارسی – تورکی):**

بەیەکێك لە خزمەتکارانی سوڵتانی عوسمانی دەگوترا کە ئەرکی بریتی بوو لە پشتەماڵ هەلگرتن بۆ سوڵتان.

**البیضة (عەرەبی):**

کڵاوێکی ئاسنین بوو سەرباز لەسەری دەنا بۆ پاراستنی لە شمشێر لێدان، بۆیە ئەم ناوەشی لێندراوە چونکە بە هێلکە دەچێت.

**بَیعَت (عەرەبی):**

نواندنی پاڵپشتی و دڵسۆزی بوو بۆ خەلیفە یان سوڵتانی نوێ لەلایەن گرووپێك کە نوێنەرایەتی کۆمەلگا دەکەن.

**بیگباشی (تورکی):**

سەرکردەی هەزار، زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی باو بوو بۆ سەرکردەی هەزار سەرباز بەکاردەهات.

**بیگم (مەغۆلی):**

بە ئافرەتی بنەماڵەی میر و فەرمانڕەواکان دەگوترا.

**پیلُك (تورکی):**

مەچەك، بە موڵکەکانی خۆجێیی حکومی لە دەوڵەتی عوسمانی دەگوترا.

**بیمارستان (فارسی):**

نەخۆشخانە.

**بیورلدی (تورکی):**

بەبڕیارو فەرمانی سوڵتانی عوسمانی یا هی دەسەلاٌتدارانی بالاٌی دەوڵەت دەگوترا.

**بیورلدیا (تورکی):**

لە میسر بە بڕوانامەی دامەزراندن لە وەزیفەکان تاکو پلەی دووەم دەوترا هەروەها بە بڕوانامەی ئەزهەریش دەوترا.

**بیوك (تورکی)**

گەورە، مەزن، دەکرا بە پاشگر بۆ ناوی ناوداران بۆ پێشاندانی مەزنی هەلگرەکەی.

# تیۆری پاساودان (checking theory) لەزمانی کوردیدا

د.سەباح ڕەشید قادر
بەشی کوردی _کۆلیژی پەروەردەی مرۆڤایەتی
زانکۆی سەلاحەددین

## پێشەکی

ئەم تیۆرە (پاساودان) لقە تیۆرێکە لە چوارچێوەی پرۆگرامی بچووککراوەدا، بنەماکانی خۆی جێبەجێ دەکات، لە بنچینەدا هەوڵێکی تری چۆمسکییە بۆ کەمکردنەوەی سنووری جیاوازی نێوان زمانەکانی جیهان، بە مانایەکی تر گونجاندنی زمانەکان لەگەڵ بنەماکانی ڕێزمانی سەراپا (ڕ.س) واتە (universal grammar) (U.G) ئەمەیش لە ڕێگەی کەمکردنەوەی ژمارەی پەرەمیتەرەکان و زیادکردنی ژمارەی پرەنسیپەکان، بەمەش زۆربەی تایبەتمەندی زمانەکان لە کار دەخات و ڕووەو گشتگیری کردنی بنەما ڕێزمانییەکان دەچێت، یەکێك لە بنەما هەرە چالاك و کاراکانی ئەم تیۆرە بنەمای بەئابووری کردنە (وزە پاراستن )، کە دەچێتە ناوەڕۆکی زۆربەی ئاست و بنەما درشتەکانی تر . ئەم بۆچوونە (تیۆرە) لە بنچینەدا دوای بۆچوونی ڕێزمانی دەسەڵات و بەستنەوە (GB) ی چۆمسکی کەوتە گەڕ، دەتوانین وەکو قۆناغی مێژوویش بەدوای ساڵ ١٩٨٦ دەسپێکی بۆ دابڕێژین، هەرچەندە ساڵانی نەوەدەکان گەشەی زیاتری بەخۆوە بینی، بەڵام

لەڕووی مێـژووەوە دەبـێ دوو شـت لـە بـەر چـاو بگـرین، یـەك: ئـەم تیـۆرە لـە گەشـــەکردن و گـــۆڕانی بۆچـــوونەکاندا بەســـەر چـــەند قۆنـــاغێکی وەکـــو ١٩٩١، ١٩٩٢،١٩٩٥،١٩٩٦،٢٠٠٤ و ٢٠٠٥ دابەش دەبن، دوو: هەندێ لە زاراوەکان لەوانەیە ناوەڕۆکی خۆی پاراسـتبێ، بـەڵام وەکـو زاراوە، زاراوەی نـوێی بـۆ داڕێـژراوە، بـۆ نموونە زاراوەی زمانە بکەر خراوەکانpro-drop Language گۆڕاوە بۆ زمانە بکـەر بەتاڵـەکان، دەبـێ ئـەوەش بـوترێ کـە چۆمـسکی لـە نزیککردنـەوەی زمانەکانـدا ڕووبەڕووی گەلێك گرفت هاتەوە لە گەیاندنی زمانەکاندا بەڕێزمانی سەراپا، بەهۆی هەندێ جیاوازی ڕێزمانی بنەڕەتی و بنچینەیی، کە لە زمانەکاندا بەڕەگ چەسپاوی ماونەتـەوە، بـۆ نموونـە هەنـدێ زمـانی وەکـو فەڕەنـسی بـوار دەدات کـە کـرداری سەرەکی بۆ گرێی سـەرەی ڕێزمـانی IP بـەرز بکاتـەوە، کەچـی زمـانی لـە جـۆری زمـانی ئینگلیـزی بـواری بەرزکردنـەوەی (V) نـادات بـۆ دەرەوەی (VP) بەمـەش لـــەڕێزمانی (GB) و ســـەرەتای MP یـــدا زمانـــەکان بەســـەر گرووپـــی زمانـــە فەرەنسییەکان و گرووپی زمانە ئینگلیزییەکان دابەش دەکرا، لەم لێکۆڵینەوەیـەدا ئێمـە هـەوڵ دەدەیـن هەنـدێ لایـەنی پرۆگرامـی بـچووککراوە لـە بۆتـەی تیـۆری پاساودان بخەینە ڕوو، چونکە بەبێ ئـەو بەسـتنەوەیە شـیکردنەوەکە سـەرکەوتوو نابێ .

ناوەڕۆکی ئەم لێکۆڵینەوەیە دوای ئەم پێشەکییە بۆ دوو بەش دابەش دەکرێ لەبەشـی یەکەمـدا کـە بریتییـە لـە هەنـدێ بابـەتی تیـۆری، میکـانزمی کـارکردنی پرۆگرامی بچووککراوە دەخەینە ڕوو، لە بەشی دووەمـدا لەسـەر بنـەمای ئـابووری کردن و لێکدان و جوولانـەوە تیـۆری پاسـاودان بەسـەر زمـانی کوردیـدا جێبـەجێ دەکەین، کورتەی لێکۆڵینەوەکە بە زمـانی عـەرەبی و ئینگلیـزی دوای ئەنجامـەکان ڕێکدەخرێن و سەرچاوەکان ڕیز دەکرێن .

## بەشی یەکەم
## هەندێ بابەتی تیۆری

### ١-١. سەرەتا

ئەو هەوڵە زمانەوانییەی چۆمسکی کە سەروویساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو دەگرێتەوەو لە ژێر ناوی پرۆگرامی بچووککراوە Minimalist Program کە (MP) کورت کراوەکەیەتی، کۆی کردەوە بە تایبەتی کارەکانی ١٩٩٨ بە جۆرێك دەڕوانێتە زمان کە پەیڕەوێکی تەواو، پڕاوپڕە، بەواتای ئەوەی (پەیڕەوێکی پڕاوپڕە لەو لایەنەی کەوا ڕێزمانی زمانی سروشتی پێکهاتەیەك دروست دەکات، کە گونجاوە و پێکهاتەیەکی هاوبەش لەگەڵ پێکهاتەکانی مێشك دروست دەکات، بەشێوەیەکی ڕوونتر، واتە تێکەڵ بە سیستەمی ئاخاوتن و بیرکردنەوە دەبێت (هۆلمبێرگ ٢٠٠٠: ٣٣) . لێرەدا چۆمسکی بۆچوونەکانی خۆی دەباتەوە ئاستی مێشك، و لە ئاستی مێشکەوە دەست بەڕێکخستنەوەی ڕێزمانی زمانەکان دەکات بۆ بەرهەمهێنانی ڕستەی زمانەکان (هەموو جۆرە ڕستەیەك )، کە گەورەترین یەکەی ئاستی ڕێزمانە، ئامانجی سەرەکی لەو تیۆرەدا ئەوەیە، کە تیۆرێك بۆ زمانی مرۆڤ بنیاد بنێ لە ڕێگەی کەمترین گریمانە و بنەمای بنجییەوە دابڕێژرێ، کە پێویست و بنەڕەتی بن بۆ زمان، بەو پێیە و لە ئەنجامی ئەوەدا ژمارەیەك بنەما (پرەنسیپی ) سەراپا دێتە کایەوە و پەیڕەو دەکرێ و سنووری سەرپشکی و ئارەزوومەندییەکان لە زماندا سنووردار دەکات، ئەمەش میتۆدێکە بەرەو ئەو سیستەمە پڕاوپڕەمان دەبات کە پێی دەڵێن زمانی مرۆڤ .

### ١-٢. چوارچێوەو میکانزمی MP :

لە میانەی شیکردنەوە زمانەکانییەکانی خۆیدا چۆمسکی تێبینی ئەوەی کرد، کەوا هەندێ مەرج بەناچاری دەسەپێنرێ بەسەر کردەکانی گوێزانەوەی گشتی و تێکەڵیان دەکات بە گوێزانەوە تایبەتییەکان لە ژێر بنەمای جۆرە مەرجێك، کە پیێ دەوترێ (مەرجی فراوان کراو extension condition ) کە بەپێی ئەم مەرجە

کردەی گوێزانەوە لە درەختەکەدا بەرەو سەرەوە فراوان دەکرێ، ئامانجی سەرەکی MP لەوە دایە هەموو مەرج و کۆتبەندەکان لە نواندنی ڕستەکاندا کەم بکاتەوە بۆ دەرهاوێژتەیەکی (out put) پەی پێبراو، و نابەرجەستە، کە بتوانرێ بە هۆی تایبەتمەندییەکانی ناوەوەی فاکلتی زمان پێناسە بکرێ (بڕوانە لاسنك ٢٠٠٣ : ٨٠–١ )، بەڵام هەوڵەکانی پرۆگرامی بچووککراوە، لەوە دایە، کە جیاوازییە دەرکەوتووەکانی زمانەکان دابەزێنێ بۆ ئاستی پەیوەست بە سیستەمی ڕێزمانی سەراپا (UG) و بە تاکە سیستەمێکی ژمێرکاری (Computational) بتوانرێ زمانە مرۆییەکان لە جیاوازی لێکسیکیدا سنووردار بکات، چونکە جیاوازی زمانەکان لە بنچینەدا سیفەتێکی مۆرفۆلۆجییانە هەڵدەگرن (چۆمسکی ١٩٩٥ : ٣٨٨) .

تیۆری (بنەماو پەرەمیتەرەکان ١٩٩٠ )ی چۆمسکی بەهۆی پرۆگرامی بچووککراوەوە سەرکەوتنی بە دەست هێنا، گۆڕینی زاراوەی تیۆر بۆ پرۆگرام سەنگێکی خۆی هەبوو (بچووککردنەوە) بە هێنانەکایەی پرۆگرامێك هەندێ نیشانەی دەرکەوتووی لێ دەکەوێتەوە کە توێژەر دەتوانێ شێوەیەکی هەرەمەکی تەواو بە فاکلتی زمان ببەخشێ بە دەست پێکردنێکی ساکارانە لە سووچ و گۆشە جیاوازەکانی نەخشەی فاکلتی ئەو زمانەوە (سیدریك ٢٠٠٦: ٩٥).

ئەم پرۆگرامەی لە لایەن چۆمسکییەوە پێشنیار کرا تیایدا سیستەمی زمان وەکو سیستەمێکی نەخشەسازی Mapping یان ژمێرکاری Computation سەیر دەکرێت، ئەم سیستەمە لە نێوان دوو ئاستی تێکەڵدا کاردەکات، کە بریتین لە ئاستی یان فۆڕمی دەنگسازی (فۆنەتیك، فۆنۆلۆجی ) PF، و ئاستی واتا یان فۆڕمی لۆجیکی LF، کارکردنی ئەو سیستەمە لە نێوان ئەم دوو ئاستەدا بە ئاستێکی هاوبەش Interface level ناودەبرێ، بەواتایەکی تر دوو ئاستی زمان کە پێشنیارکراوە، تەنها ئەو دوو ئاستەیە کە مایەی باوەڕپێکردنە کە ڕووبەڕوو دەبنەوە لەگەڵ سیستەمی چالاکی زمان performance پێیان دەوترێ (درکاوە هەست پێکراوەکان ) (articulatory-perceptual) کە بە (AP) کورت دەکرێتەوە، هەروەها چەمکە مەبەستدارەکان (conceptual-intentional) کە بە (C-I) کورت دەکرێتەوە .

تاکە سیستەمێك بۆ زمانە مرۆییەکان ز.م (سیستەمی ژمێرکاریی زمانە مرۆییەکان، کە بە CHL هێما دەکرێ ) بە (Computational of Human language) گوزارشتی لێ دەکرێ، ئەمەیش ئەوە دەردەخات کە تاکە سیستەمێکی بیرکارییانە هەیە، جیاوازییە فەرهەنگییەکان دەستنیشان بکات، بە مەش CHL وەکو دانانی ژمارەیەك سیستەمی ئارگۆمێنتی بۆ هەڵبژاردە فەرهەنگییەکان کار دەکات، بۆ هەردوو هێما (λ,π) لێکدەدرێتەوە، کە دەربڕینێکە بۆ زمانێکی دیاریکراو، لەو کاتەی π بریتییە لە نواندنی PF , λ بۆ نواندنی LF دیاریکراوە (بڕوانە یورا ١٩٩٩ :١٥) . بەمە چوارچێوەی بۆچوونەکانی چۆمسکی تەسك دەبێتەوە بۆسنووری فۆرمی لۆجیکی (LF) و فۆرمی فۆنەتیکی (PF)، ئەمەیش پێویستی و ئەگەری ئەوە دەدات بە دەستەوە، کەوا ڕۆنانی ژێرەوە (D-S) و ڕۆنانی سەرەوە (S-S) پشت گوێ بخرێ . بەم پێیە تەنها فەرهەنگی مێشك (Mental lexicon) و سیستەمی ژمێرکاری کە نواندنی LF، PF دێنێتە کایە لەڕێگەی زانیارییە فەرهەنگییەکانەوە (زمانی ناوەکی– I-language) ڕاییکاری ژمێرکاری و لێکسیکۆن کار دەکەن دەکرێ ئەم بیرۆکەیە لەم هێڵکارییەی خوارەوە ڕوون بکرێتەوە :




وێنەی (١) جێکەوتەی دەرەکی ئەو کەرەسە سەرەکییانەن، کە لە سیستەمەکە کاردەکەن .

### ١–٢–١. لە فەرهەنگەوە بۆPF ,LF :

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە چۆن زانیارییەکان لە فەرهەنگەوە بە ڕێگەی پێکهێنی هێڵکاری دەستەبەر دەکرێت لە مۆدەلی مینیمالستدا، ڕیزکردنی ژمارەی

یەکـەی فەرهـەنگی لـە فەرهەنگـەوە هەڵدەبـژێردرێت بـە ڕێگـەی کردەیـەکی هەڵبژاردن، ڕیزکردنی ئەو ژمارە یەکە فەرهەنگییە هەڵبـژێردراوە لـە فەرهەنگـەوە پێـی دەوتـرێ هـەژمارکردن Numeration، و بـە زاراوەیـەکی سـادە بریتییـە لـە بوونێکی وا کە کەرەسەی سینتاکسی (بۆ نموونە ڕسـتە ) تیایـدا دروسـت دەکـرێ (چۆمسکی ١٩٩٥ : ٢٤٠) .وەکو لە وێنەی (٢)دا ڕوون کراوەتەوە:

وێنەی (٢):




(هـەژمارکردن بـەو پێیـە وەرگرتنـی ژمارەیـەك یەکەیـە لـە فەرهەنگـەوە بـە مەبەستی بونیادنانی وەسفێکی ڕۆنـانی، سیـستەمی ژمێرکـاری، کەرەسـەکان لـەو هەژمارکردنە هەڵدەبژێرێ و لـە ڕۆنانەکـە بـە یەکیانـەوە دەبەسـتێتەوە (کریـستاڵ ٢٠٠٣ : ٣٢١) .

هەژمارکردن دووجۆرە هێما لە خۆ دەگرێت (LI/i)، لەوکاتەی (LI) یەکەیەکی زمانەوانی،(i) بریتییە لە گیرەکەکانی ئەو یەکەیە، زۆرجار یەکە زمانییەکە بە هۆی هەژمارکردنەوە هەڵدەبژێردرێ، دانەیەکی کۆپی کراوە لە ڕووی دەرونییەوە کە لـە مێشکی قسەکەردا هەیە، یان پێناسە دەکرێ وێنەی ژمارە (٢) و ئـەو هەنگاوانـەی خراونەتە ڕوو، یـان لـە داهـاتوودا دەخرێتـە ڕوو لـە پێنـاو بونیادنـانی یەکەیـەکی سینتاکسییە (ڕسـتە) / Syntactic object، کـە لەڕێگـەی لێکـدان وجووڵانـەوە دا (Merge and move) بەرهـەم دەهێنـرێ (دواتـر باسـی دەکـەین ) لـە پرۆگرامـی بـچووککراوەدا : تـەنیا ئاسـتە دەرکـەوتووەکان (مەبەسـتمان PF, LF)ە لـە

بونیادنانی یەکە سینتاکسییەکەدا بەشداری دەکەن، ئەو دوو ئاستە هەندێ مەرج گریمانە دەکەن . سیستەمی ژمێرکاری تەنیا ڕێگە بە کردەی هەژمارکردن دەدات، کە بێتە ناو سیستەمەکەوە واتە بچێتە ناو کەرەسە یان یەکە سینتاکسییەکەوە (LF, PF دەتوانن تەنها لێکدانەوە بۆ یەك یەکەی سینتاکسی بکەن ) بە ڕێگەی ئەو کردە دووبارەکراوانەی کە ڕێگەیان پێ دەدرێ، نەك هەموو فەرهەنگ بە گشتی، بەواتای ئەوەی سیستەمی ژمێرکاری لە ڕێگەی هەژمارکردنەوە پەیوەندی بە یەکە فەرهەنگییەکانەوە دەکات نەك ڕاستەوخۆ، و ئەم کردانە دووبارە دەبنەوە تاوەکو گشت هێماکان (یەکەکان ) کەم دەبنەوە بۆ سفر .

(ئەوەی ڕوونە کەوا فەرهەنگ ژمارەیەك کەرەسەی (وەکو ناو، کردار ) ی تێدایە بە تایبەتمەندییە کرۆکییەکانی خۆیانەوە، بەلایەنی کەمەوە لەو ڕووەوە ڕوونن، چونکە فەرهەنگ هەندێ پۆلی ئەرکی (بۆ نموونە ) وەکو تەواوکار (C) لە خۆ دەگرێ، بەڵام ئەم هەڵوێستە زۆر تاریك و نادیارە بۆ هەندێ پۆلی ئەرکی تری وەك کات (T)، ڕێکەوتن (Agr)، سیماکانی (Phi) کە بریتین لە (کەس و ژمارە و ڕەگەز ودۆخ )، هەموو سیمای ڕێزمانین بۆ نموونە (Agr) کە کورتکراوەی (Agreement)ە واتە ڕێکەوتن، بەشێکە لە (Phi-Features) بڕوانە (چۆمسکی ١٩٩٥ : ٢٤١) (کریستال ٢٠٠٣ : ٣٤٦) . ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد ئەوە دەگەینێ کەوا پۆلە ئەرکییەکان (Functional Categories) بە لایەنی کەمەوە دەکەونە ناو دوو پۆلی جیاوازەوەو بە دوو تایبەتمەندی جیاوازەوە، کە بەدەستهێنانی دەوەستێتە سەر گەیشتن بە ژمێرکارییەکە، یان فێربوونی ئەو یەکە فەرهەنگییانەی لە پرۆسەکەدا بەکاردێن.

پرۆگرامی بچووککراوە لە P&P واتە لە بنەماو پارامیتەرەکان زیاتر، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کەوا کەتیگۆرییەکان وا پێناسە دەکرێن کە بریتین لە بەندێك یان دەستەیەك تایبەتمەندی یان سیما . بەکارهێنانی مەعریفە ( Cognitive) لە بری ڕێزمان لە سەرەتای نووسینەوەکانی چۆمسکی ساڵی ١٩٩٥ بە دەرکەوتن، ئەم بۆچوونەش لەوەوە هاتووە کەوا توانستی زمان (FoL) Faculty of Language، ئەوە دەردەخات، کە هەر زمانێك لە فەرهەنگ پێکدێ، کە ئەویش یەکەی فەرهەنگی لە خۆ دەگرێ لە ڕێگەی بەهای سیمانتیکی و

ڕێزمانی و سیمای فۆنۆلۆجییەوە پێناسە دەکریٚ، سیما (تایبەتییە) ڕێزمانییەکان بەشێکن لە کەتیگۆرییەکان خۆیان (وەسفی) کەتیگۆرییە (پۆلە ڕێزمانییە)کان دەکەن، هەروەها بەشێکی مۆرفۆلۆجیشن (واتە بە شێوەیەکی سەرەکی دیاریکردنی دۆخ، ڕەگەز، کەس، ژمارە، هەروەها کات، کە لایەنی ڕێزمانین . بە مەش ڕێزمان یان سیستەمی ژمێرکاری زمانی مرۆڤ (CHL)، کە سەبارەت بە هەموو زمانەکان نەگۆڕە وبە پێی بەهای سیما کەتیگۆری و مۆرفۆلۆجییەکانی ئەو یەکە فەرهەنگییانە مامەڵە لەگەڵ یەکە فەرهەنگییەکان دەکات. توانستی زمان بە جۆرێك داڕێژراوە واتە بە چەند ڕێگەیەك کە پەرەمیتەرەکان ڕێگە بە جیاوازییەکانی زمان بدەن، بەڵام ئەم جیاوازییانە لە فەرهەنگ جێگیرکراون، یان لە وەسفی واتایی یەکە فەرهەنگییەکان، یان بە هۆی سیما فۆنۆلۆجیەکان، یان لە ڕێگەی ناوەڕۆکی تیۆری ڕێزمانی . لە سیمای ڕێزمانی (مۆرفۆلۆجی) دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، (بڕوانە سورین ٢٠٠٤: ٣٣) .

بە پێی ئەو ڕوونکردنەوەی پێشتر بەشێکیمان لە میکانزمی کارکردنی MP دا ڕوونکردەوە، دەکریٚ لەم چەند دێڕانەی خوارەوە چڕی بکەینەوە .

توانستی زمان دەچێتە ئامێزی هەڕەمێکەوە کە دووخاڵی بەیەك گەیشتوو دەدات بە دەستەوە، یان دوو سنووری هاوبەش (Interface) لەگەڵ سیستەمێکی چالاکی (زانیاری) زمانی دەرەکی : (a) درکاوە هەست پێکراوەکان (A-P) خاڵێکی هاوبەش دروست دەکات لەگەڵ سیستەمێکی هێزێکی جوولێنەری هەستپێکراو، (b) چەمکە مەبەستدارەکان (C-I) تێکەڵ دەبێت، یان هاوبەشی دەبێت لەگەڵ بەکارهێنانی زمانی -Language use) یان سیستەمی چەمکەکان، بە پێی ئەوەی وتمان لە بارەی توانستی زمان (FoL)، زمان بریتی دەبێت لە سیستەمێکی بەرهەمهێن کە جووتێکی وەکو LF, PF پێك دێنێت کە هێما (λ , π) مان بۆ دانان ئەم دووانە سیستەمی نواندنن، بەم پێیە PF لە (A.P) لێك دەدرێتەوە یان دەخوێنرێتەوە واتا لە (A.P) بە یەك دەگەن، (LF) یش لە ( C-I) بە یەك دەگەن.

هەردوو سیستەمی جولوێنەرە هەست پێکراوە درکاوەکە و سیستەمی چەمکە مەبەستدارەکانی چالاکی زمان، هەندیٚ مەرجی یاسایی گریمانە دەکەن بەسەر

وەرگرتەکانیانـەوە (input)، کـە نواندنـەکانی LF, PF یـەك لـە دوای یـەك دەبـێ مەرجەکان جێبەجێ بکـەن، بـە مـەیش نوانـدنی PF, LF لـە بـەر ئـەوە دەبـێ لـە کەرەسەی یاسایی پێکبـێن، کـە دەبـێ لێکدانـەوەی تـەواو لـە ئاسـتی گونجـاو بـە دەست بێنین، ئەگەر نواندنە بەرهـەم هاتووەکـە لـە ژمارەیـەك کەرەسـە پێکبێـت، ئەوە دەبێ بلێین کەوا مەرجـە یاسـاییەکانی جێبـەجێ کـردووە یـان (لێکدانـەوەی پڕاوپـڕی هەیـە (FI – (full interpretation)، دەربڕاوەکـانی زمـان بـە لایـەنی کەمەوە وەکو جووتێك لە (LF, PF) سەیر دەکرێ کـە گەیـشتوون بـەو مەرجانـە (بڕوانە ستیدمان : ٥٧٥) .

## ١-٢-٢. ڕێزمان و ژمێرکاری :

وەکو وتمان ڕێزمـان لـە چوارچـێوەی MPیـدا وەکـو سیـستەمێکی ژمێرکـاری سەیر دەکرێت، ژمێرکاریش بە پێی میکانزمی کارکردنەکە، بەرامبەر بـە داڕێـشتنی ڕستە دەوەستێ، ئەم ڕستەیەش بە سەر زمانەکانی جیهـان جێبـەجێ دەبـێ و بـە پێی ئەو سیستەمە ژمارەیەك داڕشتن بەرهەم دێ.( بەمەش زمانـەکان دوای بنـەما گـشتییەکان دەکـەون بەسـەر ئـەو سـیما ڕێزمانییانـەی یەکـە فەرهەنگییـەکان جێبەجێی دەکات کە هەڵبـژێردراوە (سـورین ٢٠٠٤: ٣٤) ڕاییکـاری سیـستەمەکەی داڕشتنی ڕسـتە بـەم شـێوەیەی خـوارەوە دەبـێ : ژمێرکـاری دەسـت دەکـات بـە هەڵبژاردنی ناوێك (ن) لە یەکە فەرهەنگیەکان لە فەرهەنگەوە لە ڕێگـەی کردەیـەك کە بە هەژمارکردنمان Numeration ناو برد، ئەو یەکانـەی هەڵبـژێردراون هـەنگاو بـە هـەنگاو، و یـەك لـە دوای یـەك دەخرێنـە نـاو ڕۆنانەکـەوە Σ بـەهۆی کـردەی لێکدانـــەوە یـــان یەکگرتنـــەوە (Merg)، ژمێرکـــاری ڕۆنـــانی Σ ســـەرەتا لـــە ژمێرکاریەکی ئاشکرا (دەرکەوتوو—overt ) پێك دێت، لە کۆتایی ڕوودانـی کـردەی دەربـڕین (spell– out – (SO)، دوای ئـەوەی Σ بـە دوو ڕێگـەی جیـاواز دەڕوات، ژمێرکـاری فۆنۆلـۆجی بـەرەو ئاسـتی هاوبەشـی نێوانمـان دەبـات A – P کەچـی ژمێرکاری داپۆشراو (covert) ی سیمانتیکی بەرەو ئاسـتە نێوانەکـەی (C-I) مـان ڕادەکێشێ .

دەکرێ کۆی میکانیزمی لێکدانەوەکان لە وێنەی ژمارە (٣) لێك بدەینەوە:

وێنەی (٣):


فەرهەنگ
هەڵبژاردن
هەژمارکردن
ژمێرکاری سینتاکسی
ڕۆنانی سینتاکسی
وەرگرتە-Input
spell-out درکاندن
نواندنی واتایی
سیستەمی بیرکردنەوە
نواندنی فۆنۆلۆجی
سیستەمی ئاخاوتن

## بەشی دووەم

## تیۆری پاساودان لەزمانی کوردیدا

٢–١ – تیۆری پاساودان سەرەتا وەکو میکانیزم و کۆمەڵێك ڕاییکاری لە تیۆری بنەما و پەرەمیتەرەکان (p&p) پێشنیارکرا، کە بۆ پشکنین و ساغکردنەوەی ئارگۆمینتەکان بوو، ئایا یاساین، یان گونجاون یان تواناییان هەیە لەگەڵ ئارگۆمێنی تر یەکبگرن لە پێناو دروستکردنی ڕۆنانێك، یان بە واتایەکی تر ئایا ئەو یەکە فەرهەنگییە سیما (Feature) ی گونجاوی بە دەستهێناوە بەر لەوەی لە شوێنێك لە ڕستەدا بەکاربێت (بڕوانە ماسیۆس ٥٤، تراسك ٤٠ ) کارکردنی تیۆری پاساودان لە Mp یدا پەیوەستە بە کۆمەڵێك دیاردەو میکانیزمی زمانی، چونکە لە بنچینەدا کارکردنی پاساودان لە پێناو بەدەستهێنانی ڕۆنانێکی سینتاکسی دروستە لە پاڵ ئەوەی پاساو بۆ ئەو ڕۆنانە سەرنەکەوتوانە بدات بە دەستەوە، بە واتای ئەوەی بەڵگەی لۆجیکی بە مەنتیقی پرۆگرامەکە بخاتە ڕوو بۆ دروستی و نادروستی ڕۆنان و نواندنە سنیتاکسییەکان .

٢–٢ یەکەی سینتاکسی لە نێوان یەکگرتن و جووڵانەوەدا (Move, Merge) یەکەی سینتاکسی، کە لە ڕێگەی هەژمارکردن و ژمێرکاری بەرهەمدێن لە ڕێگەی یەکگرتنەوە (لێکدان ) و جووڵانەوەدا هەموو ڕستەیەك بونیاد دەنێن، باسمان لەوە کرد، کەوا کردەی ژمێرکاری ڕاستەوخۆ هەموو یەکە سینتاکسییەکان لە فەرهەنگەوە وەرناگرێ، بەڵکو ئەوانەی دوای هەڵبژاردن ( Select ) گەیشتوون بە هەژمارکاری ( Numeration) وەردەگیرێن.

### ٢–٢–١ یەکگرتن (Merge)

بریتییە لە کردەیەکی ساکار، کە جووتە کەرەسەیەکی سینتاکسی دەستەبەر دەکات لەو جووتە کەرەسە سینتاکسییە، یەکەیەکی سینتاکسی ئاڵۆزتر بەرهەم دێنی، دوو کەرەسە سەرەتاییەکە لە هەژمارکارییەوە ئامادە کراوە و وەردەگیرێ، کە ئامادە کراوە بۆ داڕشتن (بڕوانە چۆمسکی ١٩٩٥ : ٤٣) باوا دابنێین ئێمە دوو کەرەسەی سینتاکسی وەکو : (أ ، ب ) مان هەبوو، ئەگەر یەکگرتن بەسەر ئەو دوو کەرەسەیە جێبەجێ بکرێ، کەرەسەیەکی گەورەتر دروست دەبێ و بەم

شـێوەیەی خـوارەوە دادەڕێژێتــەوە " ج، ( أ،ب ) " لێـرە (ج) کەرەســە تازەکـە دەنوێنی .

بۆ دەرخستنی داڕشتنی ئەو جۆرە لێکدانە : ئەگەر أ جێکەوتەی هەبێ و بێتە سەرە ( Head) بۆ کەرەسە تازەکە، کەواتە ناو لێنراوەکەی بەم شـێوەیە دەبـێ : أ: ( أ، (أ،ب ) )، بەڵام ئەگەر ب جێکەوتەکە وەربگرێ، کەرەسە نوێیەکە دەبێ بە ب : ( ب، (أ،ب ) )، یەکگرتنی (أ،ب) بەم شێوەیە دوایی گونجاو نییـە، بـەو پێیـە یان دەبێ (١– أ) یان (١–ب) ڕێگەی پێ بدرێ جێکەوتەی هەبێ .

(١–أ) (١–ب)

أ ب

٢ ٢

أ ب ب أ

هەڵبژاردەی ((هەڵە )) لە LF دەپاڵێورێ لەسەر بنچینەی چەند بنەمایەك بـۆ نموونە : گەر کردارێکـی وەکـو خـوارد، وەرگـرین لەگـەڵ بـەرکارێکی راسـتەوخۆی وەکو فرەیزی دیارخەری (DP) وەربگرین وەکـو( نـان ) بـۆ نموونـە، ئەگـەر ئێمـە جیاوازییەك لە نێوان (٢–أ) و (٢ – ب ) بکەین

(٢ – أ) (١ – ب)

* VP DP

٢ ٢

نان بخۆ نان بخۆ

ئـەوەی شـایەنی گوتنـە کـە لـە زمـانی ئینگلیزیـدا جێکەوتەکـە دەگـۆڕێ بـۆ نموونە :

3 – b DP* 3 – a VP

٢ ٢

Eat apple Eat apple

یان لە نموونەیەکی وەکو (٤)

(٤) :

قسەکەری یەکەم : بە نیازی لەگەڵ کێ بڕۆی

قسەکەری دووەم : لەگەڵ تۆ

قسەکەری دووەم بەڕێگەی کردەی یەکگرتنەوە یان لێکدانەوە سەرەتا (لە، گەل ) لێکدەدات دواتر ئەم دووەی یەکەم لەگەڵ سێیەم (تۆ ) لێکدەدات، کەواتە (یەکگرتن، یان لێکدان میکانیزمی بەستنەوەی دوو وشەیە بەیەکەوە وەکو ئەو نموونانەی سەرەوە (بڕوانە رادفۆرد ٦٦:٢٠٠٦) .

**٢-٢-٢- لێکدانی ناوەکی internal merge و دەرەکی external Merge**

بەپێی بۆچوونی چۆمسکی (٢٠٠٢) جوولانەوەش شێوەیەکە لە شێوەکانی لێکدان واتە merge وای بۆ دەچێ کەوا کردەی لێکدان لەوە دایە، ئەو کاتەی یەکەیەکی فەرهەنگی لەناو زنجیرەی یەکەی تر دەردێنی و لەگەڵ کەرەسەی تر دەیان بەستیتەوە ئەوە لێکدانی دەرەکییە external Merge، سەبارەت بە لێکدانی ناوەکی internal merge کردەی جوولانەوە لەوەی کە یەکەیەك تێکەڵ بەڕۆنانێك دەبێت، بۆ شوێنێکی نوێ دەجووڵێ لەو رۆنانەدا (هەمان سەرچاوە ٩٩).

سەبارەت بە کردەی لێکدان لای منداڵ رەوت و میکانیزمێکی تر وەردەگرێ (منداڵ تایبەتمەندییەکانی کەرەسەکان فێردەبێ، کە لە مێشکدا هەڵگیراوە، لێکدان نواندنێکی راستەوخۆیە لە رستەسازیدا منداڵ بە دەستی دێنی بۆ نموونە : لێکدانەکە بەم شێوەیە دەبێ

زۆر خانوو / زۆر خێرا، زۆر سوور ......

نەخەو / نەخۆراك / نەسەرما

دەکرێ بەستنەوەکە وا لێکبدرێتەوە (لە جێکەوتەکانیاندا )

| نموونە (٥ ) | زۆر | نە |
|---|---|---|
| | ٢ | ٢ |
| | زۆر × | نە × |

بڕوانە (پۆوەرس ١٩٩٨ : ٤).

بـەم پێیــە کـردەی بەســتنەوەکە دووبــارە دەبێتــەوە بەســەر کەرەســە سینتاکسییەکاندا تاوەکو پێکهاتی فریزەکان بە تەواوی ئامادە دەبێ سەبارەت بە لێکـدان یــان بەســتنەوەو گرێـدانی نــاوەکی و دەرەکــی (ســیدریك ) ئــەم دوو هێڵکارییەی خوارەوە دەخاتە روو .

وێنەی ( ٤ ) :




دوا دەربڕین Spell out جیاواز دەبێ لە چاو ڕۆنانی سەرەوە هەروەها ئەرکی ئەو ڕۆنانە بە دوو هێڵی دابڕاو دەردەخات لە نێوان PF، LF بەڵام دەبـێ ئـەوەش بـوترێ کـەوا دوا دەربـڕین ئاســتێك نییــە لــە ئاســتەکانی نوانـدن، بنــەمای هــیچ مەرجێکیش لەو خاڵە جێبەجێ ناکرێ شوێنی گرێدانەکەش ســەبارەت بــە LF, PF (s-o) بەم شێوەیەی خوارەوە :

وێنەی (٥ )




### ٢-٢-٣ جوولانەوە Move

کردەی گرنگی دووەم لە کردە سینتاکسییەکانی (MP) یدا بریتییە لە جوولانەوە، بەپێی مۆدەلی بنەماو پەرەمیتەرەکان، هەر کەرەسەیەکی سینتاکسی دەتوانێ بۆ شوێنی مەبەست بجوولێ و شوێن پێیەك (trace) لە جێگەی خۆی جێ بێلێ کۆتبەند لەسەر جوولانەوەکان هەیە، کە بەبنەمای جیاواز داڕێژراون بۆ نموونە لە گریمانەی ناوەکی فرەیزی کرداردا بکەر لە شوێنی سپێکی (VP) بەرهەم دێ دواتر دەبێ بجوولێ لە زمانێکی وەکو کوردیدا بە پێی بنەمای جێکەوتەی فراوانکراو (EPP)، کە لە فەرهەنگەوە مۆرفیمە ڕێزمانی و ناڕێزمانییەکانیان وەردەگرن، بکەر دەجوولێ بۆ شوێنی سپێکی سەرەی ڕێزمانی (IP) بەلام ئەم بارە لە MPیدا تاڕادەیەك جوولانەوە چەمکی خۆی دەپارێزێ، بەلام جیاوازی بنەڕەتی لەوە دایە (هەندێ لە کردەکان بەهۆی پێویستییەکانی مۆرفۆلۆجییەوە بەڕێوە دەچن، بەهۆی هەندێ سیما، کە لەگەڵ کەتیگۆرییە ڕێزمانییەکاندا یەك دەگرن وەکو (کات، ڕێکەوتن، دیارخەرەکان ).

ئەو کەرەستانەی لە فەرهەنگەوە رەسم دەکرێن پڕاوپڕ ڕێزمانینە (بڕوانە لیلیان ١٩٩٩ : ٥١٨)، بۆ نموونە ((هاتن )) هەموو سیما ڕێزمانییەکانی کات (T)و

ڕێکەوتن (Agr)ی هەیە، لە فەرهەنگەوە وەری گرتووە لەگەڵ خۆی دەیباتە ناو داڕشتنەکەوە و گیرەکەکان لەگەڵ سیماکان یەك دەگرن ئەویش دەبێ لە بەرامبەر جێکەوتەی سیما ڕێزمانییە گونجاوەکان پاساو بدرێ، دەبێ بگونجێن لەگەڵ سیما ئەبستراکتەکان، کە لەسەرە ڕێزمانییەکاندا دەنوێنرێن، سیما ئەبستراکتەکان لە سیستەمی ژمێرکاریەکە گونجاوترە لەچاو لایەنە مۆرفۆلۆجیە ئاشکراکان خۆیان .

**٢-٢-٣-١. جووڵەی ئاشکرا (Overt movement) جوولەی شاراوە : (Covert movement)**

یەکە فەرهەنگییەکان بە هەموو مۆرفیمە ڕێزمانییەکانیانەوە دەچنە ناو ڕۆنانەکەوە، سەرە ڕێزمانییەکان سیما ئەبستراکتەکان لە خۆ دەگرن، ئەو سیمایانەش یان بە هێزن(دەوڵەمەند) یان لاوازن (هەژارن) لە ڕێگەی یەکە فەرهەنگییەکانەوە پاساو دەدرێن (سەرە بن یان فرەین)، لەپاساودانی سیما ئەبستراکتەکانی سەرەی ڕێزمانی، جوولانەوەکان بە ئەنجام دەگەن، سیما بە هێزەکان لە ڕێگەی جوولانەوەی ئاشکرا پاساو دەدرێن، سیما لاوازەکان لە ڕێگەی جوولانەوەی داپۆشراوەوە پاساو دەدرێن (بڕوانە لیلیان ١٩٩٩ : ٥١٨ )، کەواتە جوولەی ئاشکرا وەکو سیمای بەڕێوەبردنی جوولانەوە دەردەکەوێ، لە هەوڵێکدا بۆ پاساودانی سیما بە هێزەکان (لێکنەدراوە)، کە ڕێگەی پێ نادرێ لە LF دا بمێنێتەوە، کەچی سیما بە هێزەکان (تەفسیرکراوەکان ) دەتوانێ خۆی دوابخات (بگرخێنێ، دەتوانن تا دەگاتە LF چاوەڕێ بکەن، لەو شوێنەی ڕێگا بۆ جوولانەوەی شاراوە چۆڵ دەکەن . PF دەتوانێ تەنیا یەکە فەرهەنگییەکان ببینێ، سیماکان لەو خاڵی ئاستی هاوبەشە (بەیەك گەیشتنە ) – Interface level دەرناکەون یەکەم جار دەبێ پاساو بدرێن، ئەمانە ئاشکرا نابن و یەکەکان دەکرێ دەربڕێن، تاوەکو داواکارییەکانی ئەو ئاستە هاوبەشە بە یەك بگەن، ئەگەر هەندێ سیما بمێننەوەو پاساو نەدرابن ئەو کاتە داڕشتنەکە تێکدەشکێ .

**٢-٤. سێ تیۆر سەبارەت سیماکانی پاساودان :**

چۆمسکی ساڵی (١٩٩٣) لە میانەی ئەو مەرجانەی لە بارەی بە ئابووری کردن (وەکو دواخستن) دایڕشت، پشتگیری لە جوولەی شاراوە کرد لە سەرووی

جوولەی ئاشکرا، ئێمە وا دادەنێین کەوا جوولەی ئاشکرا نییە، هەموو ئەوانی تر یەکسان دەبن کاتێك کە جوولەکە ئاشکرابێت لە بری داپۆشراو، دواتر دەبێ زوو بچێتە ناو کردەکەوە، بەهەندێ داواکاری تایبەتی بەمەش تیۆری جیاواز دەخاتە ڕوو کە چۆن سیما بە هێزەکان جوولەی ئاشکرا بەڕێوە دەبەن .

**٢-٤-١. PF و تیۆری تێکشکان PF Crash Theory :**

سیما بەهێزەکان ئەوانەی لە سینتاکسی ئاشکرادا پاساو نادرێن، دەبنە هۆی ئەوەی داڕشتنەکە لە PF دا تێکبشکێ ( لاسنك ٢٠٠٢ : ٨٤) .

بەمەش پاساودان دەچێتە ناو هەموو هەنگاوەکانی داڕشتنەوە، هەر لە هەڵبژاردنی یەکە فەرهەنگییەکانەوە تا دەگاتە ئاستی PF .

**٢-٤-٢. LF و تیۆری تێکشکان LF Crash Theory**

ئەو سیما بەهێزانەی پاساو نادرێن و ( دوادەخرێن) لە سینتاکسی ئاشکرادا دەبنە هۆی تێکشکانی داڕشتنەکە لە LFدا (هەمان سەرچاوە ) .

**٢-٤-٢. تیۆری ڤایرۆس Virus Theory:**

سیما بێهێزەکان دەبێ دوابخرێن ڕاستەوخۆ لەسەر دەروازەی نیشانەکانی فرەیز ئەگەر نا داڕشتنەکە دەسڕێتەوە (هەمان سەرچاوە )-

**٢-٥- پاساودان بۆ تیۆرەکانی تێکشکان : Crash Theory**

دەکرێ بوترێ کەوا ڕستەی ڕێزمانی وەکو جووتە نواندنێکی PF و LF سەیر دەکرێ، بە واتایەکی تر تێکەڵکردن و گونجاندنی پێکهێنی واتایی لەگەڵ پێکهێنی دەنگی، ئەو یەکە زمانییانەی کە بەشێکن لە کردەی هەژمارکاری بە دەستەیەك سیماوە لێك گرێدەدرێن بۆ بەرهەمهێنانی یەکەیەکی نوێی ئاڵۆزتر دەبێ لەوەش دڵنیابین کەوا لە ڕێگەی ئەو گرێدان و لێکدانی یەکەکانی تەنیا فریزەی ڕێزمانی دێتە بەرهەم، ئەمە بەشێکە لەو مەرج و کۆتبەندانەی Mp دەیسەپێنێ لە بەرهەم هێنانی ڕستەی ڕێزمانیدا .

پاساودان checking زاراوەیەکی تەکنیکییە میکانزمێکی بنچینە بۆ ئەوەی دڵنیابین، کە کەرەسەکە لە ژینگەیەکی نەگونجاو لە کردەی نواندنەکە دەرنەکەوتووە بۆ نموونە ئەگەر کەرەسەیەك سیمای دۆخێکی نۆمینە تیڤی هەبوو، دەبێ لەو شوێنە یان ئەو چاڵە دەرکەوێ کە بۆی دانراوە، یان بە واتایەکی تر

کەرەسەیەکی نۆمینە تیڤی دەتوانێ تەنیا لەگەڵ کەرەسەیەك یەك بگرێ کە بواری پێ دەدرێ سیمای نۆمینەتیڤەکەی پاساو بدرێ.

دوو رێگە هەیە بۆ پـۆلینکردنی سیماکان (features) : بەبەهەنـد هـەلگرتن و لەبەر چاوگرتنی پێکهێنی واتایی و رەفتاری رۆنانەکانیان واتە پۆلکردنەکـە لـە دوو روانگەیــەوە دەبــێ، جیــاوازی ســیمانتیکی (واتــایی) دوو جــۆر ســیمایان پــێ دەبەخـشێ، سـیما تەفـسیر نـەکراوەکان ( uninter preteble features) کـە نـەگونجاوە لەگـەڵ لایـەنی واتـایی کەرەسـەکە. بـەڵام شـێوەیەکی روونـی هەیـە، هـەروەها سـیمای تەفـسیرکراو ( inter pretable features)، کـە پێکهێنـی واتـایی هەیـە. هـەردوو جۆرەکـە پێویـستیان بـە پاسـاودان هەیـە لـە بەرامبـەر سـیما گونجاوەکاندا،کە لە شوێنی شیاودان لە درەختەکەدا، جیاوازی لـە نێـوان ئـەو دوو جۆرە سیمایە لەوەدایە کەوا سیما تەفسیر نەکراوەکە (پێکهێنی واتایی نییـە ) لـە پاساودانەکە دەرناچێ و لەناو دەچێ، ئەگەر سیمایەك پاساو نەدراو لەناو چوو بەر لـە LF ئەنجامەکـەی ئـەوە دەبـێ کـە نوانـدنێکی LFی ناشـەرعی بەرهـەم دێ لەوکاتەی سیما بێ واتاکان پێدەری جۆرە لێکدانەوەیەك دەبن . رێگەیەکی تـر بـۆ ئەم مەبەستە ئەوەیە کە سیما تەفسیرنەکراوەکان، کە لە ئاستی LF دەمێنێتـەوە دەبێتـە هـۆی تێکـشکانی دارِشـتنەکە سـیما تەفـسیر کراوەکـەش پێویـستی بـە پاساودان هەیە، بەڵام ئـەوان لـە پاسـاودانەکە لەناوناچـن. ئـەم سـیمایانە واتایـان هەیە بۆیە پێویـستی بـەوە هەیـە لـە ئاسـتی LF دا لێکدانەوەکـە بیـان گرێتـەوە، ئەگـەر هـەموو سـیماکانی پاسـاودان، دەبـێ بڵـێن دارِشـتنەکە لـە LF دا یـەك دەگرێتـەوە (converge) و یەکەیـەکی رێزمانیـان دەسـدەکەوێ (بروانـە ئـارتیس ٢٠٠٦ :١٩ ) نموونـە بـۆ سـیما تەفـسیرنەکراوەکان، سـیمای دۆخەکانـە کـە بـریتی دەبـێ لـە هەنـدێ کۆتبەنـدی هەڵبـژێردراو و لـەژێر دەسـەڵاتی ئـەو کۆتبەندانـە کاردەکات ئەمە لە دێریندا وەکو لقەکـە تیـۆری ( sub- categorization) دەناسـرا بۆ نموونە : (ەکە ) هەندێ سیما وەردەگرێ داوای ئەوەی لێ دەکـات، کـە لەگـەڵ ناوەکان یەك بگرن ئەگـەر بـە سـەرکەوتوویی بـە نـاوەوە گـرێ درا لـە پاسـاودانادا دەردەچێت، بەڵام پاساو دەدرێ و لەناو دەچێ کاتێك لەگەڵ کەرەسـەیەکی وەکـو (کردار) بەسترایەوە .

گولّ + ەکە

هات + ەکە = سیمای تەفسیر نەکراو

لێرەدا (ەکە ) وەکو کەرەسەیەکی پاساونەدراوی خاوەن سیما تەفسیر نەکراو لە ئاست لێکدان لەگەلّ کردارەکە دەمێنێتەوە و لەگەلّ هیچ کەرەسەیەکی تر یەك ناگرێتەوە .

نموونە بۆ سیما تەفسیر کراوەکان کە پێی دەلّێن سیمای (کەس، ژمارە، رەگەز، کات ؟....ئەمانە. لەگەلّ کەرەسە فەرهەنگییەکان لێك گرێدراون

سیماکان بە جۆرێکی تریش و بە بەلّگەی جیاوازەوە دابەش دەکرێنەوە بۆ سەر سیما بەهێز ( strong)، کە سیمای دەولّەمەندیشی پێ دەلّێن، هەروەها سیمای لاواز ( weak) سیمای هەژاریشی پێ دەلّێن. ئەم جیاکردنەوەیە پشت بە شوێنی کەرەسەکان لە رۆناندا دەبەستێ.

کە دەبێ سیماکانیان لە رووی شوێنەوە، واتە بەپێی شوێنەکانیان پاساو بدرێ (خالّی سەرەکی ئەوەیە کەوا سیمای بەهێز وادەکات کەرەسەیەك بجوولێ بۆ شوێنێك لە درەختەکەدا کە بتوانێ سیماکانی خۆی تێدا پاساو بدات، کەچی سیما لاوازەکان، ئەو ئەنجامەیان نابێ، سیمای لاواز دەتوانێ ببێتە هۆی جولاّن بۆ کاریگەری هەبوون بەسەر LF نەك PF بەمەبەستی دەربڕین، کەرەسەکە لە شوێنە بنەڕەتییەکەی خۆی دەردەکەوێ، بەلاّم لە پێناو بەدەستهێنانی لێکدانەوەیەکی واتایی بۆ شوێنێکی نوێ دەجوولێ. بەلاّم سیماکە بەهێز بێ یان لاواز پەیوەست نییە بەلایەنە واتاییەکەیەوە، وا دەردەکەوێ لە ئەدەبدا درێژی سیماکانی پەیوەندی بە نیشانە دەرکەوتوەکانی مۆرفۆلۆجییەوە هەبێ، کە سیماکان نیشانە دەکات، جیاوازی نێوان سیمای بەهێزو سیما لاواز لە جوولانەوەی (wh) ی پرسیار دەردەکەوێ .

هەر جوولانەوەیەکی ئامرازی پرسیار بەرەو پێشەوە بڕوات ئەوە سیمای بەهێز لە خۆ دەگرێ، بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی، بەلاّم زمانی کوردی بەهۆی ئەوەی ئامرازی پرس تواناى جوولانەوەی نییە بەم پێیە هیچ سیمایەك هەلّناگرێ واتە لە نێوان بەهێزو لاواز یەکسان دەوەستێ .بۆ نموونە:

کێ ئەم نامەی هێنا

ئەم نامەیە کێ هێنای

لە درەختەکەدا دەبێ (کێ) لە ڕستەی دووەمدا دابەزێ بۆ سنووری دەسەڵاتی VP، کە ئەمە ناگونجێ

سەیری درەختی ( ٦ ) لای خوارەوە بکە :




ئەم داڕشتنە پەسند نییە . لە وێنەی ( ٦ ) ی سەرەوە

چونکە بکەر بەرز دەبێتەوە بۆ سپێکتی TP بۆ وەرگرتنی دۆخی نۆمینیتی .

هەردەم بکەر لە درەختەکەدا شوێنێکی سەرووی بەرکار دەگرێت تەنیا ئەوە نەبێ چۆمسکی (١٩٩٠) گریمانەی شوێنی سپێکی – ڕێکەوتنی (Spec-Agr o) بۆ بەرکار کرد، ئەمەش لە ڕستەی سنووردارادا بەمەش جوولانەوەی بەرکار بۆ ئەو شوێنە جوولانەوەیەکی داپۆشراوە و لە پێکهێنی (Component) ی LF شوێن وەردەگرێ و ئەمەش دەکرێ وەکو کۆپیکردن (Copying) لەقەڵەم بدرێ، کە لە پێکهێنی LF دا جێبەجێ دەکرێ (بڕوانە لاسنك :٨٣)

بۆ نموونە سەیری نموونەی ( ٦) خوارەوە بکە

٦– أ – ئازاد سەلماندی تاوانبارە .

یان

ب. سەلماندی ئازاد تاوانبارە .

سەیری درەختی ( ٧ ) ی لای خوارەوە بکە :




بە پێیَ مەودای پرۆگرامی بچووککراوە (Min D) و بە پێیَ ئەو پرۆژەی (کەینس ١٩٩٤) خستیە ڕوو پێی وایە ئەو زمانانەی کە لە سەر بنەمای (SOV) ڕیز دەبن لە ڕۆنانی ژێرەوەیاندا وەکو (SVO) ڕەفتار دەکەن بەم پێیە جوولانەوەی بکەر بۆ شوێنی سپێکی ڕێکەوتن لە زمانی کوردیش ڕێگەی پێ دەدریَ (بڕوانە هۆرنسن ٢٠٠٥ : ١٦٨) .

ئەمە پەسندە بۆ زمانی کوردی :

درەختی (٨ )




**٢-٦- کردەی پاساودان و بنەماکانی بە ئابووری کردن :**

سـیمای ڕێکنەکـەوتن (Agree- Less) لـە تیـۆری پاسـاواندا سـاڵی ١٩٩٥ لەلایەن چۆمسکییەوە پێشنیارکرا سەبارەت بە سـیمای بکـەری (Nom) و سـیمای بەرکاری لە ڕستەیەکی تێپـەڕی چـالاکدا، داوای ئـەوە دەکـات کـە لـە سـپێکی t و

سپێکی بەرزترین سەرە لە قالبی VP ییەکی دوو پلەییدا نیشانە بکرێ (بەدوای یەکەوە ) ئەو پاساودانە بەرلە دەربڕینی Spell- out جێگە دەرێ سەیری درەختی ( ٩ ) خوارەوە بکە :

درەختی ( ٩ ) :

ت/ ئەم دابەشبوونە لە هەندێ باردا گۆڕانکاری بەسەردادێت

(I, k) هاونیشانەی نێوان بکەرو بەرکارو ئەو شوێنانەی لە بنچینەدا لێی بوونەو ئەو شوێنەی بۆی جوولاون.




Ti: شوێنی بنەڕەتی بەرکارە

oBj: شوێنی بۆجوولاوی بەرکارە (بەرزبۆتەوە بۆی )

Tk: شوێنی بنەڕەتی بکەرە

Subjk: شوێنی بۆ جوولاوی بکەرە (بەرزبۆتەوە بۆی )

بیرۆکەی سەرەکی بە ئابووری کردن لێرەدا لەوەدایە : لە قۆناغێکی تایبەتی ڕۆنانەکەدا :

کە بە بەردەوامی لە داڕشتندایە، لەو قۆناغەدا ئەو بەشەی ماوەتەوە لە هەژمارکردن لە جێبەجێ کردنی کردەکەدا (هەژمارکردن ) بەسەر ڕۆنانەکەدا دەوەستێ یان دادەخرێ گەر زانرا ئەو بەشەی کراوە زۆر چاکترە لەوەی ماوە بە واتای ئەوەی مەبەستی داڕشتنەکەی لە بەیەك گەیشتن و گونجانی LF PF سەرکەوتووە . (بەمەش بەپێی بۆچوونی چۆمسکی (١٠: ١٩٩٥ ) کردەی هەڵبژاردن selection و یەکگرتن Merge لە ئاستی بە ئابووری کردندا بێ –بەها costless دەوەستن .

**٢-٦-١- بنەمای کێشکردنی داخراو Attract closest principle (ACP)**

یەکێکە لە بنەماکانی تری بە ئابووری کردن چۆمسکی (١٩٩٥) خستیە ڕوو کە تیایدا سەرەکە کەرەسەیەك بۆ لای خۆی کێش دەکات هەوڵدەدات لە ناو کەرەسە گونجاوەکاندا یەکی پڕاوپڕی داخراو هەڵبژێرێ – چۆمسکی بنەمایەکی پێوانەیی بۆ ئەم مەسەلەی کێشکردنە داڕشتووە بە ناوی مەرجی کەمترین بەستنەوە Minimalist link condition (MLC) و (ACP) دەگرێتەوە : K کێشی A دەکات، تەنیا ئەگەر B لە ئارادا نەبوو، B داخراوترە لە a بۆ K بۆ کێشکردنی B لەلایەن (K) یەوە، ئەمەش بەپێی بنەمای جێکەوتەی فراوانکراو (EPP) ئەمەی خوارەوە دەگرێتەوە (C) بنەمای جێکەوتەی فراوانکراوە هەندێ سیما هەڵدەگرێ، واتا سیماکانی بنەمای جێکەوتەی فراوانکراو هەڵدەگرێ، کە وروژێنەرە بۆ جوولانەوەیەکی داخراوی کەرەسەیەك ، جا (C) سەرەیەکی ڕێزمانییە بۆ فریزە تەواوکەرەکان (CP)، بۆ نموونە لەم ڕستانەی خوارەوەدا (رادفۆرد ٢٠٠٤ :٢٠١ )

٧- أ – پێم سەیرە (ئەو دەیەوێ چی بکات )

ب – پێم سەیرە (چی ئەو دەیەوێ بیکات )

لەم دوو رستەی سەرەوەدا رستەی ( ٧- أ ) لە بارترە چونکە (ئەو ) داخراوترە بۆ سەرەوەی (C) بۆ ئەوەی راکێشی بکات بۆ شوێنی سپێکی (CP).

هەر لەو چوارچێوەیەدا، با وا دابنێین کەوا (V) سیمایەکی بکەری بەهێزی هەیە، کە بەرکارێکی ئاشکرا (Overt Object) بۆ خۆی کێش بکا بۆ شوێنی سپێکی خۆی، پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە، ئایا دوای قۆناغی دارشتنەکە، کە ئەو (V) یە لە رێگەی یەکگرتنەوە دروست دەبێ چی روودەدا ؟ سەیری درەختی (١٠) بکە :




لەوانەیە ئەوەمان بە بیردابێ کەوا بەهۆی ئەوەی کەوا یەکگرتن بەهایەکی کراوەی هەیە (cost- free ) جێبەجێ کردنی یەکگرتنەکە بکەر دەگەینێ بە (VP) یەوە و دەکرێ ئەم دارشتنەی خوارەوەی بدرێتێ .




سەیری درەختی ( ١١) بکە :

بەمەش سیمای بە هێزی (v) بە پاساونەدراوی دەمێنێتەوە دوای کردەکـە لـە بری ئەوەی دەبوایە بە پاساودان بەهۆی بەرکارەوە نیشانە بکرایە، ئەگـەر بـەرکار بجوولێ بۆ شوێنی سپێکی (v) وەکو ئەمەی خوارەوە : درەختی ( ١٢) :




کاتێـك کـە بکـەر بـەهۆی لێکدانـەوە بەرهەمـدێ بـۆ دەرەوەی سـپێکی v، پەسندە، گەر بـوترێ کـەوا پـەیوەنـدی (ئیمـاتیکی ) نێـوان بکـەرو (v) بەتایبـەتی وەکـو درەختـی (١٣) بەرهەمـدێ چـونکە بکـەر لـە شـوێنی سـپێکی (v) دایـە و پێناسەی سپێکی پێ دەدرێ .



ئەوەی گرنگەو دەبێ تێبینی بکرێ، لەو قۆناغەی کەوا بەرکار بە ئاشکرا بۆ شوێنی سپێکی v کێش دەکرێ بنەمای گشتی بە ئابووری کردن پشت گوێ دەخرێ، چونکە جووڵانەوە / کێش کردن لە میانەی یەکگرتنەوە هەڵدەبژێردرێ، کە زۆر ئابووری ترە لە جوولانەوەو / کێشکردن .

بڕوانە ( یورا ٢٠٠٤ :٢٦ )

بەپێی بۆچوونەکانی ئەم دواییەی چۆمسکی و رۆشنایی تیۆری پاساودان جوولانەوەی کردار بۆ سنووری رێکەوتن ( v- to Agree) دەچێتە چوارچێوەی بنەماکانی رێزمانی سەراپا (UG) ئەوە نەبێ جوولانەوەکە لە زمانی فەرەنسی دەرکەوتووە و لە زمانی ئینگلیزی شاراوەیە (بڕوانە لیلیان ١٩٩٩ : ٥٦٤ ) بەمپێیە لە زمانی کوردیش جوولانەوەکە بە شاراوەیی دەچێتە ناو کردەی داڕشتنەکەوە :

**٢-٦-٢ – بنەمای چاوتێر نەبوون Greed principle**

بنەمایەکی تری بە ئابووری کردنە، پێشتر باسمان لە بنەمای (plc) کرد، کە زۆر جار وەکو کورتترین جوولاندن سەیر دەکرێ، بەپێی ئەو بنەمایە تەنیا رێگە بە جوولانەوەیەك دەدات، کە بۆ نزیکترین شوێنی گونجاوبێ بۆ نموونە کەرەسەی (a) دەبێ کورتترین جووڵە بکات (چۆمسکی ١٩٩٥: ٤٠١ ) .

دوو کۆتبەند هەیە بەسەر جوولاوەکانی دەسەپێنرێ، ئەم کۆتبەندانە وەکو بنەمای بە ئابووری کردنی سەیر دەکرێ (دوو کۆتبەندی سەرەکی لەسەر کردەی جوولانەوە هەیە یەکێکیان بریتییە لە دواخستنی جوولانەوەکە بۆ درێژترین کات، کە بتوانرێ، پێی دەوترێ خۆگرخاندە Procrastinate، ئەوەی تر پێی دەوترێ چاوتێر نەبوون Greed، ئەمە دوای رێگە بە جوولانەوەی توخمێك دەدا کە بتوانێ مەرجی تایبەتمەندی توخمە جوولاوەکە جێبەجێ بکات و جوولانەوە دروست نابێ ئەگەر نەتوانێ مەرجی تایبەتمەندی توخمە (بۆ جوولاوەکە ) جێبەجێ نەکات، توخمی (a) بەرز دەبێتەوە بۆ شوێنی B تەنیا ئەگەر a خۆی لە خۆیدا بەرێگایەکی ترەوە لە داڕشتنەکەدا جێبەجێ نەکرابوو (چۆمسکی ١٩٩٥ : ٤٠٠).

لە پاساودانی ئەو کۆتبەندو بنەمایەدا ئەگەر کاریگەرییە گشتییەکەی کۆتبەند نەکرێ ئەوا داڕشتنەکە تێکدەشکێ بۆ نموونە :

بۆ پاساودانی سیماکانی کردارەکە، کردار دەبێ بجوولێ بۆ شوێنی AGR و T بەڵام ئەوانە ناتوانن بۆ کردار بجوولێن، بەمەش ڕێگە بەم درەختەی خوارەوە نادرێ:




درەختی ( ١٤ ) ئەوەی پێویستی بە وتنە ئەو بنەمایانە بە سەرکردەی ژمێرکاری جێبەجێ دەکرێ و بە هۆی تیۆری پاساودان دروستی بنەماکان ساغ دەکرێتەوە .

**٢-٥-٣. بنەمای دواخستن (خۆگرخاندن) Procrastinate Principle :**

کردارەکان لە بنچینەدا بە پاشگرە ڕێزمانییەکانیانەوە بەرهەم دێن، سەرەی ئەرکی وەکو AGR و T حوکمی مۆرفیمە ڕێزمانییەکان ناکەن، بە واتایەکی تر حوکمی دەستەیەك سیمای نابەرجەستە دەکەن، ئەو سیمایانە بریتین لە هەندێ هێما لە ناو دارشتنەکە، کە هاوکاری لێکدانەوەکان دەکەن، ئەوا دەردەخەن کەوا سیما ئەرکییەکان دەبێ ڕێگەی لێکدانەوەیان پێ بدرێ، واتا دەبێ ڕێگەیان پێ بدرێ پاساو بدرێن لە دارشتنەکەدا . سیما پاساو نەدراوەکان لێکدانەوە (تەفسیر) یان بۆ ناکرێ، ئەو دارشتنەی سیما تەفسیر نەکراوی تێدا بێ بنەمای لێکدانەوەی پڕاو پڕ– Full-Interpretation پشتگوێ دەخات . پاساودانی سیماکان بە ڕێگەی توانای سیما نابەرجەستەکانەوە بەسەر سەرە ڕێزمانییەکانەوە بۆ نموونە

(AGR): جێبەجێ دەکرێ . بۆ نموونـە ئێمـە وا دادەنـێین کـە سـەرەی (AGR) سـیمای سـپێکی نۆمینـەلێکی بـە هێـز لـە خـۆ دەگـرێ، کـە دەبـێ بـە هـۆی کەرەستەیەکەوە بە سیما توانادارەکانیەوە پاساو بدرێ بۆ نموونە ڕستەی

هێمای سەرەی AGR　　　　هێمای سەرەیT

أ.[ فرەیزی ڕێکەوتن [ ڕێکەوتن Fm [ فرەیزی کات [ کات Fn ] [ ف.ك ئازاد منداڵەکەی ماچ کرد]]]

ئەو سیمایانە لە دەربڕین Spell-out دا پاسـاو دەدرێـن ڕێگـەی هاوسـێیەتی کردار (V) لەگەڵ سیما توانادارەکان .

لە زمانی کوردیدا سـیمای سـپێکی AGR سـیمایەکی بـەهێزە بـۆ ئـەوەی بـە هۆی کرداری (ماچ کردن) پاساو بدرێ، وادەکات بکەر بۆ شوێنی سپێکی ڕێکـەوتن بجوولێ، بەڵام لە زمانی کوردیدا (وەکو زمانی ئینگلیزی ) سیمای سەرە بێ هێـزە دەتوانین بڵێین لە زمانی کـوردی سـیمای ڕێکـەوتن تاڕادەیـەك بـێ هێـزە(نـە وەك زمانی فەڕەنسی بـە هێـزە، نـە بەقـەد زمـانی ئینگلیـزی لاوازە )، بـەڵام بـە هـۆی سیماکان دەکرێن لە ڕۆنانی سەرەوەدا پاساو بدرێن، بەمە زمانی کـوردی دەچـێتە خانەی زمانی فەڕەنسییەوە و سیمای سەرە بە هێزە، بەڵام لە زمانی ئینگلیزی بە هۆی سیما لاوازەکانی سەرە، کردار ناتوانێ بەر لە (Spell-out) بجوولێ بەم پێیـە دواتر پاساو دەدرێ و بە پێی بنەمای (خۆگرخاندن procrastinate ) جوولانەوەکە تاوەکو قۆناغی LF دوادەخرێ (بڕوانە لیلیان ١٩٩٩ : ٥٦٤).

### ٢-٧. پاساودان بە شێوەیەکی گشتی :

لـە ئاسـتی بەیەکگەیـشتنی کردەکـان (Interface Level) تایبەتمەنـدی و دابەشبوونی کردەکان ساغ دەکرێینەوە، بۆ نموونە زانیارییـە واتاییـەکان ڕێگـەیان پێ نادرێ لە PF دا دەربکەون، لە بەرامبەردا زانیارییە دەنگییـەکان ڕێگـەیان پـێ نادرێ لە LF دا دەربکەون، بۆ ئەوەی وەسفێکی ڕۆنـانی (SD) بـە دەسـت بێـنین دەبێ هەردوو ئاستیPFوLF لێك نزیك ببنـەوە (Converge)، چۆمـسکی بیرۆکـەی بۆشایی Phase بۆ ناساندنی ڕۆنانەکان لە بڕی مەودا Dominate بەکاردێنێ .

سەیری درەختی ( ١٥ ) خوارەوە بکە :




کردار دەچێتە شوێنی بنەڕەتی خۆی لە ف.ك (VP) یدا، پێویستی بەوە نییە بۆ هیچ شوێنێ بجوولێ بۆ بەدەستهێنانی سیما ڕێزمانییەکانی، چونکە خۆی لە شوێنی خۆی لە فەرهەنگدا بەدەستی هێناوە، بەڵام بە پێی بۆچوونی چۆمسکی داڕشتنی ڕستە جگە لە هەردوو ئاستی PFوLF پێویستی بە ئاستێکی تر هەیە کە (پاساودان)ە، بۆ نموونە لە ڕستەی ( ٨) دا

٨ – من سێوەکەم خوارد .

کرداری خواردن وەکو کەسی یەکەم، تاك، کاتی ڕابردوو دەکەوێتە ڕوو، بەمە سەرەتا دەجوولێ بۆ شوێنی T بۆ ساغکردنەوەی کاتەکەی دواتر دەجوولێ بۆ شوێنی AGR بۆ ساغکردنەوەی ڕێکەوتنەکەی، ئەو پاساودانە، کە داڕشتنەکەی تێدا سەرکەوت، ڕستەیەکی ڕێزمانی بەرهەم دێنێت، بەواتایەکی تر وەکو :

٩– من نانی خوارد

لە پاساودانەکەدا دەرناچێ و ڕستەکە بە ناڕێزمانی لە قەڵەم دەدرێ

چۆمسکی دوای (١٩٩٣) لە درەختی ڕستەکاندا دوو ئەگەری هەبوونی دوو کەرەسەی ڕێکەوتن پێشنیار دەکات، یەکیان بۆ بکەر ئەوی تریان بۆ بەرکار (بڕوانە کوک ١٩٩٧: ٣٢٧). درەختی ( ١٦)




دەکرێ ڕۆنانی پاساودان بەم شێوەی خوارەوە ڕوون بکرێتەوە : سەیری درەختی ( ١٧) بکە :



شـوێنی بکـەر لـەو ڕستـەیەی سـەرەوەدا ڕێگـەی پـێ دەدرێ، کـە لـە لایـەنی کردارەوە ئەو ڕۆڵەی پێ دەدرێ، هەروەها (ناو) دەبێ سیمای دۆخێکی هەبێ، کـە دەبێ ئەو ناوەی پێ پاساو بدرێ، سـیمای دۆخ لـەو (نـاو)ە دا بریتییـە لـە دۆخـی بکەری (Nominative)، بـە تـەنیا ڕسـتەی تافـدار دەتـوانێ خـاوەن سـیمای ئـەم جۆرە دۆخە بێ (دۆخی بکەری)، و (تاف)یش یەکێکە لە سیماکانی (T) و ئـەوەش ڕوونە کەوا هەندێ سیما لەکاتی (تاف) دەردەکەون پەیوەندی بە بکەرەوە هەیـە، بەڵام مەسەلەکە لەوەدایە چۆن ئەو سیمایانە پاسـاو دەدرێـن . ئێـستا ئەگـەر دۆخ سیمای بەهێز بوو، پێویستی بە پاساودان هەبوو لە زیاتر لە پەیوەندییەکی نـوێنی دا، کە لـە نێـوان Tو DP دایـە (مامۆسـتاکە)، بکـەر لـەو شـوێنەدا زۆر بـە ڕوونـی دەناسرێ لە شوێنی ناو ڕۆنانەکە : لەو شوێنەدا پێناسە دەکرێ کـە کەرەسـەیەکە و لەو شـوێنەدا لـە TP یـیدا دەردەکـەوێ لـە ڕێزمانـە دێرینەکـەی چۆمـسکیدا، وا دەوترا کە فرەیزێکی ناوی دەجوولێ و (شوێنپێ — trace ) یەك لە دوای خۆی جێ دەهێڵێ، بەڵام ئەم میکانیزمە لە Mpیدا بە کۆپیکردن Copying ناودەبرێ، بەمـە بکەر دوای ئەوەی بە سیما هاوبەشەکانی خۆی بەشـداری لەگـەڵ (T) یـدا دەکـات دەبێ بچێتە ناو سنووری (phase) ی TP ییەوە وەکـو سـپێکی TP دەرکـەوێ بـۆ نموونە:

درەختی ( ١٨) ڕوونی دەکاتەوە :—



## ئەنجام

ئەو ئەنجامانەی لەو لێکۆڵینەوەیەدا دەکەونەوە بریتین لە :

١- لە پاڵ ئەوەی تیۆری پاوسادان بە ئاستێك دادەنرێ لە پاڵ (LF,PF) بەڵام وەکو میکانزم هەردوو ڕۆڵی پاڵێوەری دۆخ و پاڵێوەری ڕۆڵی بابەتانە دەگێڕێ، لەوەی هەر کەرەسەیەك پاساو نەدرێ، ناتوانرێ لێکدانەوەی واتایی بۆ بکەی، بەمە دارشتنی ڕستەکە لەبەر دەم ئاستی (LF) دا تێکدەشکێ و ڕستەکە بەرهەم نایەت .

٢- لە پاساودانی سیماکاندا جیاوازی لە نێوان، سیمای بە هێز و سیمای لاوازدا دەکرێ لەوەی : سیمای بەهێز لە ئاستی PF دا دەرباز نابێ بێئەوەی نەبێتە هۆی تێکشکاندنی دارشتنەکە لە بەرامبەردا، سیما لاوازەکان . لە ئاستی PFشدا دەرناکەون بەمەش نابنە مایەی تێکشکاندنی دارشتنەکە تاوەکو سەرهەڵدەدەن .

٣- لە پرۆگرامی بچووککراوەدا هیچ پلەیەك بە چەمکی دەسەڵات، یان حوکم کردن (Government) نادرێت .

٤- هەرچەندە چۆمسکی دوای (١٩٩٥) ڕیزکردنی کەرەسەکان (S.O.V) هەموو جۆرەکانی دەباتەوە ئاستی (UG)، بەڵام زمانی کوردی لە نێوان سیماکانی زمانی فەرەنسی و زمانی ئینگلیزییەوە دەمێنێتەوە .

## هێما و کورتکراوەکان

| | | |
|---|---|---|
| پرۆگرامی بچووککراوە | Minimalist Program | MP |
| چەمکە مەبەستدارەکان | Conceptual-International | C-I |
| درکاوە هەستپێکراوەکان | Articulatory-Perceptual | A-P |
| ژمێرکاری زمانە مرۆییەکان | Computation Human Language | CHL |
| فۆرمی لۆجیکی | Logical form | LF |
| فۆڕمی دەنگی | Phonetic Form | PF |
| پاشگرەکان/ یەکەی فەرهەنگی | Lexical Item/ index | LI/i |
| لێکدانەوەی پڕاوپڕ | Full – Interpretation | F-I |
| دەربڕین | Spell-Out | S-O |
| ڕۆنان | Structure | $\Sigma$ |
| ئاستی دەنگی | PF | $\pi$ |
| ئاستی واتا | LF | $\lambda$ |
| ئاستی هاوبەش | Interface Level | I-L |
| سیمای پی _ ئێف | Phi-feature | Ph-F |
| توانای زمانی | Faculty of Language | FoL |

## سەرچاوەکان

1.Aarts, B and Macmahon, A (2006) The handbox of english Linguistics, Blackwell Publishing.

2.Cedric, B (2006) Linguistic Minimalism, Oxford University press.

3.Chomsky, N (1995) Minimalism Investigation in Languistic theory, Routlege, London.

4.Coock, V, J . and New Son, M, L (1997) Chomsky's Universal Grammar, Black Well : Oxford .

5.Crystal. D .(2003) A dictionary of Linguistics and phonetics, Black Well . Oxford .

6.Heagman, L and G, Gacgueline (1999) English Grammar , Black Well, Oxford .

7.Holmberg. A (2000) The rose of inflection in seandinavian, syntax oxford press .

8.Hornstein, N and Nunes, J, and Grohman, K (2005) Understanding Minimalism, Cambridge Textbook.

9.Matthews. P, H (2007) Concise Dictionary of Linguistics, Oxford University Press .

10.Radford . A (2006) Minimalist Syntax, Combridge University Press .

11.Seuren. P. A. (2004) Chomsky's Minimalism. Oxford University Press.

12.Trask, R, L (1993) A dictionary of Grammatical Terms in Linguistics, Routledge: London .

13. Ura, H (1999) Checking theory and Grammatical Function in.

## الخلاصة

يعنى هذا البحث بنظرية التحقيق في اللغة الكردية و هي بالأساس نظرية فرعية انبثقت فى اطار النظرية المصغرة لجومسكي ويمكن ترسيخ بدايتها في ١٩٨٦ وما وراءه، ثم تغير ملامح هذه النظرية مقارنة بنظرية (العامل والربط الاحالي ) والتي سبقتها بفترة وجيزة، يتوزع هذا البحث على فصلين : الفصل الاول والذي يحمل عنوان بعض المواضيع النظرية، يتطرق الباحث خلاله على مفاهيم وآلية عمل نظام التحسيب والاحصاء وكيفية زج المفردات من القواميس العقلية لغرض صياغة وحدة نحوية . أما الفصل الثاني والذي خصص لعرض آلية اشتغال نظرية التحقيق في اللغة الكردية، مستنداً بذالك بآراء جلَ الذين استبانوا واستبينوا هذه النظرية، بعد عرض النتائج تصنف المراجع.

## Abstract

This paper which entitle (checking theory) a research about the applauding this theory in the boundaries of MP which started to assume at the beginning of 986 after GB theory the research falls in two parts, part one a bout some theories objects and the mechanism procrastinate of which called a computational system as a sub-system and internal system in the boundaries of MP . The second part about releasing the checking theory in Kurdish syntax and to derivate syntactic unit by this system the research ended by the conclusion .

# بنەماكانی شیعرییەت
# لە تێكستی (یادگار و هیوا)ی ئیبراهیم ئەحمەد دا

د. عوسمان دەشتی
كۆلێژی ئاداب ـ زانكۆی كۆیە

## پێشەكی

لە سەرەتای سییەكاندا، لە شاری سلێمانی هەوارگەی میرایەتی بابان، جوولانەوەیەكی نوێخوازی لە بواری بووژاندنەوەی زمان و تازەكردنەوەی ئەدەبیات و پەرەپێدانی رووناكبیری كوردی لە ئارادا بوو. یەكێك لەو بەرهەمە ئەدەبییە دانسقانەی كەوا لەو رۆژگارەی نوێكردنەوەی شیعری كوردی داهێندراوە تێكستی شیعری (یادگار و هیوا)ی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد (بلە)یە.

ئەم تێكستە لە چەند رووەوە بە ڕچەشكێن و كارێكی ئەدەبی پێشەنگ دادەندرێت وەك:

ـ لەدایكبوون و هاتنە ناوەوەی ئەم تێكستە لە پاڵ كۆمەڵێك پارچە پەخشانی هونەری و چەند بابەتێكی رەخنەی ئەدەبی لە لایەن خودی ئەو نووسەرەوە كە لەو رۆژگارەدا بڵاو بوونەتەوە، بەشدارییەكی گرینگ و رێبەرانە بووە لەو بزووتنەوە رۆشنبیری و رۆشنگەرییە گرینگەی كە لەو ڕۆژگارەدا لە ئارادا بووە.

ـ بەرهەمێكی ئەدەبی دانسقەو دیار بووە لە مەسەلەی برەوپێدانی نووسین و خوێندنی كوردی و پاككردنەوەی زمان و ساغكردنەوەی زمانێكی ئەدەبی خاوێن و پەتی، وێڕای زیندووكردنەوە و پەرە پێگرتنی خەرمانێك وشەو زاراوەی رەسەن و شیرین و ناسكی زمانەكە.

ــ ئـەم تێکـستە، شانبەشـانی بەرهـەمی ئـەدەبی شـاعیرانی پێـشڕەوی ئـەو سەردەمە، ڕۆڵێکی گـرینگ و داهێنەرانـەی گێـڕاوە لـە بزووتنـەوەی شـیعری نـوێی کوردی و برەو پێدانی قوتابخانەی ڕۆمانتێکی و ڕۆمانتێکی شۆڕشگێڕی لە مێژووی بەرەو پێشەوە چوونی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیدا.

ـ دوا بە دوای بڵاوبوونەوەی لـە فـۆرمێکی هونـەری بـە هێـزو سـەرنجڕاکێش و ناوەڕۆکێکی ڕەسەن و شۆڕشگێڕانەو، ریتم و ئاوازێکی بە جۆش و خـۆش ئاهـەنگ و، زمـان و داڕشـتن و شـێوازێکی ناسـك و ڕەوان و خۆمـاڵی، دواتـریش لـە ڕێگـەی پرۆسـەی بـە ئـاواز و گـۆرانی بوونیـشیدا، چـێژو بـەها و لایەنـە شـیعری و جوانکارییـەکانی زیـاتر دەرکـەوتوون و بـوون بـە مایـەی هـۆگری و دڵپەسـندی خوێنەران، تا لە دواییدا دەبێتە چەپکە گوڵێکی بۆنداری هونەری شیعری کوردی و تا ئەمڕۆی لەگەڵ دابێت ژیانی کردووەو بە گەشی و بە زیندوویی ماوەتەوە.

ئەمانە هەموو بوونەتە بنەما و هۆکارو هاندەر بۆ ئێمە، بۆ ئەوەی لە ڕوانگەی ڕەخنەی تازەوە ئاوڕێك لە بنەماکانی شـیعرییەت و جوانکـاری و بـەها و داهێنـانی ئەم تێکستە بدەینەوە.

باسەکە بە شێوەیەکی گشتی لە دەروازەیەك و سێ بەش پێکهـاتووە، ئـەنجا هەر بەشێکی لە چەند لایەن و بڕگەو بابەتێکەوە خراوەتە ڕوو بـەم شـێوەیەی لای خوارەوە:

**دەروازە**

**١. تێکست:**

تێکستی شیعری (یادگارو هیوا) لە چەشنی گەوهەرێکی یەکدانە لە گەنجینەی سامانی شیعری نوێی کوردیدا شوێنی گرتووە، لە دوای تێپەڕبوونی (٧٧) ساڵ بەسەر بڵاوبوونەوەی تاوەکو ئێستاش بەسەر زارو زمانی خەڵکەوەیە، لەو ماوەیەدا لە چەندین بۆنەو کات و شوێنی جیادا سەر لە نوێ بڵاو کراوەتەوە، بەم ڕەنگەی خوارەوە:

أ ـ گۆڤاری هاوار، ژ/ ١٩، ١٧نیسانی ١٩٣٣. [١]

ب ـ یادگاری لاوان، بەغدا، ١٩٣٣. [٢]

ج ـ گۆڤاری گەلاوێژ، ژ/ ٩، ساڵی/٤ ، ئەیلوولی ١٩٤٣.

د ـ گۆڤاری رزگاری، ژ/ ٦، ساڵی/١ ، تەمووزی ١٩٦٩.

هـ ـ بەرەو ڕووناکی سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد، ئومێد ئاشنا، سلێمانی ١٩٦٦.

و ـ برایم ئەحمەد ـ کۆی بەرهەمە شیعرییەکانی، عومەر مەعروف بەرزنجی، سلێمانی ٢٠٠٧.

ز ـ لە هەندێ باس و لێکۆڵینەوەدا کەم و زۆر نووسەران لەبارەی ئەم تێکستە دواون و چەند بەندو بەشێکیان لێ بڵاو کردۆتەوە.[٣]

ح ـ لە کاتی خۆیدا تەواوی تێکستەکە بە ناونیشانی (ذکری وأمل)، لەیەلان (د. مارف خەنەدار)ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و بڵاوکراوەتەوە.[٤] جارێکی تریش چەند بەشێکی تێکستەکە بە زمانی عەرەبی لە لایەن (عەباس بەدری)یەوە وەرگێڕدراوە و بڵاوکراوەتەوە.[٥]

لە نێوان تێکستەکەی گۆڤاری (هاوار) و تێکستەکانی دیکەشدا کەم و زۆرجیاوازی بەدی دەکرێت، لە بارەی وشە و پێکهاتە و ڕێنووسەوە لێرەدا بەپشت بەستن بە تێکستەکەی (یادگاری لاوان) کە بۆتە ماکی هەموو ئەوانی دیکەو بەڕەچاوکردنی ڕێنووسی نوێ، تەواوی تێکستەکە بە پوختی بڵاو دەکەینەوە:

## یادگار و هیوا

(١) لەبەر چاوی بەد، لە ترسی بەدکار
دڵ خۆم ئەکەمە گۆڕی یادگار
بەگریانی وشک، بە ناڵەی بێ دەنگ
دێنمە لەرزین تەختی کردگار

****

(٢) بێ، هێزی ئەژنۆم، بینایی چاوم
ئارامی گیان، جەرگم هەناوم
یاخود بە جارێ چارەسەرم کە
یا لە نامەی ژین دەربێنە ناوم

****

(٣) ژیان بە لاتی و بێ دەسەڵاتی
هیچ درۆی نەبێ، سەد مەرگە ساتی
مرۆ بە دیلی بژی خۆشە، یان
بمرێ بۆ بەرزی خۆی و وڵاتی

****

(٤) شیرین: بەهارە، بەهاری شادان
بێ بەهرەن لە ژین گەل نامرادان
جەژن و بەهارو سەیران و خۆشی
گشتی پیرۆزی گەردن ئازادان

****

(٥) شیرین: ئەزانم کە تۆش زاماری
وەك من عەودالی خونچەی بەهاری
هیوای تۆ یەکە، هیوای من هەزار
من بێزار نەبم، تۆ بۆ بێزاری؟

****

(٦) مەژی بۆ مردن، بمرە بۆ ژیان
چۆن قازانج ئەکەی تا نەکەی زیان
لە زڕەی زنجیر دڵت نەلەرزی
پێوەند بۆ لەشە نەوەك بۆ گیان

****

(٧) بێ دابنیشین جە بن هەناران
کوڕێ ببەستین چون مەی گوساران
با ساتێ ناوی لەیادا نەبێ
مەرگی جوانان گریەی هەژاران

****

(٨) بێ دابنیشین جەبن داری بەی
نەختێ بنۆشین جە خۆشاوی مەی
ئینجا بزانە کامیان جوانن
بەی ڕەنگی گەردن، مەی ڕەنگی گۆنەی

****

(٩) بێ با بۆت بکەم باسی جوانیم
ڕۆژانی بەرخیم شەوانی شوانیم
کۆڕپەی ئازیز بووم شوانکارەی شادی
ژیام بە خۆشی هەتا توانیم

****

(١٠) ژیام سەردەمێ بە کەیف و خۆشی
بە شادی کڕین، بە خەم فرۆشی
تاکو پێم کرا روومەتم مژی
تاکو توانیم شەرابم نۆشی

****

(١١) ئـــەو ســـاكە چـــوومە ريـــزی دڵـــداران
پێـــی وتم ســـەردار هـــۆزی هـــەژاران
((بـــێ دابنيـــشين جـــەپای ديـــواران
زنجـــير لـــە گـــەردن چـــون گوناهكـــاران))

****

(١٢) بـــێ دابنيـــشين لـــە نێـــو ڕەزانـــــــا
خونـــچە بكێـــشين بـــە ڕووی خـــــەزانا
مـــن بـــە مـــاچ دزيـــن، تـــۆ بـــە دڵ دزيـــــن
هـــەزار پـــەل بـــدەين وە پـــشت دزانـــــا

****

(١٣) بـــێ دابنيـــشين لـــە نێـــو گوڵـــشـــەنا
لـــە ژێـــر ســـێبەری دارو دەوەنـــــــا
لـــە ترســـی دوژمـــن بـــە ســـۆزەی بـــەيان
گوفتوگـــۆ بكـــەين لـــە تـــــەك وەتـــەنا

****

(١٤) بـــێ دابنيـــشين جـــە بـــــن چـــناران
لـــە چـــاوی مەســـتی ديـــدەخوماران
بـــەری بـــەيان و ســـەرلە ئيـــۆاران
بـــادە بنۆشـــين بـــە يـــادی جـــاران

****

(١٥) بـــێ دابنيـــشين ديـــدە پـــڕ ئەســـــرين
تـــۆ بگـــری بـــۆ خـــۆت، منـــيش بـــۆ شيـــرين
((وا بـــەهاريش هـــات كـــەژ و كـــۆ ڕەنگـــين
دڵـــەی عاڵـــەم شـــاد، دڵ خۆمـــان خـــەمگين))

****

(١٦) بەهار هاتەوە وە سەیرانەوە
وە ڵی و لۆلۆ وە حەیرانەوە
بە لەنجە و لاری نیگارانەوە
وە دەنگی خۆشی هوزارانەوە

****

(١٧) بەهار هاتەوە خۆشی لە یاران
خۆشی لە گوڵشەن خۆشی لە داران
خۆشی لە کۆڕی بادەگوساران
خۆشی لە بلبل، خۆشی لە خاران

****

(١٨) خۆشی لە عاڵەم دوور لە دڵی من
شەونم بۆ خاران دوور لە گوڵی من
زنجیر پیرۆزی دڵ مردووان بێ
با ئازاد بژی بیری سڵی من

****

(١٩) شێوەی شیرینی کەژی خوێنینم
شیرێکە لەسەر زامی برینم
ئازاد کردن و بەرزی وڵاتم
هیوای گیانمە و ئامانجی ژینم

****

(٢٠) بادەی مەی دەبا فرمێسکی چەم بێ
خۆراکی مە با هەر دەردو خەم بێ
دوایی لە خوێنی دوژمن تێر ئەخۆین
هەر چی چۆنێ بێ، هەر چەندە کەم بێ

****

(٢١) بێ دابنیشین دووربین لە شادی
بمرین بە مەردی و گەردن ئازادی
بمرین لە ڕێگەی تۆڵە سەندنا
نەك لەسەر جێگە بە نامرادی
****

(٢٢) پرشنگی ژینم، وە بیناتەوە
کوورەی دەروونم، وەگۆناتەوە
((هەستە بێرە لام خۆر وەپاتەوە
دەرمانی دەردم هاوەلاتەوە))
****

(٢٣) شیرین هەتاکەی دووری بچێژم ؟
فرمێسکی خوێنین تاکەی بڕێژم ؟
تاکەی لە گۆشەی دڵی زارمدا
خونچەی جوانی و گەنجی بنێژم ؟
****

(٢٤) ئەوا تۆ ئەڕۆی بە خوام سپاردی
پێم نەکرا خۆم بێم دڵم بۆ ناردی
ڕێی ژیان سەختە، بە ترس و لەرزە
نابێ بترسی لە گەرمی و ساردی
****

(٢٥) دڵە شیرین ڕۆیی بڕۆ لە شوێنی
کە شیرین ڕۆیی تۆ بۆ بمێنی
بەڵێن بێ ئیتر نەتناسم هەتا
مژدەی ئازادی (یارم) بۆ دێنی
****

(٢٦) چاوە وەك لێزمەی بارانی بەهار
دڵۆپی خوێنت بۆ پیا دێتە خوار؟
گریان کردەوەی بێ دەسەڵاتە
بێ دەسەڵاتان ئەڕزێن لە ژێر بار

### لێکدانەوەی هەندێ وشە و زاراوەی تێکستەکە :

کردگار: خوا، یەزدان

بێ: وەرە

بەهرە: بەش، بێ بەهرە بە واتای بێ بەش

جەبن: لەبن، لە ژێر

مەیگوسار: مەینۆش، بادەخۆر

مەرگی جوانان: ئەوانەی (جوانە مەرگ) دەبن و لە هەڕەتی لاویدا دەمرن

چون: وەکو، لەبەر ئەوەی

بینا: چاو، دیدە

خەزان: پایز

دیدە خومار: چاوی سست و خاوی نازداران، کە لە وێنەی چاوی مرۆڤی مەست و مەیخۆرەوەیە، لە کوردیدا (دیدە بە خومار)یش دەگوترێت.

نیگار: کچی جوان

هوزار: بولبول

بادە گوسار: بادەنۆش

خار: دڕکودالْ

سلْ: رەوەك

چەم: چاو

مە: ئێمە

بێرە: وەرە

هاوەلاتەوە: وا لەلای تۆیە

### ٢. فۆرم و کێش و سەروا:

(یادگار و هیوا) لە فۆرم و قالبی چوارینەیە، چوارینە فۆرمێکی باوی شیعری رۆژهەلاتییە، لە شیعری کوردیشدا لە زووێکەوە بەرچاو دەکەوێ. [٦] وەکو بینیمان تێکستەکە خۆی لە (٢٦) بەند پێك هاتووە، کە هەر بەندێکی بەرامبەر چوارینەیەك دەوەستێ، لەگەلْ ئەوەدا هەر بەندێکی جۆرێك لە سەربەخۆیی خۆی هەیە وەك بە گشتی لە مەسەلەی چوارینەدا باوە، وەلێ لە یادگار و هیوادا یەکێتییەکی پتەو و تێکچڕژاو لە تێکستەکەدا بەدی دەکرێت، وەکو دواتر تیشك دەخرێتە سەر ئەم لایەنە. [٧] کێشی تێکستەکە برگەیی خۆمالْییە، بۆیە لە چوارینەی کوردیدا هەر لەتێکی حسابی دێڕێکی بۆ دەکرێت. [٨]

یادگار و هیوا لەسەر کێشی (١٠) بڕگەیی دوو پێیی (٥ + ٥) هۆنراوەتەوە کە وەستان لە ناوەڕاستی پێیەکاندا دەبێت، گۆرانی شاعیر لە بارەی ئەم کێشەوە دەڵێ: ( (ئەم کێشە لە هەڵبەستی کوردیدا ئەوەندە باوە پیاو زۆر بە ئاسانی ئەتوانێ ناوی لێ بنێ کێشی نەتەوەیی گەلی کورد)). [٩] بەشێکی زۆری شیعری فۆلکلۆری و شیعری ناوچەی (گۆران) لەسەر ئەم کێشە هۆنراوەتەوە، هەڵبژاردنی ئەم قالبە کێشە لە هۆنینەوەی یادگار و هیوادا جۆرێك لە ئیحامان پێ دەبەخشێت، کە ئەویش گەڕانەوەیە بۆ مۆرکی رەسەنایەتی و گیانی کوردەواری، بە تایبەتیش کاتێك کە دەبینین هۆنراوەی شێوەزاری گۆران و فۆلکلۆرو گۆرانی میللی ئەو ناوچەیە، شوێن پەنجەی روونی بەسەر گیان و روخساری تێکستەکەدا داناوە. سیستەمی سەروا بەندی لە چوارینەدا جۆراو جۆرە، قالبی هەرە باویان لە کوردیدا ئەوەیە کە بە (چوارینی خەساو) یاخود ناتەواو ناو دەبرێت. لەم جۆرەیاندا نیزامی سەروا لە هەر بەندێکدا سەربەخۆ دەبێت و هیچ پەیوەندی بە چوارینەکانی دیکەوە نابێت، هەروەها چەشنی ریز بوونی پیتە سەرواکان ئەم شێوەیە وەردەگرن (CCDC,AABA ,...). [١٠]

لە کۆی (٢٦) بەندی تێکستەکەدا، لە (١٩)یان پێڕەوی لە سیستەمی سەروای ناتەواو و لە (٧) بەندیش شاعیر لەم ڕێڕەوە لای داوە و پێڕەوی لە سیستەمی سەروای چوارینی تەواو کردووە (BBBB, AAAA,...)، کە ئەویش بەندەکانی ژمارە (١١، ١٤، ١٥، ١٦، ١٧، ١٩، ٢٢)ن. ئەوەش جێگای سەرنجە کە لەم (٧) بەندەدا (٣) بەندیان چوار خشتەکین. [١١] کە بریتین لە بەندەکانی (١١، ١٥، ١٢)، کەوا هەر بەندێك لەسەر بنەمای دوو دێڕی هەڵبەستێکی گۆرانی فۆلکلۆری هەورامان داڕێژراوە، لە بەندەکانی ژمارە (١٩،١٨)دا شاعیر چوارینەکەی بە هونەری (پاش سەروا ـ ڕەدیف) ڕازاندۆتەوە.

## بەشی یەكەم

### ١ـ شیعرییەتی ناونیشان

ناونیشان لە رەخنەی نوێدا لایەنێكی گرینگ لە ستراتیژییەتی تێكست پێك دەهێنێ و دەبێتە دەروازەیەك بۆ چوونە نێو جیهانی هەر تێكستێكی ئەدەبی و، خوێنەر لەوێوە بەرەو رەهەندە نادیارەكانی دەق هەنگاو هەڵدەنێت، بۆیە دەگوترێت ( ( ناڤونیشان وەكو ئێكەم كلیلا دەستبەكاربوونێ دهێتە هژمارتن، تاكو برێكا وێ بشێین، برەنگەكی سیموتیكی نهێنیێن تێكستێ ڤەكەین)). [١٢]

لێرەوە ناونیشان بێجگە لە ئەركی سەرنجڕاكێشان و ئاماژەكردن بۆ خودی تێكست، خۆیشی وەكو بابەت و وەكو تەوەر لە دوتوێی دەقی ئەدەبیدا بەرجەستە دەبێت و رەنگ دەداتەوە، ((بەو پێیەش پێكهاتەی ناونیشان نیشانەكانی سیمۆتیكای زمانە، بۆیە دەبێ لێكۆڵەر خوێندنەوەی تایبەت بۆ نیشانەكان و چۆنیەتی بەكارهێنانیان بكات))، [١٣] تاوەكو لە رێگای كردنەوەی ئەو ئاماژو نیشان گەلە بەرەو شیكردنەوەی تێكستەكە هەنگاو هەڵبگرێت و لە دوا شیكردنەوەشدا دەشێ بگوترێت كە ناونیشان دەبێتە ناسنامەیەك بۆ دەق و ئەو رۆڵە بەجێ دەگەیەنێت. [١٤]

لەم سەرەتایەوە كاتێ ئاوڕ لە رێكەوەندی (یادگار و هیوا)ی تایتلی تێكستەكە دەدەینەوە، خوێنەر رەهەندە شاراوە و پێشبینی كراوەكانی تێكستەكەی بۆ ئاوەڵا دەبێت و دەتوانێت پوختەیەكی چڕوپڕو بە بڕشتی تەواوی دەقەكەی تێدا بدۆزێتەوە. دەبینێ ئەو تایتلە پێكهاتەیەكی زمانی ئیحابەخشەو لە تەك پانتایی دەقەكەدا لە هاوتەریبییەك لە واتاو دەلالەت یەكانگیر دەبێتەوە و بەهۆیەوە بەشێكی دیاری نهێنییەكانی تێكستەكە والا دەبێتەوە.

(یادگار و هیوا) لە ئاستی پێكهاتەیی و نیشانەی زمانییەوە دوو وشەی لێكدراوی ئاساین، واتە لە دوو مۆرفیمی سەربەخۆی سەربەیەك بەشی ئاخاوتن (دوو ناو) پێك هاتووە و لە رێگەی ئامرازێكی لێكدەرەوە بەیەكەوە بەستراونەتەوە. لە رووی پەیوەندی فۆرمەوە هیچ هێمایەكی هاوبەشی لە

نێوانیاندا بەدی ناکرێت. کەچی لە رووی پەیوەندی واتا و دەلالەتەوە ئەوا لە دۆخی (بەرامبەری)دان، هەر ئەمەشە سیحری ناونیشانەکەی پێکهێناوە و هەموو رەهەندەکانی ئاستی واتا و دەلالەتی تێکستەکە لە مەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت و لە دەوری دوو تەوەری سەرەکی لە وێنەی (دوو بوئرەی دەلالی) کۆ دەبنەوە و بەرامبەر بە یەکتری دەوەستن:

١ـ یادگارییەکان وەکو بوئرەی دەلالی ژمارە (١) لە پانتایی تێکستەکەدا چەمك و شکل و شێوەیان بەم جۆرە بڵاوبۆتەوە:

- لە رابردوودا روویان داوەو زەمانیان بەسەر چووە، لە هەندێ دۆخیشدا تا ئێستا کاریگەری و بەردەوامییان ماوە.

- بیرەوەری رۆژانێکە کە گەردو تام و بۆیەکی رۆمانسییانەیان لێ نیشتووە و تیادا ( خۆشی و ناخۆشی، فرمێسك و زەردەخەنە، تاڵی و شیرینی، غەم و شادی،...) ئاوێتە و هاوئامێزی یەکتری بوون.

- یادکردنەوەیان (زیندووکردنەوەیان) سۆزدارەو چێژ بەخشە.

- لە نەست و بیرو هۆشی مرۆڤدا هەمیشە زیندوون و بە دنیای فەرامۆشی ناسپێردرێن.

- هەرە هەست بزوێنەکانیان، یادەوەری رۆژانی منالّی و گەنجی و جوانین.

- شێواز و پەیامی گوتاری شیعری (یادگارییەکان ) لە تێکستەکەدا لە شێوەی ڕستەی (خەبەری) دێن و هەواڵ گەلێك رادەگەیەنن یا بەمانای دروست و واقیعی یاخود بە واتا و مانای مەجازی. (١٥)

- یادگارییەکان رایەڵ و پۆی بەشێکی تێکستەکەیان پێك هێناوە و لەوێنەی جیاجیادا خۆیان نمایش دەکەن و دەردەکەون:

(٩) بێ با بۆت بکەم باسی جوانیم
ڕۆژانی بەرخیم شەوانی شوانیم
کۆرپەی ئازیز بووم شوانکارەی شادی
ژیام بە خۆشی هەتا توانیم
******

(١٠) ژیـــام ســـەردەمێ بـــە کـــەیف و خۆشـــی
بەشـــادی کـــڕین بەخـــــەم فرۆشـــی
تاکـــــو پـــێم کـــرا روومـــەتم مـــژی
تاکـــــو تـــوانیم شـــەرابم نۆشـــی
******

(١١) ئـــەو ســـاکە چـــوومە ریـــزی دڵـــداران
پێـــی وتم ســـەردار هـــۆزی هـــەژاران
((بـــــێ دابنیـــشین جـــەپای دیـــواران
زنجـــیر لـــە گـــەردن چـــون گوناهکـــاران))
******

(١٤) بـــــێ دابنیـــشین جـــەبن چـــناران
لـــە چـــاوی مەســـتی دیـــدە خومـــاران
بـــــەری بـــەیان و ســـەر لـــە ئێـــواران
بـــــادە بنۆشـــین بـــە یـــادی جـــاران
******

(١٥) بـــــێ دابنیـــشین دیـــدە پـــڕ ئەســـرین
تـــۆ بگـــری بـــۆ خـــۆت منـــیش بـــۆ شـــیرین
((وا بـــەهاریش هـــات کـــەژوکۆ رەنگـــین
دڵـــەی عالـــەم شـــاد دڵ خۆمـــان خـــەمگین))
******

لەم وێنانەدا شاعیر رووبەڕووی یادەوەرییەکانی دەوەستێ و ئاوێتـەی ناڵـەی دەروون و رەنـگ و بـەزمی سروشـتیان دەکـات و کـەش و هەوایـەکی شـیعری ئەرخەوانی و دڵکێشیان لێ پێك دەهێنێ.

٢ــ هیـوا و ئـاوات و ئاینـدە بـوئرەی دەلالی ژمـارە (٢) ی تێکستەکەیە کـە چەپکێك واتاو دەلالەتی لێ دەخوێندرێتەوە.

- لە ئایندەدا روو دەدەن، یا چاوەڕێ دەکرێ رووبدەن.
- خۆشی و گەشبینی و ئاوات و ئارەزووەکانی پێوە بەندە.

ـ هۆكارێكە بۆ ژیان و بەردەوامی، مرۆڤ تەمای پێیەتی.
ـ گوتاری شیعری، زمان و شێوازی گرێ و ڕستەی (ئینشائی) بە خۆیەوە دەگرێت و ڕستەكانی لە دۆخی (پرسیار و داخوازی و دوعا و هێڤی و مەرج)دا دادەڕێژرێن.[16]

(٢) بــــێ، هێـــزی ئـــەژنۆم، بینـــایی چـــاوم
ئـــــارامی گیـــــان، جـــــەرگم، هـــــەناوم
یــــاخود بـــە جـــارێ چارەســـەرم كـــە
یـــا لـــە نامـــەی ژیـــن دەربێنـــە نـــاوم
*****
(٤) شــــیرین بــــەهارە بــــەهاری شــــادان
بـــێ بـــەهرەن لـــە ژیـــن گـــەل نـــامرادان
جـــەژن و بـــەهار و ســـەیران و خۆشـــی
گـــشتی پـــیرۆزی گـــەردن ئـــازادان.
*****
(٨) بــــێ دابنیــــشین جــــەبن داری بــــەی
نــــەختێ بنۆشــــین جــــە خۆشــــاوی مــــەی
ئیــــــــنجا بزانــــە كامــــیان جــــوانن
بــەی ڕەنگــی گــەردن، مــەی ڕەنگــی گۆنــەی
*****
(٢٢) پـــــــرشنگی ژیـــــنم وە بیناتـــــەوە
كــــــوورەی دەروونم وە گۆناتــــــەوە
((هەســــتە بێــــرەلام خــــۆر وەپاتــــەوە
دەرمــــــانی دەردم هــــــا وەلاتــــەوە)).

شاعیر چاوی لە كازیوەو بوومەلێڵی بەیانییە، تا خۆری هیواو ئاواتـەكانی لـە كەل دەركەوێ و دنیایەكی پڕ لە بەهارو ئازادی و تاو و ساوی بـۆ بڕەخسێنێ. لـە ڕووی گونجـانی ریـتم و واتـاوە، هـەردوو بزوێنـی درێـژ و كـشاوی (آ) لـە واژەی

(یادگـار)دا وەكـو دوو كۆڵەگـەی زەمـان، هێمـاو دەلالـەتی ڕۆژانـی دوور و درێـژی ڕابردووی سەر ڕێژ لە تاڵ و شیرینی، لە دەروونی خوێنەردا بەرجەستە دەكات. لـە بێژەی (هیوا)شدا دەنگە خشۆك و كپ و نەرمەكانی (هـ)، (ی)، (و)، ئەنجا كرانەوە بـە (آ)ی كشاو، هـەموو ئـاوات و چـاوەڕوانییەكانی ئاینـدەی لێ دەخوێندرێتـەوە، لێرەدا هارمۆنیا و گونجانی ریـتم و واتـای واژەو وشـەكان یـەكێك لـە ڕەگـەزەكانی شـیعرییەتی ناونیـشانەكەمان بـۆ ئاشـكرا دەكـات، لـە پـاڵ ئـەو هێمـاو راڤـە سیمانتیكییانەی لە پێشەوە ئاماژەیان بۆ كرا، تا لە كۆتایی تێكستەكەدا پـەیامگر دەرك بەوە دەكات كە (یادگار و هیوا) وەكو پێكهاتە و تایتل هەر دوو رەهەنـدی بنیاتی دەقەكەی لە خۆ گرتووە و لە كرۆكی دەقەكەشدا هەڵقولاَوە.[١٧]

## ٢ـ شیعرییەتی ئاستی ریتم و ئاواز

### أـ ئاواز:

مەبەست لە ئاواز مۆسیقای دەرەوەی هۆنراوەیـە كـە پابەنـدی كێـشە وەكـو ڕەگەزێكی سەرەكی بنیاتی شـیعری و هـەر ئەویـشە كـە نـەزم و ئاهـەنگێكی چـێژ بەخش و دڵپەسەند لە دەروونی مرۆڤدا بەرپا دەكات. ئـەنجا بـەو هۆیـەوە ئـاوازی هۆنراوە دەبێتـە دیاردەیـەكی دڵكـێش كـە گیـان بـە بـەر وشـە و دەسـتەواژەكاندا دەكات و ئەوەندەی تر مانا و مەبەستەكانیان بەرجەستە دەكات.[١٨]

لە (یادگار و هیوا)دا سیستەمی یەك كێشی (١٠) برگەیی پێڕەو كراوە، ئەمـە وەكـو ڕەسـەنایەتییەك لـە داهێنـان و ئاوڕدانەوەیـەكیش لـە كێـشی رەنگینـی هـۆنراوەی فۆلكلـۆری كـوردی و هونـەرە بـەرز و جوانەكـەی شـاعیرانی ناوچـەی هەورامانـە، كـە بەهـەوڵ و كۆشـشی پیرەمێـردو گـۆران و هاوڕێكـانی روو لـە بووژاندنـەوە بـووە.[١٩] هـەروەها وەكـو نـەریتێكی بەرجەسـتەبووی ئـەو هـەوڵ و هەنگاوانە دەدرێتە قەڵەم لەو ڕۆژگارەدا. ئەمە و هەر (گـۆران) خۆیـشی لـە ڕێگـای دەستنیشانكردنی (پێ)یەكان و (لەنگـەر)ەكانییـەوە، تـەكنیكی فـۆرم و داڕشـتنی ئەم جۆرە هۆنراوەیە دەستنیشان دەكات كە بەم شێوەیە دەبێت:




هەر دێڕێك لە دوو پێی (٥) برگەیی پێك دێت بێ رەچاوکردنی کورتی و درێژی برگەکانی، لە هەر دێڕێکیشدا دوو وەستان هەیە، واتە لە کۆتایی هەر یەکێك لە پێیەکانی وەستان و پیشوودانێك دەبێت، لە رێگەی ئەم وەستانە رێك و بەردەوامانەشەوە، کە هەم وەستانی شیعرین و هەم واتایی، ئاوازی بە دەستهاتوو دەگاتە پلەیەکی بەرزو باڵا. ئەنجا لە کاتی خوێندنەوەدا بەرەچاو کردنی (پێ)و (لەنگەر)ەکانی ئەم کێشە، کە تارادەیەك درێژو شیرین و نەغمەدارە، جۆرە ئاوازێکی جێگیرو رێکخراو سەرتاپای باڵای تێکستەکە دادەگرێت و لە رێگای هاو ژمارەیی برگەکانیشەوە یەکێتییەکی ریتمی دێتە کایەوە، لە شێوەی ریتمێکی دووبارە بووەوەی رێکخراو بە درێژایی تێکستەکە، کە خولقێنەرو بەدیهێنەری رەگەزی چێژی شیعرییە [٢٠]

لێرەوە جوانکاری وشە و گوزارە و کێشی ئاهەنگدارو نەرم و شیرینی (١٠) برگەیی، بەهەماهەنگی لەگەڵ زایەڵەی سەرواى دەنگداری درێژو کشاو، ئەنجا کردە و کۆششی شاعیر لە ناو وێنە و واتاو دەلالەتی رۆمانسییانەدا، کەشێکی دڵگیر و ئیحابەخش و بە هەرمێن لە ناڵە و ئاواز و ریتم بە باڵای تێکستەکەدا دەبرێت، کە حاڵەتی دەروونی شاعیرمان بۆ بەرجەستە دەکات و لەوێشەوە چەکەرە دەکات بۆ ناخی هەناو و دەروونی پەیامگرەوە:

(٧) بێ دابنیشـــین  جەبـن هەنـــاران
كۆڕێ ببەسـتین  چون مەی گوساران
با سـاتێ ناوی  لـــە یـــادا نەبـێ
مەرگی جـوانان  گـــریەی هـەژاران

******

(١٤) بێ دابنیشـــین  جەبن چنـــاران
لە چاوی مەستی  دیدە خومـــاران
بـــەری بەیـان و  سەر لە ئێواران
بـــادە بنۆشـین  بەیـادی جاران

******

(٢١) بـــێ دابنیشـــین  دووربین لە شادی
بمرین بە مەردی و  گـــەردن ئـازادی
بمـرین لە ڕێـگەی  تۆڵـــە ســـەندنا
نەك لەســـەر جێگا  بـــە نامـــــرادی

******

ئـەنجا كـەباس بێتـە سـەر سـەروادارى و كاریگـەرى سیـستەمى سـەروا لـە پەرەپێـدانى هارمۆنیـاى ئـاوازەیى تێكـستەكەدا، پێویـستە لـە بـەرایى نەخـشە ئامارێكى سیستەمى سـەروا لـە دەنـگ و بڕگـەو هێـشووە دەنـگ لـە چـوارینەكانى (یادگار و هیوا) بخەینە روو، تا پەى بە دیاردەكـانى سـەروادارى لـە تێكستەكەدا بەرین:

| بەند | سەروا |
|---|---|
| ١. | آر |
| ٢. | آوم |
| ٣. | آتی |
| ٤. | آدان |
| ٥. | آری |

| بەند | سەروا |
|---|---|
| ١٤. | آران |
| ١٥. | ین |
| ١٦. | آنەوە |
| ١٧. | آران |
| ١٨. | ڵی . من |

| ٦. | یان |
| --- | --- |
| ٧. | آران |
| ٨. | ەی |
| ٩. | آنیم |
| ١٠. | ۆشی |
| ١١. | آران |
| ١٢. | زانا |
| ١٣. | ەنا |

| ١٩. | ینم |
| --- | --- |
| ٢٠. | ەم بێ |
| ٢١. | آوی |
| ٢٢. | آتەوە |
| ٢٣. | ێژم |
| ٢٤. | آردی |
| ٢٥. | ێنی |
| ٢٦. | آر |

خشتەی سەرواداری لە بەندەکانی تێکستی (یادگار و هیوا)

لەم خشتەیەدا دیاردەگەلێکی هونەری سەرواداری شیعری باری سەرنج و تێبینی خوێنەر بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن کە لێرەدا ئاماژەیان بۆ دەکرێت:

أ - شاعیر لە تەواوی بەندەکاندا خۆی لە سەروای تاك دەنگی کۆتایی بواردووە، کە ئەمە لە سیستەمی سەروای هۆنراوەدا دەشێ بە (ئەزعەفولئیمان) ناو ببرێت.

ب - تەنها لە چوار بەندی (١٨ و ٢٦) هەروەها (١٨و ٢٠)دا سەرواکان دوو دەنگین، و تاڕادەیەك کزن، ئەویش بە دوو شێوە مەسەلەی کزی ئاوازەیی لەم بەندانەدا قەرەبوو کراونەتەوە:

١- وشەکانی بەر لە وشە سەروا، لە بەندەکانی (٨ و ٢٦)دا بە پۆلە دەنگی کشاوی (ێ، ی، ێ) رازاوەتەوە، کە ئەمە ئاوازو سەروای ئەم بەندانەی پڕ رەنگتر کردۆتەوە:

(٨) بێ دابنیشین جەبن دا ر ی بەی
نەختێ بنۆشین جەخۆشاوی مەی
ئینجا بزانە کامیان جوانن
بەی رەنگی گەردن مەی ڕەنگی گۆنەی
*****

(٢٦) چـــاوە وەك لێزمـــەی بـــارانی بـــەهار
دڵـــۆپی خوێنـــت بـــۆ پیـــا دێتـــە خـــوار
گریـــــان كـــــردەوەی بـــــێ دەســـــەڵاتە
بێ دەســـــــەڵاتان ئەڕزێن لە ژێـــر بـــــار

٢ـ لە بەندەكانی (١٨ و ٢٠)دا شاعیر پـەنای بـۆ هونـەری پـاش سـەروا (رەدیـف) بردووە، تا ئەندازەی ئاوازەیی دێڕەكان بەرەو سەر ببات:

(١٨) خۆشـــی لـــە عاڵـــەم دوور لـــە دڵـــی مـــن
شـــەونم بـــۆ خـــاران دوور لـــە گـــوڵی مـــن
زنجـــیر پـــیرۆزی دڵ مـــــردوان بـــێ
بـــــا ئـــازاد بـــژی بـــیری سڵـــی مـــن
******

(٢٠) بـادەی مـەی دەبـا فرمێـسكی چـەم بـێ
خـــۆراكی مـــە بـــا هـــەر دەردوخـــەم بـــێ
دوایـــی لـــە خـــوێنی دوژمـــن تێـــر ئـــەخۆین
هەرچـــــــی چۆنێ بێ هەر چەنـــدەكەم بێ
******

وەكو دەبیندرێت سوود لە هاوتەریبی وەرگـیراوە لـە دوا پێـی دێڕەكانـدا بـۆ مەبەستی زەنگینكردنی ئاوازەیی دێڕەكان.

ح ـ لەوە بەدواوە سەرواكان هەرە زۆریـان بوونەتـە هێـشووە دەنـگ، سـێیی: ١٢بەند، چواری: ٨ بەندو، كەمێكی پێنجی: ٢بەند.

ئەوەی بەرهەست و مایەی تێڕامانـە بزوێنـە دەنگـی درێـژو كـشاوی (ێ)، كـە تایبەتمەندییـە ئاوازەییـەكانی لـە شـیعری رۆژهەڵاتیـدا روون و بەرچـاوە، بـە چڕییەكی زۆر باڵی بەسەر وشە سەرواكاندا كێشاوە و بەرێژەی ٦١,٥٪ لە بنیـات و پێكهاتەی وشە سەرواكاندا بەشداری دەكات و لە هەندێكیشیاندا دووبارە بۆتـەوە. ئەنجا ئامادەیی چڕ و بەرچاوی ئەم دەنگە سـەروایە لـە بەندەكانـدا مـۆركێكی لـە

زایەڵـەو ئـاوازی کـشاو و ئـارام و ڕاحـەتی بـە بەنـدەکان بەخـشیوەو تـا ئەوپـەڕی دڵگیری و دڵنەوازی بـردوون و ڕەنگڕێـژی بنـەماکانی جوانکـاری و شـیعرییەتی لـە تەون و کرو ئاکاری تێکستەکەشدا وەبەرهەم هێناوە:

(١١) ئەوســـــاکە چـــــوومە ریـــــزی دڵــــداران
پێـــــی وتم ســــــەردار هــــــۆزی هــــــەژاران
((بـــــێ دابنیـــــشین جــــەپای دیــــواران
زنجـــیر لــــە گــــەردن چــــون گوناهکـــاران))

******

(١٧) بـــــەهار هاتــــەوە خۆشــــی لــــە یــــاران
خۆشـــــی لــــە گوڵـــشەن خۆشـــی لــــە داران
خۆشـــــی لــــــە کـــــۆڕی بــــادە گوســــاران
خۆشـــــی لــــــە بلبـــــل خــــۆشی لــە خاران

**ب ـ ریتم:**

دەبێژن شیعر زمانی دەروونە، یـا دەردی خـاوەنی تێکستەکە خـۆی گوتـەنی ((شیعر تەرجومانی دڵە... کە هەموو کـەس لـە دەمـی خوێندنەوەیـدا شـێوەیەکی دڵــی خــۆی تیــا ئــەبینێ...)) [٢١]، دیــارە لێــرەدا مەبەســت جوولــە و خرپــە و ترپەکەیەتی وەکو یاسا و جوولەیەکی رێکی سروشتی، ئەمە رەگەزێکی میکـانیکی ـ فیزیکی دەرەوەیە لە ریتم، کە لەگەڵ رەگەزی دووەمدا، کە جووڵەی ناوەوەیـە و ـ بیرو هەست و ئەندێشە ـ دەیسەپێنێ و لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دایدەنێ. [٢٢] لەمەوە ریتم جوولەی هەستان و نیشتنەوەی سۆزو خرۆشـانی دەروون و هەسـت و عاتیفەی شاعیرە کە دەبێتە داینەمۆی شیعرییەت لە دەقە ئەدەبییەکاندا.

ریتمی شـیعری بنـچینەکەی (زمـانی شـیعرییە)، کـە لەتـەك ریتمـی مۆسـیقای هۆنراوەدا (کێش و سەروا)، لە پەیوەندییەکی گونجان و هارمۆنیادا یەکانگیر دەبن و یەك دەگرنەوە و ئاوێزانی یەکتر دەبن.

لە تێکستی (یادگار و هیوا)دا رەگەزەکانی ریتمی شیعری لە تێڕوانینێکی زمانەوانی و رەوانبێژییانەدا خۆی لە چەند چەمك و هونەرێکدا نیشان دەدات کە گرینگترینیان ئەمانەیە:

هاوشێوەبوون (دووبارە بوونەوە): لە رەخنەی تازەدا وەکو دیاردەیەکی شێوازگەری سەیر دەکرێت، لە هۆنراوەدا بە مەبەستی جەختکردنی واتا و چڕوپڕکردنەوەی پەنای بۆ دەبرێت، لەگەڵ ئەوەشدا رەهەندێکی ئارایشت و جوانکردن بە دەقەکە دەدا، هەر بۆیەش ((قورسایی بەکارهێنانەکە دەوەستێتە سەر چۆنیەتی ئاخنینی لە نێو دەقدا نەك چەندێتی، لەو رووەش دەست رەنگینی و لێزانی نووسەر دەردەکەوێ کە تا چەند رەونەقی بە دەقەکە بەخشیوە و لەگەڵ واتادا یەکانگیر بووە و پڕ کاریگەرترین دیاردەی بۆ خوێنەر گواستۆتەوە)). [٢٣]

دووبارەبوونەوەی دەنگ و وشە و پێکهاتە:

**أ. دووبارەبوونەوەی دەنگی:**

هۆشی شیعری هەر لە بنەڕەتدا و بە درێژایی مێژووی کاروانی شیعر و هۆنراوە، هۆشێکی ریتماوییە، واتە بارگاوییە بە جوولەی ریتم، شوێنەوارەکانی ریتمی شیعریش لە دەرەتانی ئەو پاتەبوونەوە و هاوشێوەبوونی دەنگییانەوە سەر هەڵدەدات کە لە بنیاتی هەموو دەقێکی شیعری ڕەسەندا هەیە و جۆرێك لە وێنەی ریتمی تێدا دەدرەوشێتەوە. [٢٤] دووبارەبوونەوەی دەنگی لەسەر ئاستی دێڕە شیعردا تێبینی دەکرێت، دیارترین دەرکەوتەی دەنگی هەر دێڕە شیعرێکیش بریتییە لە دەنگە سەروا، سەروا سازی خۆی یەکێکە لە بنچینەکانی هۆنراوە و لە ئاستی مۆسیقای دەرەوەدا شیکاری بۆ دەکرێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەوا سیستەمی سەرواسازی ئاستێکی دابڕاوە لە ریتم و لەم بوارەدا حسابی بۆ ناکرێت، بەڵکو سوود وەرگرتن و وەبەرهێنانی باش لە بواری کێش و سەروادا، وەکو سەروای ناوخۆیی و گواستنەوەی سەروا بۆ ئاستی هێشووە دەنگ و پیتاندنی بە هەندێ دەنگی تایبەت لایەنی ریتمی و جوانکاری و شیعرییەتی هۆنراوە بەهێز دەکات.

ئێمە لێرەدا بەمەبەستی ئاشکراکردنی لایەنی ئاوازەیی لە هاوشێوەبوونی دەنگی و پەیوەندی بە واتا و دەلالەتەوە، تەنها ئاوڕ لە دەرکەوتە سەرەکییەکە، بە واتا تەکنیکی سەرواداری و سەروای ناوەوە دەدەینەوە.

- هاوشێوەبوون لە سیستەمی سەروای هەردوو بەندی (١ و ٢٦ - دەستپێك و کۆتایی) تێکستەکەدا هەیەو هەردووکیان لە سەربنەمای جووتە دەنگی (ێر) دامەزراون، ئەمە جۆرێکە لە سیستەم و جوانکاری شیعری.

- بەندەکانی (٧، ١١، ١٤، ١٧) لە سەرواداریدا هاوشێوەن و هەموویان لەسەر بنەمای پۆلە دەنگی (آران) دامەزراون.

ــ لە کۆی (٢٦) بەندی تێکستەکەدا، ڤاولی کشاوی (آ) بۆتە کۆڵەکە و بەشداری لە پێکهاتنی هێشووە دەنگە سەروای (١٨) بەنددا کردووە و لە (٦) بەندیش زیاتر لە جارێك پاتە بۆتەوە، ئەم چڕی هاوشێوەییە ئاوازو دەلالەتی وشە سەرواکانی زیاتر برەو پێداوە.

ــ ڤاوڵە کشاوەکانی دیکە (و ، ی)، بەشدارییەکی چالاکیان نواندووە لە داڕشتنی وشە سەروای (١٧) بەندو کورتە ڤاولی (ە) لە (٥) لە بەندەکانا بەدی دەکرێ.

بە کورتی هەرسێ ڤاوڵە درێژە کشاوەکانی (آ ، و، ی) باڵیان بەسەر سیستەمی سەروابەندی لە تێکستەکەدا کێشاوە، کە ئەمەش هەم نیشانەی کاریگەری زاڵی شیعری ناوچەی هەورامانە کە سەرلەبەری تێکستەکەی ڕەنگ کردووە و هەمیش بۆ کەشی رۆمانتیکیانەی خەماوی و حەسرەتباری دەروونی شاعیریش دەگەڕێتەوە، کە لە رووی شیعرییەت و ستاتیکاو کاریگەرییەوە تێکستەکەی چالاك کردووە. [٢٥]

پێویستە ئەو لایەنەش لە هاوشێوەبوونی دەنگی (فونیمی) نیشان بدەین کە لە رێکەوەند و سیاقی دێڕ و لەتە دێڕەکاندا بەدی دەکرێت و جۆرێك لە سەروای ناوخۆیی پێکهێناوە و لە ئاکامدا بە سوودی بالابردنی ئاوازو رێتمی هۆنراوەکەدا شکاوەتەوە و ئاستی جوانکاری و بنیاتی شیعرییەتی لە بەندەکاندا تۆختر کردۆتەوە، وەك لەم چەند نموونەیەدا بە دیار دەکەوێت:

(٢) بــێ هێــزی ئــەژنۆم، بینــایی چــاوم
ئــارامی گیــان، جــەرگم، هــەناوم
یـا خـود بـە جـارێ چارەسـەر م كـە
یـا لــە نامــەی ژیــن دەربێنــە نــاوم
******

(٣) ژیــان بــەلاتی و بــێ دەســەڵاتی
هــیچ درۆی نــەبی سـەد مەرگەسـاتی
مــرۆ بــە دیلــی بــژی خۆشــە یــان
بمــرێ بــۆ بــەرزی خــۆی و ولاتــی
******

(٤) شــیرین بــەهارە بــەهاری شــادان
بــێ بــەهرەن لــە ژیــن گــەل نــامرادان
جــەژن و بــەهارو ســەیران و خۆشــی
گــشتی پــیرۆزی گــەردن ئــازادان
******

(٥) بــێ دابنیــشین جــەبن هــەناران
كــۆڕێ ببەســتین چــون مــەی گوســاران
باســاتێ نــاوی لــە یــادا نــەبێ
مــەرگی جوانــان گریــەی هــەژاران
******

(٩) بــێ بــابۆت بكــەم باســی جــوانیم
ڕۆژانــی بــەرخیم شــەوانی شــوانیم
كۆرپــەی ئـازیز بـووم شـوانكارەی شـادی
ژیــام بە خــۆشی هــەتا توانیم

بێ گومان لە زۆر لایەن و گۆشەنیگای دیكەوە دەشێ ئەم دیاردەیە بخرێتە ژێر تیشكی باس و لێ وردبوونەوە.

**ب . دووباره بوونەوەی وشه:**

وەك له پێشەوه گوتمان دووباره بوونەوەی وشه له رەخنەی نوێدا لـه ئـەركی جەختكردنەوەو دڵنیایی شاعیر و نووسەرەوه تێدەپەڕێ بۆ چەند بـوارو رەهەنـدی دیكه كه پەیوەستن بـه تـەكنیك و جوانكـاری و شـیعرییەتەوه، شـاعیر لـه هـەوڵی ئەوەدایه دەلالەتەكانی مەبەست و ئیجا له نێو تێكستەكەیدا چڕ بكاتـەوه و گـوڵاو پژێنی تامو بۆی شیعرییەتی بكات، هەر بـەو نیازەشـەوه وەكـو تێبینـی دەكرێـت، دووباره بوونەوەی وشه و پێكهاته له تێكستی (یادگار و هیـوا)دا چەشـن و جـۆری فرەی وەرگرتووه، لێرەدا بەخێرایی هەندێ لایەنی بەسەر دەكەینەوه:

(٢) بـــێ، هێـــزی ئـــەژنۆم بینـــایی چـــاوم
ئـــارامی گیـــان، جـــەرگم، هـــەناوم
یـــاخود بـــه جـــاری چارەســـەرم كـــه
یـــا لـــه نامـــەی ژیـــن دەربێنـــه نـــاوم
******

(٣) ژیـــان بـــه لاتـــی و بـــێ دەســـەڵاتی
هـــیچ درۆی نـــەبێ ســـەد مەرگەســـاتی
مـــرۆ بـــه دیلـــی بـــژی خۆشـــه یـــان
بمـــــــرێ بۆ بەرزی خـــــۆی و وڵاتـــی
******

(٤) شـــــیرین بـــــەهاره بـــــەهاری شـــــادان
بـــێ بـــەهرەن لـــه ژیـــن گـــەل نـــامرادان
جـــەژن و بـــەهارو ســـەیران و خۆشـــی
گشـــــــتی پیرۆزی گـــــــەردن ئـــازادان

ـ وشەی (ژین)، له چەند دۆخی جیاوازی (ژین، ژیان، بژی، ژین) لەم بەندانەدا هاتووه، هەروەها لـه بەنـدی (٦) مـەژی ـ ژیـان، بەنـدی (٩): ژیـام، بەنـدی (١٠) ژیـام، بەنـدی (٢٤): ژیـان، هـاتووه و هاوشـێوەبوونی وشـەیه، كـه پەیوەنـدی گەردانكردن (إشتقاقی) كۆیان دەكاتەوه و هەموویان له یەك چاوگەوه داكەوتوون، هێمایه بۆ گوڕوتین و تەوژمی زیندەگی مرۆڤ.

ـ لە بەندی (٤)دا وشەی (بەهار) سێ كەڕەت دووبارە بۆتەوە، ئەنجا لە بەندەكانی (٥، ١٥، ١٦، ١٧، ٢٦) دا وشەكە ئامادەگی هەیە، كە ئەمە هێمای تۆخكردنەوەی دەلالەتی خۆشترین وەرزی ساڵ و تەمەنە.

ـ وشەی (شیرین) لە بەندەكانی (٤، ٥، ١٩، ٢٣، ٢٥) دا چەند بارە بۆتەوە، لە ڕێژەی ناوی (موخاتەب) و ئاوەڵناوی دیارخەردا، شیرین لە تەوەری جێنیشینی لە بری ناوی (یار) یان (گەل و وڵات)، یا وەكو (ڕەمزی ئازادی و سەربەستی) خواستراوە و ڕادەی سەودایی پابەندبوونی شاعیرمان بەم مەسەلانەوە بۆ دەخاتە ڕوو.[٢٦]

ئەوەی تا ئێرە باسمان لێوەكرد دەچێتە خانەی دووبارە كردنەوەی یەك فۆرمی زمانی (وشەیەك)، كە بە هەمان چەمك و واتا بۆ مەبەستی جۆراو جۆر و لە شوێنی جیاجیادا دووبارە بوونەتەوە.[٢٧]

ـ ڕەگەز دۆزی: دووبارە كردنەوەی وشەیە، بە هەمان فۆرم، وەلێ بە واتای جیاواز، ئەمەیان ڕەگەزدۆزی تەواوە، كە وشەكان لە فۆرم و هاوشێوەبوونیان تۆزێك جیاوازییان دەبێت، دەبێتە ڕەگەزدۆزی ناتەواو، لە تێكستەكەدا ئاوڕێك لەم لایەنە دەدەینەوە:

بەندی (١)، بەد: بەدكار

ب (٤،٢)، بێ : بێ

ب (٣) ، لات: سات

ب (٦)، ژیان: گیان: زیان

ب (٧)، هەناران: هەژاران

ب (٨)، بەی: مەی: گۆنەی

ب (٩)، جوانیم: شوانیم : توانیم

ب (١٠)، خۆشی : فرۆشی: نۆشی

ب (١١)، ریزی : هۆزی

ب (١٢)، ڕەزانا: خەزانا: دزانا

ب (١٥)، ڕەنگین: خەمگین

ب (١٦)، وەسەیرانەوە: وەحەیرانەوە

ب (١٦)، نیگارانەوە: هوزارانەوە

ب (١٧)، یاران: داران: خاران

ب (١٨)، دڵی من: گوڵی من

ب (٢٠)، مەی: مە

ب (٢٠)، چەم بێ: خەم بێ: کەم بێ

ب (٢٢)، وەبیناتەوە: وەگۆناتەوە

ب (٢٣)، بچێژم: بڕێژم: بنێژم

ب (٢٤)، سپاردی: ناردی: ساردی

ب (٢٥)، شوێنی: بمێنی: شوێنی

ئەو لایەنە بەرچاوانەی رەگەزدۆزی کە لە بەندەکانا هاتوون و دەستنیشانمان کردوون، زۆرینەیان رەگەز دۆزی نا تەواو و لە وشە سەرواکاندا بەدی دەکرێن، ئەمەش جۆرێکە لە هونەر و شێوازی شیعری، کە لە خزمەتی هاوسەنگی دەنگی و ریتمی سەرواداری بەندەکاندایە کە ئامانج و نیازی نووسەری تیادا دەردەکەوێ و بەهایەك بە گوتنەکان و چۆنایەتی هاتنیان دەدات و کەرەسەیەکی سوودمەندیشە بۆ شیعرییەت.[٢٨]

## بەشی دووەم

**شیعرییەتی ئاستی پێکهاتەیی:**

رەخنەی تازە لە یەکەم هەنگاویدا پێ لەسەر بەرهەمی زمانی بوونی هەر تێکستێکی ئەدەبی (شیعری و غەیرە شیعری)دا دەگرێت، ئەنجا بە شوێن چۆنیەتی خولقاندنی مانا لە رێگای رەهەندەکانی زمان و شێوازو دەربڕینەوەدا دەچێ. بەو پێیە شیعرییەتی زمان و پێکهاتە لە هەر تێکستێکی ئەدەبیدا پەیوەستە بە چۆنیەتی بنیاتنانی زمانێکی تایبەت (لە پێکهاتە و ڕستەو دەستەواژە) کە لە زمانی ئاسایی و ڕۆژانە (ئۆتۆماتیك) دوور بکەوێتەوە، لێرەوە ئەندازەی لادان و پالاوتەبوونی زمان دەبێتە بنەمایەکی حاشا هەڵنەگری ڕادەی شیعرییەت و بەرهەمهێنانی لە پانتایی دەق و تێکستدا.

لە (یادگار و هیوا) دا لە پێناو چڕکردنەوەی واتادا، لە پاڵ خەیاڵبازی و وێنەو فانتازیای شیعری، کارکردن لە ناو زماندا بەرچاوە و بۆ ئەم مەبەستە لا لە گەڵ هونەری شێوازو جۆری دەربڕین کراوەتەوە، لە وێنەی" کورتبڕی، بەهەڕمێنبوونی بەشێکی ئاوخاتن (ئاوەڵناو)، ئاوێزانکردنی شێوەزار، دژ یەك و بەرامبەری و هاو واتایی و... تاد.

لەم بەشەدا لە هەوڵی ئەوەدا دەبین هەندی لایەنی ئاستی پێکهاتەیی تێکستەکە بخەینە روو:

أ ـ شیعرییەت لە دەربڕین و ڕستەکانی تێکستدا، لە شیعرییەتی وشەکانیدا سەرچاوە دەگرێت، یەکێك لەو بەشانەی ئاوخاوتنیش کە رۆڵێکی دڵپەسەندی ئەکتیڤ و بەرچاوی هەیە لە دەقی شیعری لیریکیدا ئاوەڵناوە. ئاوەڵناو جۆرێك لە جوانکاری و شیعرییەت بە تێکست دەبەخشێت و چەندیش ڕادەی لادان و دوورکەوتنەوەی لە ئاخاوتنی ئاسایی رووەو بالآیی بڕوات، بەو ئەندازەیەش بیری پەیامگر بۆ واتایەکی قووڵتر، یان فراوانتر، دەگوازێتەوە و ڕادەی شیعرییەتیش بەرزتر دەبێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە با سەیری رۆڵی ئاوەڵناو لە سازاندنی واتادا لە بەندی (١) بکەین:

| | |
|---|---|
| (١) لەبەر چاوی بەد | لە ترسی بەدکار |
| دلّ خۆم ئەکەمە | گۆڕی یادگار |
| بەگریانی وشك | بە نالّەی بێ دەنگ |
| دێنمە لە رزین | تەختی کرد گار |

******

- لەبەر چاوی بەد........ (١)
- بەگریانی وشك..... (٢)
- بە نالّەی بێ دەنگ... (٣)

رادەی لادان و ناسائایی بوون لە (١)دا زۆر نییە، چونکێ ئەم جۆرە وەسفە (چاوی بەد) لە ئاخاوتنی ئاساییشدا بەدی دەکرێت، شاعیر وشەی (پیس)ی گۆڕیوەتەوە بە (بەد) بۆ مەبەستی تایبەتی، کە ئەمەش جۆرە لادانێکە لەسەر تەوەری هەڵبژاردن. وەلێ لە هەر دوو پێکهاتەی (٢)، (٣)دا لادان گەیوەتە ڕادەیەکی ئاسایی، هەر ئەمەش خوێنەر دووچاری رامان و قووڵبوونەوە دەکات لە واتاو ئاماژەکانی پشتەوەی دەربڕینەکان، گریان" ئاسایی بە فرمێسکی تەڕو شێدارەوە بەستراوەتەوە، نالّەش" بەبانگ و ئۆف و ئازار، کەچی شاعیر ئەم ڕێوڕەسمەی تێك شکاندووە و وەسفێکی دیکە (گریان و نالّە)مان بۆ دەخاتە ڕوو لە ڕێگەی دوو ئاوەڵناوی ناگونجاو و نا تەبا، بەڵام کاتێ خوێنەر بۆ دەربازبوون لەو دۆشداماوییە بەرەو دوا بۆ دێڕەکانی بەرایی دەگەڕێتەوە:

| | |
|---|---|
| لەبەر چاوی بەد | لەترسی بەدکار |
| دلّ خۆم ئەکەمە | گۆڕی یادگار |
| بە گریانی وشك | بە نالّەی بێ دەنگ |
| دێنمە لەرزین | تەختی کرد گار |

ئەنجا سەری هەوداکەی بۆ دەدۆزێتەوە و گرێ کوێرەکەی بۆ دەبێتەوە، بەمەش لە ئاست داهێنانی شاعیر شاگەشکە دەبێت. لەسەر ئەم ڕێرەوە لە درێژەی بەندەکانی تێکستەکەدا ئاوەڵناوەکان کەڵەکە دەبن و زێتر هەست و سۆزی خوێنەر دەبزوێنن، کەم وایە بەندێکی تێکستەکە دەدۆزینەوە کە ئاوەڵناو

وەکو گوڵـەمێخ و کانیلـە، سـۆزبزوێن و گوڵاوپـژێنی نـەکردبێت، تەنانـەت وا هەیـە ئاوەڵناو هورژم دێنێ و جەستەی بەندەکە داگیردەکات:

(١٧) بـــە هـــار هاتـــەوە خۆشـــی لـــەیاران
خۆشـــی لەگوڵـــشەن خۆشـــی لـــەداران
خۆشـــی لـــە کـــۆڕی بـــادە گوســـاران
خۆشـــی لـــە بلبل خۆشی لە خـــــاران

لەمەدا تێرم و تێگـەی (خۆشـی)، دەبێتـە مۆتیڤێـك وچـەتری بـەزم و شـادی بەسـەر ناوەکانـدا (یـاران ، گوڵـشەن، داران، بادەگوسـاران، بلبـل، خـاران) دا هەڵدەدا. بەو ئەندازەیەی کە (خاران= دڕك و داڵەکان)یش کە بڕێك نـا ئاشـنایی و دڕدۆنگیشی تێدایە، بە شایی و هەڵپەڕکێ کەوتوون.

لە درێژەی بەندەکاندا زۆرینـەی ئاوەڵناوەکـان ڕێـژەی ئاوەڵنـاوی کـۆ یـاخود ئاوەڵناوی لێکدراوی کۆیان هەیە و زیاترمانای حاڵ دەبەخـشن و بـەو واتایـەی کـە بەردەوامییان نییەو کۆتاییان دێ، [٢٩] ئەوە هیچ کـە بەخـستنە پـاڵی (ان) رادەی ئاوازەیی وشە و پێکهاتـەکان زیـاتر بـووە، بـەڵام تـۆ بڵێـی شـاعیر لـە هێنانـەوەی (شـادان، گـەل نـامرادان، گـەردن ئـازادان، هـەژاران، دڵـداران، گوناهکـاران، مـەی گوساران، دڵ مردووان، بێ دەسەڵاتان و... تاد) پێمان بڵێ کە سـتەم و بـێ دادی حاڵـەتێکی راگـوزارەو ئـەمڕۆ یـا سـبەی هـەر کۆتـایی دێ؟ هـەر بـەو شـێوەیە دەبیندرێت کە پەرەسەندنی ئاوەڵناو لە ڕایەڵ و پـۆی تێکستەکەدا بووەتـە مـاکی داهێنانی سۆزو جوانکاری و شیعرییەت.

## ب. شیعرییەتی شێوەزار:

(یادگارو هیوا) تێکستێکی چوارینە بەندی لیریکی عاشقانەیە، لە رووی وێنەو زمـان و دەربڕینـەوە ئـاوێزانی شـێوەزارو سـامانی ئـەدەبی رەسـەنی کـوردەواری دیالێکتی کوردی خواروو (گۆران) بووە.

ئەم کاریگەری و تێکهاڵاوییە لە چەند ڕوویەکەوە بەدی دەکرێت:

ـ لە باری قالب و فۆرمی شیعرییەوە شوێن پێی کێشە هەرە باوەکەی شیعری ناوچەی گۆرانی هەڵگرتووە.

ـ شێوەزاری هەورامان باڵاپۆشی بنیاتی زمان و داڕشتنی شیعری تێکستەکە بووە و لە شێوە و شوێنی جیاوازدا خوێنەر بە ئاسانی دەرکی پێ دەکات.

ـ تارمایی شێواز و گیانی شیعری مەزن شاعیرانێکی لیریکی وەکو (بێسارانی ـ مەولەوی)، لە کرو ئاکارو روخساری بەند و چوارینەکانی تێکستەکەدا بە روونی وەبەرچاو دەکەوێ.

ـ شیعری گۆرانی فۆلکلۆری، بە تایبەتی شیعری گۆرانییەکانی ناوچەی کرماشان، لە چەند شوێندا ئاوێزان و تێهەڵکێشی چوارینەکان کراون و لە شێوەی چوارخشتەکی ئاوازەدار و ناسکدا بەندەکانی تێکستەکەیان رازاندۆتەوە. [٣٠]

وەك چۆن لە تێکستەکەدا دوو دێڕی پاشبەندی چوارینەکانی (١١، ١٥، ٢٢)، بەنیشانەی وەرگرتن خراونەتە نێو دوو جووت کەوانەوە، بەشێوەیەك کە بە جۆرێك لە کارلێك و یەکرەنگی و ئاوێتەبوونی نێوان تێکستی (Con text) لە نێوان داهێنانی شاعیر و سامانی مێژوویی کەلەپووری ئەدەبی میللیدا پێکهاتووە. [٣١] وەك دەبینین بەندی (٢٤)یش دوو دێڕی پێشبەندەکەی لە فۆلکلۆر هەڵێنجراوە و دوو دێڕی شاعیری لەگەڵدا گونجێندراوە: [٣٢]

(٢٤) ((ئەوا تۆ ئەڕۆی بە خوام سپاردی
بە خۆم پێم نەکرا دڵەکەم بۆ ناردی
رێی ژیان سەختە بەترس و لەرزە
نابێ بترسی لە گەرمی و ساردی))

بەم رەنگە شاعیر نەك هەر لە سامانی بەیت و بەندو گۆرانی فۆلکلۆری کوردی بێ ئاگا نەبووە، بەڵکو هونەرمەندانە سوودیشی لێ وەرگرتوون و بیرو هەستی خوێندەوارانی کوردیشی پێ زاخ داوەتەوە و کردوونیشی بە سەرچاوە بۆ سازدانی وێنەو دیمەنی جوان و شیرین و بە سۆز لە تێکستەکەیدا. [٣٣]

**ج ـ دژیەك و بەرامبەری:**

بەرامبەری یاخود دژیەك هونەرێكی جوانكارییە و كاریگەرییەكی تایبەتی هەیە، ئەو كاریگەرییە لە كۆكردنەوەی ئەو دژانەوە پەیدا دەبێ كە وێنەیەكی زەینی و هونەری پێچەوانە دەسازێنێ و هاوسەنگی دەخاتە نێوان عەقڵ و ویژدانی خوێنەر و ئەنجا چاكی و جوانییەكەی دەردەكەوێ و لە دژەكەی جوێی دەكاتەوە، ئەنجا ئەم شێوازە هاوسەنگییە بەراورد ـ كارییە كاریگەرییەكی قووڵ لەسەر هەست و هۆشی خوێنەر بەجێ دێڵێ. [٣٤]

لە دژیەكیدا دوو جۆرە دەبیندرێ:

**أ ـ دژیەكی ئەرێنی:** كە وشەكان كتومت دژیەك و بەرامبەرن، ئەنجا سەر بە هەر كەرتێكی ئاخاوتن بن، وەك:

شەو × رۆژ، جوان × ناشیرین

هات × چوو، ژیان × مردن

**ب ـ دژیەكی نەرێنی:** ئەو بەشەیان دەگرێتەوە كە وشەكان یەك چاوگیان دەبێ و لەرێگە ئامرازی (نەرێ ـ نەفی)یەوە بەرامبەرو دژیەك دەوەستن وەكو:

هات × نەهات ، خۆش × ناخۆش

دەنگدار× بێ دەنگ ، باشە× باش نییە

بە ئاوڕدانەوەیەك لە تێكستەكە فۆرمەكانی بەرامبەری بەم شێوەیە بە دیار دەكەون:

ب٣: بژی× بمری

ب٦: مردن × ژیان، قازانج× زیان

ب٩: ڕۆژانی× شەوانی

ب١٠: شادی × خەم، كڕین × فرۆشتن

ب١٤: بەیان × ئێوارە

ب ١٥: شاد × خەمگین

ب١٧: خار× گوڵ

ب٢١: ئازاد × نامراد

ب ٢٤: گەرمی× ساردی

لە كری تێكستەكەدا وشە دژەكان جۆرێك لە هاوتەریبی و بەرامبەریان لە پێكهاتەی ڕستە و بەندەكاندا و، لە ئاكامیشدا لە تێكستەكەدا سازاندووە، كە ئەمەش جۆرێك لە دووانەیی (دوالیزم) لە مێشكی خوێنەر دێنێتە كایەوە و كاریگەری لەسەر دەروونی دەبێ، وێڕای كاریگەری لە ڕووی جوانكارییەوە، كە ئەمەش ڕێگە خۆشكەرێكە بۆ بنەماكانی شیعرییەتی سەرلەبەر تێكست و كرانەوەی بەڕووی خوێنەردا.

**د. هاوواتایی:**

لە هاوواتاییدا وشەكان لە باری فەرهەنگییەوە دەقاودەق هاوواتای یەكتر دەبن، بە واتای بە گوێرەی تیۆرەكەی یاكۆبسن وشەكان لە سەر تەوەری جێنشینی دەتوانن شوێنی یەكتر بگرنەوە، بەڵام لەهاوواتای ئاسادا وشەكان لە ڕووی واتاوە لە یەكتر نزیكن لەگەڵ ئەوەیدا فۆرمی جیا جیایان دەبێت، واتە دەچنە نێو یەك كێڵگەی واتایەوە (Semantic Field).[٣٥] ئەم دوو چەمكە لە بنەچەدا دیاردەیەكی شێوازگەرییەو وەكو نیشانەیەكیش بۆ دەوڵەمەندی زمان و شێوازی شیعری تێكست حسابی بۆ دەكرێت. لە (یادگارو هیوا) دا، ئەم فۆرمانەی وشە لە زۆربەی بەندەكانا ئامادەن بە شێوەی جۆراو جۆر:

ب١: بەد: بەكار ⟵ هاوواتا (هـ.و)

گریان : ناڵە ⟵ هاو واتا ئاسا (هـ.و. ئاسا)

ب٢: جەرگ: هەناو ⟵ هـ . و . ئاسا

ب٣: لات: بێ دەسەلات ⟵ هـ . و . ئاسا

ب٤: بێ بەهرە: نامراد ⟵ هـ . و . ئاسا

جەژن: بەهار: سەیران: خۆشی ⟵ هـ . و . ئاسا

ب٦: مەژی: بمرە ⟵ هـ . و . ئاسا

دڵ: گیان ⟵ هـ . و . ئاسا

ب٧: دابنیشین: كۆڕێ ببەستین ⟵ هـ . و . ئاسا

ب٩: بەرخ: كۆرپە ⟵ هـ . و . ئاسا

ب١٠: كەیف: خۆشی / گفت: گۆ ← هـ. و

ب١٣: دار: دەوەن ← هـ.و

ب١٤: چاو: دیدە / مەست: خومار ← هـ. و

ب١٥: كەژ : كۆ ← هـ. و

ب١٦: لێ لێ :لۆ لۆ / لەنجە : لار ← هـ. و

ب١٦ـ ١٧: هوزار: بلبل ←

ب١٩ : زام : برین / هیوا : ئامانج ← هـ. و

ب٢٠: بادە : مەی / دەرد: خەم ← هـ. و

ب٢٣: جوان : گەنج ← هـ. و

ب٢٤: ترس: لەرز ← هـ. و

لە نێوان ئەم دەستە وشە و پێكهاتە زمانییانەدا كە پەیوەندی هاوواتا ئاسایی كۆیان دەكاتەوە، زۆرینـەیان لـە تێكستەكەدا لـە شـێوەی دووانـە یـاخود جووتـە وشەی پەیوەستدا هاتوون، لە وێنەی:

ـ لاتی و بێ دەسەڵاتی ـ جەژن و بەهار ـ سەیران و خۆشی ـ كەیف و خۆشی ـ گفتوگۆ ـ دارو دەوەن ـ كەژو كـۆ ـ لێ لێ و لۆلـۆ ـ لەنجـەو لار ـ زام و بـرین ـ بـادەو مەی ـ دەردو خەم ـ جوانی و گەنجی ـ

ـ ترس و لەرز.

## بەشی سێیەم

## شیعرییەتی ئاستی دەلالی

مەبەست لە دەلالەت چەمك و واتا و ناخ و ناوەڕۆکە، مەسەلەکە لە بنەڕەتدا بریتییە لەوەی کە چۆن دەتواندرێت بە هۆی زنجیرەیەك لە دەنگ و قسە و ئاخاوتن پەیامێك رابگەیەندرێت یا ڕابگوێزرێت، [٣٦] ئەم ئاستە ئاستێکی فراوان و گشتگیرە و لایەنەکانی ئاستی پێکهاتەیش لە خۆ دەگرێت وەك چۆن لە هونەرەکانی دژیەك و بەرامبەری و هاوواتایی بینیمان، هەروەها مەسەلەی ئاوازو ریتمیش لە زۆر رووددا بەرەو دەلالەت و واتا دەکشێن، بۆیە هەموو ئەمانە هێما و دەلالەتی قووڵی شیعرایەتییان تێدا بەرجەستە دەبێت، لە بەشەکانی پێشوودا بە ئەندازەی پێویست تیشکمان خستە سەر بەشێکی ئەو لایەنانە و لێرەدا لەنگەری بایەخ رووەو چەند بابەت و هونەر و چەمکێکی دیاریکراو دەبەین کە ئەویش بریتی دەبن لە رۆڵی هونەرەکانی تەدویرو هاوتەریبی و وێنە و میتافۆر لە بەرجەستەکردنی واتا و دەلالەتی تێکستەکەدا.

**أ. هونەری تەدویر:**

تەدویر، لە بنیاتی تێکستی شیعری نوێدا ئەرکێکی گرینگ جێبەجێ دەکات، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە دەشێت سەرلەبەری دەقێکی شیعری، یا بەشێکی، لە شێوەی ڕستەیەکی گەورەکراودا بەسەر یەکەوە رێك بخەینەوە، لە پاڵ ئەوەیدا کە تەدویر وەك هونەرێکی شیعری، هەم ئاستی مۆسیقی تێکست رەنگا و ڕەنگ دەکات، هەم ترپەو ئاهەنگی ریتمی تێکستەکە دەبزوێنێ، هەمیش پەیوەندی ئۆرگانیکی لە نێوان سۆزو بیرۆکەی پارچە و بەشەکانی تێسکتدا بە شێوەیەکی زیندوو ڕادەگرێت. [٣٧]

لە تەدویردا مەبەست و فەلسەفەیەکی تایبەتی بەدی دەکرێت، کە ئەویش بەردەوامی و درێژە پێدانی حاڵەتێکە لە هەڵچوون و سۆز و دەلالەت، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ سروشت و پێداویستییە هونەرییەکانی ئەزموونی شیعریی شاعیر، هەوڵ دەدەین سیماکانی هونەری تەدویر لە (یادگار و هیوا)دا لە چەند رووبەکەوە نیشان بدەین، دوو بەند بە نموونە وەردەگرین بەم جۆرە:

(٢) بـــێ، هێـــزی ئـــەژنۆم بینـــایی چـــاوم
ئـــارامی گیـــان، جـــەرگم، هـــەناوم
یـــاخود بـــە جـــاری چارەســـەرم کـــە
یـــا لـــە نامـــەی ژیـــن دەربێنـــە نـــاوم

****

(٣) ژیـــان بـــە لاتـــی و بـــێ دەســـەلاتی
هـــیچ درۆی نـــەبێ ســـەد مەرگەســـاتی
مـــرۆ بـــە دیلـــی بـــژی خۆشـــە یـــان؟!
بمـــری بۆ بـــەرزی خـــۆی و ولاتی؟

لە سەرەتادا بە مەبەستی یەکالا کردنەوەی هەر یەکێك لە بەندەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ، بە گوێرەی (رووکاری سەرەوە) پێویستیمان بەشیکارییەك دەبێت لە ئاستی زمانی و واتاییەوە:

(٢) (بێ ـ تکا دەکەم وەرە ـ ئەی هێزی ئەژنۆو بینایی چاو و ئارامی گیان و هەناو!، یا ئەوەی بە جاری چارەسەرێکم بۆ بدۆزەرەوە، یا بە یەکجاری گیانم لێ بسێنەرەوە لەم ژیانە پڕ لە دەردو مەینەتییە رزگارم بکە)، (٣) (ژیانێك ـ بەم جۆرە بێ و بەلێقەوماوی و بێ دەسەلاتی بێت، راستییەکەی ئەوەیە، مەرگ لێی خۆشترە، مەرگێك سەر بەرزانە بێ و لە پێناوی گەل و ولاتدا بێت، سەد بار لە ژینێکی پڕ لە دیلی و زەلیلی چاترە).

وەك دەبینین تەنانەت پێویستیمان بە ئامرازێکی پەیوەندی و لێکدەریش نابێت لە وێنەی (چونکە ـ لەبەر ـ ئەوەی ـ بەو هۆیەی...) تا هەر دوو بەندەکە لە رووی زمان و واتاوە یەك بخەین، یا بەیەکەوەیان گرێ بدەینەوە!، چونکێ (ژین)و (ژیان)، چەشنی کلیلە وشە لە هەردوو بەندەکانا، ئەم رۆڵە لێکدەرو پەیوەستەیان پێ سپێردراوە و دەشێ هەر دوو بەند بەسەریەکەوە لێکبدرێت و وەکو یەك پەرەگراف و یەك دەق بخوێندرێتەوە، بێ ئەوەی هەست بە هیچ جۆرە لادانێکی زمانی یا سیمانتیکی بکەین، ئەم رێڕەوە واتە یەکێتی بنیاتی سیمانتیکی و دەلالی بێ پچڕان، لە تەك گەشەسەندنی تێکستەکە و بە دوای یەکتردا هاتنی بەندەکان،

بەردەوامی هەیە و پەیتا پەتیا شۆڕ دەبێتەوە و پەرە دەسێنێ و، لق و پەل و پۆی جوان و ناسك و تازەش دەردەكات و پەرەسەندنی و واتایی) لێ دەكەوێتەوە، تا ئەوەش هێڵی واتاو مەبەستە سەرەكییەكەمان لێ ون نەبێت و نە ئاڵۆزكێ، ناوە ناوە شاعیر دەمانگێڕێتەوە بۆ هەمان مەبەستی بنەڕەتی و بنكەی واتایی" (ژیان):

(٤) شـــیرین بـــەهارە، بـــەهاری شـــادان
بـــێ بـــەهرەن لـــە ژیـــن گـــەل نـــامرادان
جـــەژن و بـــەهارو ســـەیران و خۆشـــی
گشـــتی پیرۆزی گـــەردن ئـــازادان

واتا پەرە دەستێنێ و فەسڵێكی تازە دێتە ناوەوە، كاتێ شاعیر بانگهێشتی (شیرینەكەی) دەكات بۆ چێژو نەشئەی ڕامانێكی شاعیرانە لە وەرزی گەشە و خۆشی (جەژن و بەهارو سەیرانی ناو وڵاتی جوان و ڕازاوە، لە وەرزی بەهاراو لەتەك ئەودا و لە سایەی ئازادیدا)، ئەمە مۆتیڤێكی نوێی واتایە لە پاڵ ئەوانی پێشەوەدا، بەڵام هەر زوو بەهۆی بێ بەشن لە (ژین) مەسەلەی واتای لەگەڵ بەندەكانی پێشووتردا، وەك لە (٢)، (٣)دا بینیمان، یەك دەخاتەوە لە بەندی دواتردا و دوای ئەوەی (ژیان و شیرین و ئازادی) لە بۆتەیەكدا كۆ كرانەوە، مەسەلە لەگەڵ (شیرینا) بەردەوام دەبێت لە تەك ئامانجە پیرۆزەكەدا: [٣٨]

(٥) شـــیرین ئـــەزانم كـــە تـــۆش زامـــاری
وەك مـــن عـــەودالی خونـــچەی بـــەهاری
هیـــوای تـــۆ یەكـــە هیـــوای مـــــن هـــەزار
مـــــــن بێزار نەبم تـــــۆ بـــــــۆ بێـــزاری؟

ئەنجا بەم شێوەیە (ژیان، شیرین ، ئازادی) وەكو كارەكتەری سەرەكی لە بەندەكانا دێن و شوێن گۆڕكێ دەكەن و بەردەوام دەبن... وەك ئەوەی لە بەندەكانی (٢٣)و (٢٧)دا جارێكی دیكە (شیرین) دێتەوە سەر شانۆ و ئەویش بە سۆزو هەڵچوونێكی تازەوە... ئەمە لە دەربارەی بنیاتی سەرەوەی واتایی لە

بەندەکانا، خۆ لە واتاو (بنیاتی قوولّ) یشدا ئەم یەکێتی بابەت و پەیوەندییە زیندوو و ئۆرگانیکە هەمیشە لە زنجیرەی چوارینەکانا فام دەکرێت و رەگ دادەکوتێت، بۆیە تا دێت سۆزو کوڵی خوێنەریش هاوشانی پەرەسەندنی دەقەکە زیاتر هەڵدەکشێت.

شێوەیەکی دیکەی بەرچاوی تەدویر ئەوەیە کە لە دەستپێکی بەندەکانی (٢، ٧، ٨، ٩، ١٢، ١٣، ١٤، ١٥، ٢١)دا دەیبینین، بەم شێوەیە:

(٢) بێ هێزی ئەژنۆم بینایی چاوم.

(٧) بێ دابنیشین جە بن هەناران.

(٨) بێ دابنیشین جە بن داری بەی.

(٩) بێ بابۆت بکەم باسی جوانیم.

(١١) بێ دابنیشین جەپای دیواران.

(١٢) بێ دابنیشین لە نێو ڕەزانا.

(١٣) بێ دابنیشین لە نێو گوڵشەنا.

(١٤) بێ دابنیشین جە بن چناران.

(١٥) بێ دابنیشین دیدە پڕ ئەسرین.

(١٦) بێ دابنیشین دووربین لە شادی.

لە وشەی دەستپێکی بەندەکانی پێشەوەدا لادانێکی شیعری هەیە، لەسەر تەوەری جێنشینی، شاعیر لە بری وشەی (وەرە)، وشەیەکی لەبارو گونجاوی دیکەی وەکو (بێ)ی هەڵبژاردووە (بە حوکمی زەروورەتی کێش)، ئەنجا ئەمە وەکو سیمایەکی رەفتار زمانی (کەلك وەرگرتن لە شێوەزار) لەسەرلەبەری تێکستەکە پێڕەوی لێ کراوە و وشە و زاراو و ڕێکەوەندی هەورامی، کە شێوەزارێکی ئاهەنگدار و شیرینە، لە تێکستەکەدا ئاخێندراوە و تا ئەوەی تەونی چنین و شێوازی داڕشتنی زمانی شیعری تێکستەکەی پاراو کردووە.

(بێ) لە ڕستەکانی دەستپێکی بەندەکاندا، کاری داخوازی ڕستەیەکی ئینشائییە، لە لایێ بە هۆی خێرایی خوێندنەوە و ئاوازی کێشەکە، لە لایەکی تر بە هۆی هاوسێیەتی لەگەڵ (ڕێژەی ڕانەبردووی ـ ئینشائی ـ چاوگی دانیشین ـ کە

خراوەتە پاڵ جێناوی کەسی یەکەمی کۆـ ین)، بە جارێ سەربەخۆیی خۆی ون کردووە و وەك بەشێکی پێکهاتەی دەستپێکی ڕستە و بەندەکانی لێ هاتووە:
- بێهیزی ئەژنۆم
- بێدابنیشین
بێیابۆت بکەم

ئەنجا لە زۆرینەی بەندەکاندا فرێزێکی ئاوەڵکاری بە دوادا هاتووە کە لە (ئاوەڵکار + ئاوەڵناوی کۆ)، وەك لە پێشەوە گوتمان، ڕۆڵی دۆخ و حاڵەت دەبەخشێت:

بێدابنیشین +




ئەم نەریتە، ئەو بۆچوونەمان لێ وەڕاست دەگێڕێ، کە دەڵێ" لەگەڵ ئەوەیدا کە چوارینە بەندەکان هەر یەکە ولە شوێنی خۆیدا کێڵگەو ڕەهەندی واتایی سەربەخۆی خۆیان هەیە، بەڵام بە هۆی هاوشێوەیی ڕێژە و ڕووکاری زمانییەوە، بەندەکانی لە کر و بنیاتێکی یەکگرتوو خۆیان نیشان دەدەن و ئەنجا لە ڕووی واتا و دەلالەتیشەوە بنیاتێکی گێڕانەوەیی درامی بەسەر هەموو بەندەکانا خۆ دەنوێنێ و شاعیر لە سۆنگەی چەند بارە گوتنەوەی (بێ دابنیشین)، ئیلحاحێکی زۆر دەنوێنێ و لە یارو هاوکار و هاوخەمەکەی دەخوازێت کە بێت و لە نزیکەوە تێکەڵاوی خەم و موعاناتەکانی ببێت و گوێ لە ناڵەی دەروونی رابگرێت، تا بەکامی دڵ لەو کەش و هەوا (شادمان و خەمناکە) بگەین کە ئەو تێدا دەسووتێت.[٣٩]

شێوەیەکی دیکەی پەیوەستبوونی واتایی لە ڕێگەی (تەدویر)ەوە لە بەندەکانی (١٦، ١٧، ١٨)دا دەدرەوشێتەوە:

(١٦) بەهار هاتەوە وە سەیرانەوە
وەڵێ و لۆلۆ وە حەیرانەوە
بە لەنجە و لاری نیگارانەوە
وە دەنگی خۆشی هوزارانەوە

(١٧) بەهار هاتەوە خۆشی لە یاران
خۆشی لە گوڵشەن خۆشی لە داران
خۆشی لە کۆڕی بادە گوساران
خۆشی لە بلبل خۆشی لە خاران
******

(١٨) خۆشی لە عالەم دوور لە دڵی من
شەونم بۆ خاران دوور لە گوڵی من
زنجیر پیرۆزی دڵ مردووان بێ
با ئازاد بژی بیری سڵی من

ڕایەڵەی پەیوەستی دێڕەکان لە هەر بەندێکدا ئەم شێوەیەی لە خۆ گرتووە:

- هەموو ڕستەکانی بەندی (١٦) پاش بەندی ڕستەی یەکەمن (بەهار هاتەوە)، واتە هەموو ڕستەکانی دیکە باس لە چۆنیەتی ئەو بەهارە دەکەن کە هاتۆتەوە یاخود بە ڕێگاوەیە بێتەوە.

- هەموو ڕستەکانی بەندی (١٧) وەڵامدەرەوەی ڕستەی یەکەمن (بەهار هاتەوە)، واتە هەموو ڕستەکانی دواتر کاردانەوەی (یاران و داران و بادەگوساران و خاران)ە لە ئاست هاتنەوەی بەهاردا.

- هەموو ڕستەکانی بەندی (١٨)، دەربڕینە لە هەست و هەڵوێستی شاعیر لە ئاست (هاتنەوەی بەهار)دا.

ئەمانــە ســەبارەت بەڕاقــەی یــەکێتی و واتــای دەلالــەتی ئــەو بەندانــەی تێکستەکەن کـە هەمیـشە لـە دەوری کـۆی واتـاو فـەزای شـیعری تێکستەکەدا دەخولێنەوە و لێی دانابڕێن و دوور ناکەونەوە:

ئـەنجا ئەگـەر بێـت و لـە رووی بنیـاتی زمانییـەوە سـەیریان بکـەین، ئـەوا رایەڵەکانی بەیەکەوە گرێ دراوییان بە روونی بەدی دەکەین:

بەهار هاتەوە:      وە............
وە ......................      وە.............    (١٦)
بە ..........................
وە ......................

بەهار هاتەوە:      خۆشی.......
خۆشی لە ................      خۆشی لە ..........    (١٧)
خۆشی لە ........................
خۆشی لە .............      خۆشی لە ................

خۆشی لە ................      دوور لە ......... من
........ بۆ ...............      دوور لە ......... من    (١٨)
................................................ بێ
با ......................................... من

پێکهاتـەکانی (بـەهار هاتـەوە ـ خۆشـی ـ خۆشـی لـە ، دوور لـە) لـە پـاڵ ئامرازەکانی (وە ـ لە ـ بۆ ـ با) و جێناوەکانی (من) هەموو هاوکـار دەبـن و وەکـو جەڕ و مەنگەنە بەندەکان وێکڕا شەتەك دەدەن.

لێرەدا دووبارە بوونەوەی چەند جارەی فـۆرمێکی زمـانی لـە وێنـەی (بـەهار هاتـەوە) لەسـەرەتای بەنـدەکانی (١٦)و (١٧)، (خۆشـی لـە) لـە دەسـتپێکی ڕستەکانی بەندی (١٧) و (١٨)، جگە لە هاوسەنگی و بەرجەسـتەکردنی واتـا، بـۆ بەردەوامی پێدان و پێکەوە بەستنەوەیشە هەم لە نێوان دێڕەکانی بەندێکداو هەم لە نێوان بەندەکانیشدا.[٤٠]

دیارە ئەمە لە شوێنەكانی دیكەشدا لە تێكستەكە هەر وایە:

ـ شیرین بەهارە ←——— شیرین ئەزانم ←——— شیرین هەتا كەی.

ـ بەهار هاتەوە وە سەیرانەوە ←——— بەهار هاتەوە خۆشی لەیاران.

ب ـ هاوتەریبی:

لەگەڵ ئەوەیدا هـزرو بـیری نووسـەر هەمیـشە لـە نێـو بڕگـەو بابەتـەكانی دەقەكەدا ئامادەیەو، زۆرتریش هێمایە بـۆ دیـدو جیهـانبینی شـاعیر سـەبارەت بـە مەسەلەكانی مەرگ و ژیان، بەڵام ئەم ڕامان و فەلسەفەیە لـە ئـەنجامی گەمەیـەكی هونـەری و ئیـستاتیكییەوە ڕایـی دەكرێـت كـەوا زمـان ڕۆڵێكـی كاریگـەری تێـدا دەگێڕێت.[٤١]

یەكێك لەو گەمە هونەرییانە كە لە ڕێگەی زمانـەوە بـە ئـەنجام دەگەیەنـدرێت بریتییـە لـە هاوتـەریبی، هاوتـەریبی جۆرێـك لـە داڕشـتنی زمـانی یـاخود ڕۆنـانی سێنتاكسی هاوشێوەیە كە بـە (موازەنـە) دەناسـرێت و لـە پانتـایی تێكستدا خـۆ دەنوێنێت لە چوارچێوەی هونەری شـێوازگەری و، جۆرێـك لـە تـەفاعول لـە نێـوان زمان و واتا و ئەندێشە و ئاواز لە بنیاتی دەقدا بەرپا دەكات و ئاستی جونكـاری و شیعرییەتی ڕووەو چڕی و باڵـایی دەبـات و پـەیامگر هەسـت و چـێژو خۆشـییەكی زۆری لێ دەبات.[٤٢] لە تێكستی (یادگـارو هیـوا)دا ڕووبـەڕووی كۆمـەڵێك دیـاردەی لەم شێوەیە دەبینەوە:

ـ /بە/ گریانی/ وشك/

/بە/ ناڵەی/ بێ دەنگ/

ئەمانە فرێزی وەسفین لە پێكهاتەی ڕێزمانیدا وەكو یەكن:

ـ ئامراز + (دیارخراو + دیارخەر)

لەم دوو فرێزەدا شاعیر ئاشنایەتیمان لەگـەڵ یاسـاكانی زمـان لەسـەر ئاسـتی واتـاو دەلالـەت، تێـك دەشـكێنێ و لادانێكـی گـەورە بـەرپا دەكـات، بـەهۆی كۆكردنەوەی دوو دژ لە هەریەكێك لە پێكهاتەی فرێزەكاندا، كە ئەمە لە ئاخـاوتنی ئاساییدا لەگەڵ هۆش و مەنتیق نایێتەوە، بـەڵام كاتێـك بـەرەو دوای ئـەم فرێزانـە دەگەڕێینەوە و لە فەزای بەندەكە ڕادەمێنین، بە تایبەتی لە دێـڕی سـەرەتایدا" ـ لەبەر چاوی بەد، لەترسی بەدكار ئەوسا بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە شاعیر نەك هەر

کارێکی ڕەوای کردووە، بەڵکو جوانکاری و داهێنانیشی نواندووە کاتێ پەنای بۆ دوو وێنە بردووە کە لە ڕووی ڕۆنایی واتایی و چەمکەوە یەکتری ڕەت دەکەنەوە بەڵام کە لە مەبەستی شاعیر تێ دەگەین، واتاکانمان لەلا بەرجەستە دەبێت و ئیعجاب و ئافەرینیشمان بۆ شاعیر پەرە دەستێنێ، (سەیری پەراوێزی ژمارە (٣٧) بکە).

ـ /مەژی/ بۆ/ مردن/

/بمرە/ بۆ/ژیان/

فرێزەکان بەر لە (نەرێ)کردنیان خاوەن ڕۆنانێکی زمانی هاوشێوە و تەبا بوون:

/ژیان/ بۆ/ مردن/

/مردن/ بۆ/ ژیان/

چاوگ + ئامراز + چاوگ

مردن و ژیان دوو پرسی ئەزەلی و دوو چەمکی بەرامبەرو دژیەکن، شاعیر هونەر و وەستاکارییەکی تیادا ئەنجامداون، لە ڕووی بنیاتی قووڵی واتادا فرێزی یەکەم لە بنەڕەتدا ڕۆنانێکی مەنتیقی هەیە (ژیان بۆ مردن ـــ ژیان کۆتایی و ئاکامەکەی مردنە)، هەر چەند ڕۆنانە ڕێزمانییەکە لانی کەم لە ڕۆنانی سەرەوەیدا ناتەباو ناحەزە (ژیان بۆ مردن)، وەلێ پراگماتیکی زمان ئەو کێشەیەمان بۆ چارەسەر دەکات و پێمان دەڵێ (کاروانی ژیان کۆتاییەکەی مەرگ و مردنە)، ئەنجا فرێزی دواتر بە هەمان پێودان داڕێژراوە (مردن بۆ ژیان)، بەڵام لەمەدا چی فریامان بکەوێ و ئەمە چۆن لێك دەدرێتەوە، کە ناحەزی و نەگونجان لە ڕوخسارو لە چەمکی پێکهاتەکەدا ئاشکراو ڕوونە، دیارە دەبێ دیسان پەنا بۆ مەبەست و ( مەقسەد)ی شاعیر بەرین، کە دەشێ بوترێ (فیداکاری و گیان بەخشی مرۆڤ ـ مردن" لە پێناوی بەدیهاتنی دواڕۆژێکی باشترە ـ ژیان)، تا ئێرە زۆر لە ڕاوێژو دەربڕینی ئاسایی دوور نەکەوتووینەتەوە، بەڵام شاعیر بۆ ئەوەی دەربڕینەکانی زیاتر لە ئاخاوتنی ئاسایی دابڕێت و بیانکات بە داڕشتنی شیعری و هاوسەنگی لە نێوان ئەم دژو نەیارانە پێك بهێنێ، هاتووە فرێزی یەکەمی لە شێوەی (نەرێ ـ نەفی) داڕشتووە و فرێزی دووەمیش لەسەر ڕێژەی (داخوازی ـ ئیسبات):

ـ مەژی بۆ مردن

ـ بمرە بۆ ژیان

بەمەش ڕێژەیەك لە جیاوازی و لێکچوون بە گوێرەی تیۆرەکەی یا کۆسین لە نێوانیاندا جێگیر بووە، ئەنجا لە درێژەی چەمکی هاوتەریبی ئاوڕ لە چەند بەندێکی دیکەی تێکستەکە دەدەینەوە:

(٧) / بێ/ دابنیشین / جە/ بن/ چناران/

(٨) /بێ/ دابنیشین/ جە / بن/ داری بەی /

(١٢) /بێ/ دابنیشین/ لە / نێو / ڕەزا نا /

(١٣) /بێ/ دابنیشین/ لە / نێو / گوڵشەنا /

(١٤) / بێ / دابنیشین/ جە/ بن / چناران /

کاری داخوازی+ ڕێژەی ئینشائی+ ئامراز + ئاوەڵکاری + ناوی کۆ

چاوگ +جێناوی شوێن

کەسی یەکەمی کۆ

پاتە بوونەوەی چەند بارەی هەمان پێکهاتەی ڕێزمانی، لەم چوارینە بەندانەی تێکستەکەدا، تا ڕادەی یەکبوونی گوتارێکی شیعری هاوشێوە لە بەندەکانا بە جیاوازییەکی یەکجار کەم لە بەشی دوایی ڕستەکاندا، ڕەنگدانەوەی پەرۆشی و پێداگری شاعیرە لەسەر گەیاندنی بیرۆکەکەی و چڕکردنەوەی واتاو مەبەستەکانیەتی لە تەك بە برشتکردنی مۆسیقای بەندەکان و بەیەکتر گرێدانەوەیان، تا ئەوەی تاقگەیەکی هارمۆنیا لە یەکێتی دەنگ و ئاوازو واتاو دەلالەت دێنێتە کایەو دەڕژێتە ناخی پەیامگرەوە.

بە دیوێکی دیکەدا بنیاتی دیالۆگ و گفتۆگۆی درامی لە بەشێکی بەندەکانا خۆی دەنوێنێت، گوتاری شیعری ئاڕاستەی (شیرین)ی شاعیرە کاتێك دەڵێ:

**(٢) بێ، هێزی ئەژنۆم، بینایی چاوم**

**ئارامی گیان، جەرگم، هەناوم**

**یاخود بە جارێ چارەسەرم کە:**

**یا لە نامەی ژین دەربێنە ناوم.**

****

(٥) شـــیرین، ئـــەزانم کـــە تـــۆش زامـــداری
وەك مـــن عـــەودالّی خونـــچەی بـــەهاری
هیـــوای تـــۆ یەکـــە هیـــوای مـــــن هـــەزار
مـــــــن بێـــزار نـــەبم تـــۆ بـــۆ بێـــزاری؟
****

وەکـو چـۆن لـە بەنـدەکانی (٦، ٧، ٨، ٩، ١٢، ١٣، ١٤، ١٥، ٢٣) هـەمان شـێوازی دیـالۆگ و گفتۆگـۆ و دانوسـتاندن بـەردەوامی هەیـە و شـاعیر لـەو ڕێگـە دڵپەسندەوە بیرو مەبەستەکانی خۆی یەکلایی دەکاتەوە.

بنیاتی گێڕانەوەیی چیرۆك ئامێز لە هەندێ لە بەندەکانا ئامادەیی زۆری هەیـە و کراوەتە دەرەتانێك بۆ زیندوو ڕاگرتنی هەست و سۆزو خورپەکانی دڵ و دەروون و شاعیر کەڵکی لێ وەرگرتووە:

(٩) بـــێ ...بـــا بـــۆت بکـــەم باســـی جـــوانیم
ڕۆژانـــــی بـــــەرخیم شـــــەوانی شـــــــوانیم
کۆرپـــەی ئـــازیز بـــووم شـــوانکارەی شـــادی
ژیـــام بەخۆشـــــی هەتـــــــــــا تـــــوانیم.
*****

(١٠) ژیـــام ســـەردەمێ بـــە کـــەیف و خۆشـــی
بـــە شـــادی کـــڕین، بەخـــەم فـــــرۆشی
تـــاکو پـــێم کـــرا ڕوومـــــــــەتم مـــژی
تـــاکو تـــوانیم شـــــەرابم نـــــــــــۆشی
*****

(١١) ئـــەو ســـاکە چـــوومە ریـــزی دڵـــداران
پێـــــی وتم ســـــەردار هـــــۆزی هـــــەژاران
( (بـــێ دابنیـــشین جـــە پـــای دیـــــواران
زنجـــیر لـــە گـــەردن چـــون گوناهکـــاران))
*****

### ج ـ وێنە و میتافۆر:

زمانی شیعری زمانێكی بارگاوییە بە واتاو هەست و سۆزو وروژاندن، شاعیر هەر بەوە ناوەستێت، و بە مەبەستی بەرزكردنەوەی رادەی كاریگەری وێنەی شیعری دەسازێنی، بنیاتی وێنەی شیعری كە ئەندێشەو داهێنان رۆڵی كاریگەری تێدا دەگێڕن دەبن بە ڕەگەزێكی بە پیتی شیعرییەت. لەو بارەوە جان كوێن دەڵێت، ( (ئەركی وێنە چڕكردنەوەیە، شیعرییەتیش بریتییە لە چڕكردنەوەی زمان)). [٤٣]

وێنە هەم واتا چڕو پڕ دەكات و هەم هەست و هۆشی خوێنەر دێنێتە جۆش و دەیبزوێنێ، هەمیش هونەرو دەسەڵات و دەستڕەنگینی شاعیر نیشان دەدات لە چۆنییەتی ڕازاندنەوەو پێشكەشكردنی بیرۆكەكانی بە هۆی ئەو گەمە زمانییانەی كە لە تێكستەكەیدا دەیسازێنێ.

بڕایم ئەحمەد وەكو پێشەنگێكی مۆدێلی شیعری سەرەتای سییەكان (سەرەتای ژیانی ئەدەبی وەكو رۆمانتیكێكی شۆڕشگێڕ دەست پێ ئەكا) [٤٤] و لە تێكستە نۆبەرەكەیدا (یادگارو هیوا)، ئاوات و ئومێد، ناڵەی دەروون، هەست و بیرو جیهانبینییە خودیەكانی تێكەڵ بە مەسەلەی شۆڕشگێڕی و ئامانجەكانی خەبات و كوردایەتی ئەو ڕۆژگارە كردووە، ئەگەر بێت و ئامارێك بۆ وشەكانی دنیای ڕۆمانسیەت لە تێكستەكەدا بكەین، ئەوا پێویستمان بە فەرهەنگێكی تایبەتی دەبێت. هەر بۆ نموونە بەندی (١) بەسەر دەكەینەوە:

**(١) لەبەرچاوی بەد ، لەترسی بەدكار**

**دڵ خۆم ئەكەمە گۆڕی یادگار**

**بە گریانی وشك بە ناڵەی بێ دەنگ**

**دێنمە لەرزین تەختی كردگار**

وشە گەلی" ترس، گۆڕی یادگار، گریان، ناڵە، لەرزین...

سەربە جیهانی رۆمانسیزمن، لەوەش گرینگتر چۆنیەتی داڕشتن و ریزكردنی وشەكانە كە دەبنە مایەی بەدیهێنەری خودی ئەزموونەكە. [٤٥] شاعیر بە هۆی میتافۆرەكانی (وێنەی خواستن)" چاوی بەد، گۆڕی یادگار، گریانی وشك، ناڵەی

بێ دەنگ، تەختی کردگار، جڵەوی ئەسپی خەیاڵی تا سنووری زیادەڕۆیی تـاوداوە بۆ سازکردنی وێنەیەکی زەینی (دێنمـە لـەرزین تـەختی کردگـار)، کـە خوێنـەر لـە خۆیا دەباتە حاڵەتی خرۆشی و سەرسوڕمان.

دیارە شاعیر بایەخێکی بەرچاوی بەسروشت داوە، سروشـتی رازاوە و جـوانی کوردستانی کردۆتە بەردی بناغەی تێکستەکەی،[٤٦] لـەو ژینگـە و هـەوارە دڵگـیرو ئاشنایە بە زمانێکی سادەو رەوان و پەتی وێنەکانی پێکهێناوە. ئاوڕدانەوەیەك لـە پـاژو بەنـدەکانی تێکستەکە کۆمـەڵێ وێنـە و خـوازەو میتـافۆری نەسـواو و تـازە بابەتمان بۆ ئاشکرا دەبێت، لە نموونەی (گەل نامرادان، مەژی بۆ مـردن، بمـرە بـۆ ژیان، بەی ڕەنگی گەردن، مەی ڕەنگی گۆنەی، شوانکارەی شادی، شـادی کـڕین، خەم فرۆشی، ماچ دزین، دڵ دزین، خۆشی لەیاران، خۆشی لـە داران، ....)، گـەڵێ جار وێنەکان بەڕستەیەکی داڕشتنی شیعری، یا دەستەواژەیەك بـە ڕێگـەی یـەکێك لـە هونـەرەکانی وێنـەی ڕوونبێـژی (لێکـچواندن، خـوازە و خواسـتن)، یـا وەسـف نیشان دەدرێن: (لە نامەی ژین دەربێنە ناوم، زنجیر لە گەردن چون گوناهکـاران، خونچەبکێشین بەڕووی خەزانا، زنجیر پیرۆزی دڵ مردوان بـێ، خونـچەی جـوانی و گەنجی بنێژم، مژدەی ئازادی یارم بۆ دێنێ، گریان کـردەوەی بـێ دەسـەڵاتە، بـێ دەسەڵاتان ئەڕزێن لە ژێر بار...). وا هەیە لە بەندێکدا وێنەی پاژەکان (لە ڕسـتەو دەستەواژەی دێڕێك پێکهاتووە)، یەك دەگرنەوە دەبن بە وێنەیەکی لێکدراو، واتا وێنەیەکی گەورە و سەرەکی پێك دەهێنن:

(٨)
(خۆشی لە عالەم دوور لە دڵی من) ← وێنەی تاك
( شەونم بۆ خاران دوور لە گوڵی من) ← وێنەی تاك
(زنجیر پیرۆزی دڵ مردووان بێ) ← وێنەی تاك
(با ئازادی بژی بیری سڵی من) ← وێنەی تاك
وێنەی گەورە (کۆ)

لەم بەندەدا لە هەر دێڕێکدا وێنەیەکی تاك (پاژێـك) وێنـا کـراوە و سـەرجەمی پاژەکان لە بەندەکەدا بۆ یـەکتری دەدوێـن و تێکـەڵاو دەبـن و لـە ئاکامـدا وێنـەی مەبەست و ئایدیای شیعری شاعیر پێك دەهێنن.

کاتێك دەمانەوێ شوێن پێی کارێکتەری سەرەکی لە تێکسـتەکەدا هـەڵبگرین، دەبینین لە ئاسـت گوتـاری شـیعری خـۆی لـە (خـودی شـاعیر ـ مـن) و یارەکـەی

(شـیرین ـ تـۆ) دا دەدۆزێتــەوە و ڕەگـەزی دراماـتیكی شـیعری لـە نێـوان ئـەم دوو كارێكتەرەدایە.

بێ (تۆ) ◄——► دابنیشین (من)........ لە زۆر جێگادا و لە توێژی دووەمی دەلالەتەكاندا كارێكتەری دیكە و سێهەمیش خۆی حەشارداوە، كـە بـە بـێ بـوونی ئەو پەنهانە (خونچەی بەهار ـ ئامانج ـ ئازادی) بوون و ژیان و مانەوەی دووانەكەی تر (من و تۆ) مەعنایەكی نامێنێت:

**بەڵێن بێ ئیتر نەتناسم هـــەتا**

**مژدەی ئازادی (یارم) بۆ دێنی**

دیــارە خواســت و مــرازی بنــەڕەتی شــاعیر گەیــشتن و شــادبوونە بــەیارو دڵخوازەكـەی (شـیرین ـ ئـازادی)، هـەر لـەم پێناوەشـدا شـاعیر دنیـای سروشـت دەپێویت بۆ بنیاتنــان و ئارایـشتكردنی وێنــەكانی، لێـرەدا سروشـت دەبێتـە ئـەو ناوەندەی كە هەر سێ لای (شاعیر ـ یـار ـ ئـازادی) تیـادا پێـك دەگەیەنـدرێت، بـە واتای گەشتی شاعیر بە ناو دنیای جوانییـەكانی سروشـت و دیمەنـە جـۆراو جـۆرو هەست بزوێنەكانیدا بۆ گەیشتن بە خواست و نیازو دڵخوازەكەیەتی.[٤٧]

## ئەنجام

دوای ئەوەی شیکارییەکی شێوازگەری بنیاتی دەلالی تێکستەکەمان لە چەند ئاستێکەوە خستە ڕوو کە چاوگەکانی بنەماکانی شیعرییەتیان لێ هەڵقوڵاوە، لێرەدا پوختەی ئەو ئەنجامانەی کە باسەکە پێی گەیشتووە لە چەند برگەیەکدا دەخرێنە ڕوو:

١ـ یادگارو هیوا تێکستێکی تەژی لە بنیات و دیاردەی هونەری و شێوازگەری و شیعرییەتە، هەر ئەمانەشە ماکی پایەداری و زیندوویی تێکستەکەیان بە درێژایی ڕۆژگار لەسەر وەستاوە.

٢ـ ناونیشان لە تێکستەکەدا دیاردەیەکی هونەری تازە بابەت و سەرنجڕاکێشە، بە پێوەری دەقەکانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی، لە شێوەی ئاوێنەیەکی دوو ڕووە کە هەر دوو تەوەری ستراتیژی دەقەکە تیایدا ڕەنگی داوەتەوە.

٣ـ گوتاری شیعری شاعیر لە چەند چاوگ و ئاستی جیا جیادا، لە وێنەی (دەنگ و وشە و پێکهاتە) لە ڕێگەی تێکچڕژان و هاوبەشییەوە، سامانێکی بە پیت و بەپێزیان لە دەلالەت و لە هونەری شیعرییەت پێکهێناوە.

٤ـ بە شێوەیەکی بەرچاو سوود لە کەرەستەکانی وەکو زمان و شێوەزار، بابەتەکانی سروشت و فۆلکلۆر، سۆزو خورپەی ڕۆمانسیزمی وەرگیراوە، بۆ ئاواکردن و بنیاتنانی تەلاری شیعری تێکستەکە و تەعبیرکردن لە خواست و ڕازو ئامانجەکانی شاعیر.

## پەراوێزەکان:

١ـ (یادگارو هیوا) بۆ یەکەم جار و لە (٢٠) چوارینەدا، بەناونیشانی (هیوا و دڵداری) لە گۆڤاری (هاوار)ی شام دا بڵاوبۆتەوە. راستییەکەی ئەوەیە کە ئەم دەقە لەگەڵ ئەوەی بۆ دووەم جارو لە ژێر سەرپەرشتی خودی دانەرەکەی لە (یادگاری لاوان)دا بڵاوبۆتەوە زۆر جیاوازن، هەم لە ناونیشان و هەم لە ژمارە و ، دارشتن و هۆنینەوەی خودی بەندەکان لە هەر دوو تێکستەکەدا، بۆیە بە چاکمان زانی کە دەقەکەی گۆڤاری هاواریش لە کۆتایی ئەم باسەدا بخەینە بەرچاو (تەنیا لە باری رێنووس و هەڵەی چاپەوە) دەستیکاریمان کردووە، تا وەکو خوێنەر خۆی بەراوردێ لە نێوان هەر دوو تێکستدا بکات و پەی بە جیاوازی و گۆڕانکارییەکانیش ببات ـ بڕوانە: پاشکۆی ئەم باسە.

٢ـ (یادگاری لاوان) لە لایەن کۆمەڵەی لاوانەوە لە شێوەی بڵاوکراوەیەکی ساڵانە ساڵی ١٩٣٣ لە بەغدا و لە ژێر سەرپەرشتی و چاوەدێری خودی برایم ئەحمەدەوە دەرچووە، وەکو پاشان باسی کردووە لە ٧٠٪ بابەتەکانی ئەو رێکی خستووە، هەر لەوێشدا تێکستەکە فۆرمی تەواوی خۆی وەرگرتووە.

٣ـ بۆ ئەم مەسەلەیە سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

ـ برایم ئەحمەد ـ ژیان و بەهرەو داهێنان، ئەحمەد شەریف، سلێمانی، ٢٠٠٢.

ـ برایم ئەحمەد ـ لە کارە زانستی و ئەدەبییەکانی پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار، عومەر مەعروف بەرزنجی، سلێمانی، ٢٠٠٤.

ـ برایم ئەحمەد ـ دەنگێکی زوڵاڵی شیعری نوێی کوردییە، ئەڤین عبدالقادر مەعروف بەرزنجی، سلێمانی، ٢٠٠٥.

ـ مێژووی ئەدەبی کوردی، دکتۆر مارف خەنەدار، بەرگی حەوتەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.

ـ برایم ئەحمەد ـ رۆڵی لە بزاڤی رزگاریخوزای و رووناکبیری گەلی کورد دا، ئامانج حەسەن ئەحمەد، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٤ـ أغانی کردستان، معروف خزنەدار، مطبعة أسعد ، بغداد، ١٩٥٦.

٥ـ مقاطع من الذکری والامل ـ رائعة الاستاذ ابراهیم أحمد، جریدة الاتحاد، العدد/ ٤٦٨ في ٢٠٠٢/٤/١٢.

٦- کێشەی (چوارین ـ روباعی)، (چوار خشتەکی ـ تربیع)، (چوارینە بەند ـ مربع)، لە رووی فۆرم و کێش و سەرواوە لە ئەدەبی کوردیدا هێشتا یەکلایی نەبۆتەوە. جۆرێك لە ئیشکالیەت لە جیاکردنەوەی ئەمانە لە نێو خۆیاندا و لە نێوان ئەمانە و(دووبەیتی)دا هەر ماوە، زۆربەی ئەو راڤە و پێناسانەی کە تا ئێستا دەکرێت لەسەر بنەمای ئەدەبی فارسی و عەرەبیدا هەڵهێنجراون، لە کاتێکدا ئەم هونەرە باوەی قالبی شیعری لە ئەدەبی کوردیدا پێویستی بە لێکدانەوەی تایبەت و لێکۆڵینەوەی وردو زانستی هەیە، بۆ ئەم مەسەلەیە سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

- بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا: ١٢٥.
- کێشی شیعری کلاسکی کوردی: ٢٨٦.
- سەروا: ٢٠٤.
- انواع ادبی: ٣١١.
- فنون بلاغت و صناعات ادبی: ١٥١.

٧- بەنموونە لە چوارینەکانی خەیام دا، کە ناودارترین و رەسەنترین جۆری قالبی چوارینەیە لە ئەدەبیاتی کۆندا، هەر چوارینەیەك بیرێکی فەلسەفی یا عیرفانی تەواو و سەربەخۆی هەیە، کە دەکرێت هەر یەکێکیان بە تەنیاو بە دابڕاوی لە وانی دیکە وەربگیریت و لێك بدرێتەوە.

٨- ئەوەی پەیوەندی بەو فۆرمانەی (چوارین ـ روباعی)یەوە هەیە کە لەسەر کێشی عەرووز هۆنراونەتەوە، ئەوا هەر بەندێکی چوارین بە دوو دێڕ (چوار لەت ـ چوار میسراع) حیساب دەکرێت، لێرەوە (چوارین) لە فۆرم و پێناسەدا لەگەڵ (دووبەیتی) یەك دەگرێتەوە تەنها لە کێشدا جیاوازییان دەبێت.

٩- گۆران: ١٦٣.

١٠- سەروا: ٢٠٨.

١١- پێچەوانەی رای هەر یەك لە مامۆستایانی بەڕێزم ( د. دلشاد عەلی و د. عەزیز گەردی)، بەندە (چوار خشتەکی ـ تربیع) بە دە تێدەگەم کە دوو شاعیر یا دوو لایەن دەستیان هەبێت لە داڕشتنیدا بە گوێرەی سیستەمێکی تایبەتی، وەکو چۆن لە (پێنج خشتەکی ـ تەخمیس)دا پێڕەوی لێ دەکرێت.

تکایە بگەڕێوە بۆ:
- بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوریدا: ١٢٥.
- سەروا: ١٢٠.

١٢- ستراتیژیا نافۆنیشانێ، گۆڤارا پرێز: ١٢٣.

١٣- مملكة النص: ١٥.

١٤ـ البدايات في النص الروائي: ٧٠.

١٥ـ بە گوێرەی بارودۆخ و سیاق، شتی دیكەشی لێ فام دەكرێت:

ـ شتێك یا شوێنەوارێك كە لە دوا كۆچی دوایی كەسێك بەجێ دەمێنێت دەبێتە یادەوەری (ماكی وەبیرهێنانەوە) بۆ ئەو كەسە:

٭ كاك سەلاحی جوانە مەرگ یادگاری مامۆستا هێمن بوو.

ـ بۆ پێشكەشكردنی دیاری و خەڵات وەك، هێمای دۆستایەتی:

٭ ئەم دیارییەم بۆت هێناوە بۆ یادگاری.

ـ ئەو بەسەرهات و رووداوانەی كەسێك لە دەفتەرێكدا تۆماری دەكات دەبن بە(یادگاری):

ـ شیعرێكی خۆتم بۆ یادگاری بۆ بنووسە.

٭ لە كاتی بەكارهێنانیشی وەكو ناو (یادگار)، ئەوە هێمایە بۆ (باوە یادگار)ی پیری پیرۆزی یارسانەكانی كۆن و هەڤقەو كاكەییەكانی ئێستا.

بڕوانە:

ـ فرهنگ فارسی، ٤، ٥٢٤١.

١٦ـ رەوانبێژی: ١٥٧.

١٧ـ هاتنەناوەوە و پەرەگرتنی وشە گەلێكی لە بابەتی ( شیرین، یادگار، هیوا، ڕۆژگار، ... تاد) لەو هەولآنەوە داكەوتوون كە لە نێوان ساڵانی (١٩٢٠ ـ ١٩٣٠) دراون بۆ بژاركردن و برەوپێدانی وشە و زاراوەی كوردی پەتی و خۆ بەدوورگرتن لە وشە و زاراوەی بێگانەوە كە لە لایەن نەتەوە پەروەران و ڕابەرانی نوێكەرەوەی شیعری كوردییەوە دەدران لەو وێنەی پیرەمێرد و گۆران و ئەوانی تر. برایم ئەحمەد جگە لە تێكستە شیعرییە نۆبەرەكەی (یادگار و هیوا)، بڵاوكراوەكەی كۆمەڵەی لاوانی كوردیشی لە ساڵی ١٩٣٣ ناو ناوە (یادگاری لاوان)، وەكو چۆن گۆرانیش دیوانێكی شیعری خۆی بە ناوی (بەهەشت و یادگار) ناو ناوە.

١٨ـ بنیاتی هەڵبەست: ٨٧.

١٩ـ گۆران: ١٥٨.

٢٠ـ شیعرییەتی دەقی چیرۆكی كوردی: ٧٣ ـ ٧٤.

٢١ـ شاعیرەكانمان: یادگاری لاوان: ٣٣.

٢٢ـ كێشی شیعری كلاسیكی كوردی: ٧٢.

٢٣ـ شیعرییەتی دەقی چیرۆكی كوردی: ٧٢.

٢٤ ـ شعرية القصيدة العربية المعاصرة: ١٦٠.

٢٥ـ چاوگێڕانێكی خێرا بە كۆ بەرهەمی شیعری شاعیرانی ناوچەی هەورامان (بێسارانی، مەولەوی، سەیدی...) وەكو نموونە، ئەو راستییە دەسەلمێنن كە پۆلە دەنگی ڤاوڵە كشاوەكانی

زمانی کوردی (آ ، و، ی) بە هاوکاری هەردوو دەنگە کۆنسنانتی (م، ن)، سیمای هەرە باوی سیستەمی سەرواداری لە بەرهەمی شیعری ئەو ناوچەیە پێك دەهێنێ، کە ڕەنگبێت ئەمەش لە شیعری میللی و سەرزارەکی و گۆرانی فۆلکلۆرییەوە پەرەی گرتبێت.

٢٦. مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٧: ٢٨٦.

٢٧. شیکردنەوەی دەقی شیعری لە رووی زمانەوانییەوە: ١٢٣.

٢٨. شیعرییەتی دەقی چیرۆکی کوردی: ١٤٢.

٢٩. خەسار ناسی وشە سازی...، زمانەوان، ژ٣: ٣٤.

٣٠. برایم ئەحمەد دەنگێکی زولالی شیعری نوێی کوردییە: ٦١. ٧٢.

٣١. علم لغة النص: ٧٦.

٣٢. دارشتنی باوی دێڕە فۆلکلۆرییەکە بەم جۆرەیە:

ئەوا تۆ ئەڕۆی      بە خوام سپاردی

بە خۆم پێم نەکرا   دڵەکەم بۆ ناردی

٣٣. برایم ئەحمەد، دەنگێکی زولالی شیعری نوێی کوردییە: ٧.

٣٤. شیعرییەتی دەقی چیرۆکی کوردی: ١٧٥.

٣٥. زماننامی و هەندێ بابەتی زماننامی کوردی: ٣٧.

٣٦. زبانشناسی نوێن: ٢٢١.

٣٧. القصيدة العربية الحديثة: ١٧٦.

٣٨. خواستنی نازناوی (شیرین) وەکو مۆتیڤ و یارو ئەڤینداری شاعیر، هەڵبژاردنێکی واتادارە، لەگەڵ ئەوەی برەوپێدان و زەقکردنەوەی وشە و ناوێکی جوان و پاراوی کوردییە، من وای بۆ دەچم کە ئەمەش لە کاریگەری شێوازی شیعری شاعیرانی گۆران بە دوور نییە. بە نموونە پیری شاعیرانی هەورامان (بێسارانی)، لە (١٥) پارچە هۆنراوەی لیریکی خۆیدا کە لە کەشکۆڵەکاندا بە(شیرینیات)پۆلبەندی کراوە، یارەکەی خۆی بە(شیرین) ناوزەد دەکات، هەر بۆ نموونە (بێسارانی) دەڵێ:

شیرین نیاوە

پەی شفتەی دلان، پرشنگ نیاوە

پەردەی سیاماڵ هۆردا دیاوە

چون مانگ نە گۆشەی هەوری سیاوە

هەورەها لە (١٥) پارچەی دیکەشدا یارەکەی بە (دڵە) نێوزەد کردووە:

دڵە هەزارەن

ئەرسەد زامەتت هەزار هەزارەن

**ئەرسەد خەیاڵت شەوان چون خارەن**

**بێ وەفا ئاخر چەفاش نە کارەن**

ئەنجا با لە چوارینەکانی ژمارە (٤ ، ٥ ، ٢٣) هەروەها (٢٥) رابمێنین و ئەنجا بەراوردێك بکەین. بڕوانە:ـ

ـ کەشکۆڵە شیعرێکی کوردیی گۆرانی: ١٢١ـ ١٣٩ـ ١٤٦ ـ ١٦٠.

ـ دیوانی بێسارانی: ٣٥٢ ـ ٣٧٤.

٣٩ـ هێمایە بۆ ئەو دێڕە هۆنراوەیەی سالم:

**یارم لە ئەندەروون هات دەستی رەقیب لە دەستا**

**غەمناك و شادمانم رەحمەت عـــــــەزابی هێنا.**

لە کۆکردنەوەی (غەمناك و شادمان) جۆرێك لە دژەڕۆیی و پارادۆکس هەیە، کەوا پێکەوە کۆکردنەوەی دوو دژە لە یەك پێکهاتەدا. کەچی لە پشتەوەی واتا دژو پێچەوانە رووکەشەکەدا واتایەکی فراوانی شاعیرانە هەیە و لە کاتی یەکلایی کردنەوەی تەواوی دێڕەکە ئاشکرا دەبێ، لە (یادگارو هیوا) شدا هاتووە:

**بێ دابنیشین جە بن هـــــــناران**

**کۆڕێ ببەستن چون مەی گوساران**

**با ساتێ ناوی لە یادا نـــــــــەبێ**

**مەرگی جوانان گریەی هـــــــەژاران**

لە نیوەی یەکەمی بەندەکە (شادی)و لە نیوەی دووەمیدا (خەم) دەخوێندرێتەوە، بەڵام هەر دوولا ئاوێزان دەبن و لە فەزایەکی شیعری ناسکدا یەك دەگرنەوە. بڕوانە.

ـ دیوانی سالم: ٣٥.

٤٠ ـ شیکردنەوەی دەقی شیعری لە رووی زمانەوانییەوە: ١٢٣.

٤١ـ دەقی ئەدەبی: ٧.

٤٢ـ تحليل النص الادبي:٤٧.

٤٣ـ اللغة العليا: ١٤٥.

٤٤ـ ژانی گەل، پێشەکی: ٤.

٤٥ـ هەردی و رۆمانتیزمی خود: ١١.

٤٦ـ وێنەی شیعری لە رێبازی رۆمانسی کوردیدا: ٤٥.

٤٧ـ الشحنة الديناميكية: ٣٨.

## پاشكۆ

### هیوا و دڵداری

بۆ خوێندەوارانی بە نرخی هاوار

((هۆنینەوەی فرمێسك وەك ڕیزكردنی مرواری نییە، بە خوێنی دڵ وێنەی ژیان بگیرێ، جیایە لەگەڵ ئەوەی كە بەمەرەكەبی سوور بنووسرێ، لەكوورەی دڵەوە هاڵاوی غەم بێتە دەرێ، جوێیە لەگەڵ ئەوەی كە لە چیمەنی خەیاڵ چەند گوڵێكی ئاڵی جوانە مەرگ بدرزێ، شنەی سۆزەی بەیان دوورە لە گێژەلووكەی رەشەبا)). لەم دوو سێ دێڕە بێ سەروپایە زۆرتر شك نابەم كە(قەسیدەی)، (هیوا و دڵداری)ی (م....)ی هاوڕێمتانی پێ پێشكەش بكەم، بەڵام لام وایە كە خۆشخوانییەكەی، لە هەزار لاپەڕەی سپاس و ستایشی من، چاكتر خوێندەوارانی هاواری خۆشەویست لە شاعیرەكەی شارەزا ئەكات.

شیعرەكان زۆر جوان ڕێك نەخراون، ناڕێكن، بێ سەرو پێن. بەڵام توخوا ئێوە بڵێن، فرمێسكانی خوێنینی چاو، دڵۆپی شەونمی گوڵ، هەنسكانی بە كوڵی شێوەن، خەوانی خۆشی رابردوو، هیوایانی شیرین، لە مەودوا لەوە جوانتر ڕیز ئەكرێ؟!. ئەگەر ئەكرێ ئێوە خۆتان لە باتی من و(م....)ی هاوڕێشم بیكەن، سەرەڕای چاكە گەلی سپاسیشتان ئەكەین. لە دواییدا ئەوەندە بزانن كە من چە دەستێكم نییە لە دانان و ڕێكخستنی ئەم شیعرانەدا، تەنها ئەوەندە هەیە كە(م....) خۆی كوڕێكی زۆر شەرمنە، نووسینەكانی خۆی، دڵۆپانی فرمێسكی، خەندانی زاری، غونچانی هیوای لە منیش ئەشارێتەوە، نەوەكو گاڵتەی پێ بكرێ، بەڵام من ئەم چەند شیعرەیم دەستكەوت و لە قینی ئەو (بۆ) خوێندەوارانی خۆشەویستی هاواری ئەنێرم، ئینجا ئەوانیش یا گاڵتەی پێ ئەكەن وەكو خۆی ئەزانێ، یا ستایشی ئەكەن وەكو من ئەزانم.

(س .....)

(١)

دڵەی زامدارم بۆچی ئەناڵی
بۆ تۆش گێرودەی دوودیدەی كاڵی
خوێنینی وەك گوڵ، ڕەنگین وەكو دڵ
بەرەی شەماڵی تۆش وەك خاكو خۆڵ

(٢)

دیدە چون لێزمەی بارانی بەهار
ئەشكی خوێنینت پێدا یەتە خوار
گریان كردەوەی بێ دەسەڵاتە
بێ دەسەڵاتان ئەمرن لە ژێر بار

(٣)

دوو بەرگەی كتێب بگرەو بخوێنە
هاوڕێی دانا بە نەزان مەدوێنە
گەردن ئازاد كە لە كۆتەی دیلی
یا ئازاد بژی یا خود مەمێنە

(٤)

برینی كۆنم كولایەوانێ
بەفری خەیاڵم توایەوانێ
باڵندەی بەختم جێگەی گیر بووبوو
بە ناڵەی حەزین تەرایەوانێ

(٥)

ژیام سەردەمێ بە كەیف و خۆشی
بە شادی كڕین بە غەم فرۆشی
دڵەی زامارم ئارامی نەگرت
تاكو لە بادەی عەشقم نەنۆشی

(٦)

ئەو ساكە چوومە ڕیزی دڵداران
بوومە سەرداری هۆزی هەژاران
(بیابنیشین جەپای دیواران)
(زنجیر لە گەردن چون گوناهكاران)

(٧)

شادی ژیانم وە بیناتەوە
كوورەی دەروونم وە گۆناتەوە
(شیرین بێرە لام نوور وەپاتەوە)
(دەرمانی دەردم هاوەلاتەوە)

(١٠)

بێ دابنیشین جەبن چناران
لە چاوی مەستی دیدە خوماران
بەری بەیان و سەر لە ئێواران
بادە بنۆشین بە یادی جاران

(١١)

بێ دابنیشن دیدە پڕ ئەسرین
تۆی هەمدەمی چاك تۆی یاری دێرین
(ئەوا بەهار هات كەژو كۆ ڕەنگین)
(دڵی عالەم شاد دڵەی خۆم غەمگین)

(١٢)

ئەوا بەهار هات بە سەیرانەوە
بە لێ لێ و لۆلۆ بە حەیرانەوە
بەلەنجەو لاری نیگارانەوە
بە دەنگی خۆشی هوزارانەوە

(٨)

شیرین هەتاکەی دووری بچێژم
فرمێسکی خوێنین تاکەی بڕێژم
تاکەی لە گۆشەی دڵی زارمدا
غونچەی گەنجێتی و جوانی بنێژم

(٩)

بێ دابنیشین لە نێو ڕەزانا
غونچە بکێشین وە ڕووی خەزانا
من بە گوڵ دزی تۆ بە دڵ دزین
هەزار پەل بدەین وە پشت دزانا

(١٥)

خۆشی لە عالەم دوور لە دڵەی من
(شەڤنم) بۆ خاران دوور لە گوڵەی من
زنجیر پیرۆزە دڵ مردووان بێ
بژی بە مەردی ئاسکە سڵەی من

(١٦)

شێوەی شیرین کەلی خوێنینم
شیرێکەی لەسەر زامی برینم
یەگانە هیوا و غایە لە ژینم
ئەوەیە (تۆلەی) ولات بینم

(١٧)

بادەی مە دەبا ئەسرینی چەم بێ
خۆراکی مەبا هەر دەردو غەم بێ
دوایی لە خوێنی دوشمن دەست ئەشۆین
هەر چی چۆنێ بێ هەر چەندە کەم بێ

(١٣)

بەهار هاتەوە خۆشی لە یاران
خۆشی لە درەخت خۆشی لە داران
خۆشی لە کۆڕی بادە گوساران
خۆشی لە بولبول خۆشی لە خاران

(١٤)

خۆشی لە مردە خۆشی لە زیندوو
لە پیرە مێردان، لە جوانی گاروو
خۆشی لە چاوان خۆشی لە زاران
خۆشی لە دار و  خۆشی لە پەدروو

(١٨)

بێ دابنیشین دوور بین لە شادی
بمرین بە مەردی و گەردن ئازادی
بمرین لە ڕێگەی تۆلەسەندنا
نەك بە ئەسیری و بە نامرادی

(١٩)

نەڕێژین ئەشکی هەر وەکو باران
بچێژین دەردو داخی هەژاران
بنێژین داری شیرین و ئاشتی
دڵان شاد بکەین بە یادی جاران

(٢٠)

بێ دابنیشین لە نێو گوڵشەنا
لە بن سێبەری دارو دەوەنا
بۆ سەربەخۆی و پێشکەوتنی کورد
گوفتوگۆ بکەین لە تەك وەتەنا

(م .....)

گۆڤاری هاوار

ژ/١٩، ساڵی (١٧ ـ نیسانی ١٩٣٣، لا(٦ ـ ٧))

## سەرچاوەکان

١ـ کتێب / أ ـ کوردی:

١ـ بەرەو ڕووناکی ـ سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد، ئومێد ئاشنا، سلێمانی، ١٩٩٦.
٢ـ برایم ئەحمەد ـ دەنگێکی زوڵاڵی شیعری نوێی کوردییە، ئەڤین عەبدولقادر مەعروف بەرزنجی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٣ـ برایم ئەحمەد ـ ژیان و بەرهەم و داهێنان، ئەحمەد شەریف، چاپخانە و کۆمپیوتەری بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٤ـ برایم ئەحمەد ـ کۆی بەرهەمە شیعرییەکانی، عومەر مەعروف بەرزنجی، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٥ـ برایم ئەحمەد ـ لە کارە زانستی و ئەدەبییەکانی پرۆفیسۆر د. مارف خەنەدار، عومەر مەعروف بەرزنجی سلێمانی، ٢٠٠٤.
٦ـ ـ برایم ئەحمەد ـ ڕۆڵی لە بزاڤی ڕزگاریخوزای و ڕووناکبیری گەلی کورد دا، ئامانج حەسەن ئەحمەد، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٧ـ بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، د. دڵشاد عەلی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ١٩٩٨.
٨ـ دەقی ئەدەبی ـ ئەدگار. چێژ. بەها، د. فوئاد ڕەشید، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.
٩ـ دیوانی بێسارانی، حەکیم مەلا سالح، کتاب مهرگان، سنندج، ١٣٧٥.
١٠ـ دیوانی سالم، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٢.
١١ـ ڕەوانبێژی، بۆ پۆلی دووەمی پەیمانگای مامۆستایان، عەزیز گەردی، چاپخانەی ئارام، ٢٠٠٥.
١٢ـ زمانناسی و هەندێ بابەتی زمانناسی کوردی، سەلام ناوخۆش بەکر، بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٤.
١٣ـ ژانی گەل، ئیبراهیم ئەحمەد، چاپخانەی کاکەی فەلاح، سلێمانی، ١٩٧٢.
١٤ـ سەروا، د. عەزیز گەردی، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ١٩٩٩.
١٥ـ شیعرییەتی دەقی چیرۆکی کوردی، هێمن عومەر خۆشناو، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١٠.
١٦ـ شیکردنەوەی دەقی شیعری لە ڕووی زمانەوانییەوە، عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵڵا، سپیرێز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٧ـ کەشکۆڵە شیعرێکی کوردیی گۆرانی، ئەنوەری سوڵتانی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠١٠.
١٨ـ کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، عەزیز گەردی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩.
١٩ــ گۆران، نووسین و پەخشان و وەرگێڕاوەکانی، ئومێد ئاشنا، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢.
٢٠ـ مێژووی ئەدەبی کوردی، د. مارف خەزنەدار، ب٧، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.
٢١ـ وێنەی شیعری لە رێبازی رۆمانسی کوردیدا، عەبدولقادر محەمەد ئەمین، دەزگای پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٢٢ـ هەردی و رۆمانسیزمی خود، کەمال میراودەلی، خەندان بۆ پەخش و وەشاندن، سلێمانی، ٢٠٠٧.

**ب/ عەرەبی:**

٢٣ـ أغاني كردستان، معروف خزنەدار، مطبعة أسعد، بغداد، ١٩٥٦.
٢٤ــ البدايات في النص الروائي، صديق نورالدين، دار الحوار للنشر والتوزيع، ط ١، اللاذقية، ١٩٩٤.
٢٥ـ تحليل النص الادبي، محمد عبدالغني المصري و..، ط ١ الوراق للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٢.
٢٦ـ الشحنة الديناميكية في الابداع الرومانسي، د. نيان نوشيروان فؤاد، ط ١، دار سردم للطباعة ، السليمانية، ٢٠٠٦.
٢٧ـ شعرية القصيدة العربية المعاصرة، د. محمد العياشي كنوني، عالم الكتب الحديث، الاردن، ٢٠١٠.
٢٨ـ علم لغة النص، د. عزة شبل محمد، ط٢، مكتبة الاداب، القاهرة، ٢٠٠٩.
٢٩ـ القصيدة العربية الحديثة، د. محمد صابر عبيد، ط٢، عالم الكتب الحديث، الاردن، ٢٠١٠.
٣٠ـ اللغة العليا، جان كوين، احمد درويش، ط٢، المجلس الاعلى للثقافة، دمشق، ٢٠٠٠.
٣١ـ مملكة النص، محمد سالم سعدالله، ط ١، عالم الكتب، الحديث، الاردن، ٢٠٠٧.

**ج/ فارسی:**

**٣٢. انواع ادبی، دکتر سیروس شمیسا، چاپ دهم، انتشارات فردوس، تهران، ١٣٨٣.**

**٣٣- زبانشناسی نوین، نیل اسمیت، دیردری ویلسون، ترجمة، ابو القاسم سهیلی، مؤسسة انتشارات آگاه، تهران، ١٣٧٤.**

**٣٤. فرهنگ فارسی - دکتر محمد معین، ج ٤، مؤسسة انتشارات امیرکبیر، تهران، ١٣٦٠.**

**٣٥. فنون بلاغت وصناعات ادبی، استاد علامه جلاالدین همایی، نشر هما، چاپ چهارم، تهران، ١٣٧٧.**

**٢. گۆڤارو رۆژنامە و بڵاوكراوە:**

**أ - كوردی:**

٣٤ - گۆڤارا پرێز، وەشانخانەیا سپیرێز، ژمارە (١)، سالا: ٢٠٠٨.

٣٥- گۆڤاری رزگاری، ژ(٦)، ساڵی ١، تەمووز ١٩٦٩.

٣٦- زمانەوان، وەرزنامەی زانستی كۆڕی زانستی زمانی كوردی - ئێران، ژمارە (٣)، ٢٠٠٧.

٣٧- گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە(٩)، ساڵی ٤، ئەیلوول ١٩٤٣.

٣٨- گۆڤارا هاوار، ژمارە (١٩)، ١٧ نیسانی ١٩٣٣.

٣٩- یادگاری لاوان، چاپخانەی كەرخ، بەغدا، ١٩٣٣.

**ب - عەرەبی:**

٤٠- مقاطع من الذكرى والامل - رائعة الاستاذ ابراهیم احمد، جریدة الاتحاد، العدد (٤٦٨)، ٢٠٠٢/٤/١٤.

**ملخص البحث:**

## البنية الشعرية في قصيدة ( يادگار و هيوا )
## لإبراهيم أحمد

عرفت بداية ثلاثينيات القرن الماضـى، حركـة أدبيـة وثقافيـة تجديديـة واسـعة شملـت مجالات تنقية اللغة الكردية، والابداع في انواع ادبية حديثة من شـعر ونثـر واتجاهـات نقديـة رائدة.

ظهرت في تلك الاونة القصيدة المسماة ب(الذكرى والامل) للرجل اللامع المبدع الاسـتاذ (ابراهيم أحمد) الملقب ب(بله)، الى جانب بـضعة نتاجـات مـن النثـر الفـني والنقـد الادبـي للكاتب نفسه. كان للقصيدة هذه دور ريادى مهم وبـارز في دفـع الحركـة التجديديـة للـشعر الكردي الى الامام وفي ظهور القصيدة الكوردية الحديثة من حيث:

- البساطة في اللغة وسلاسة الاسلوب ونقاوة الكلمـات والتعـابير وتجنـب اللغـة الـشعرية القديمة المعقدة والمزركشة.

- انبعاث المدرسة الادبية الحديثة في الشعر الكـردي، المـسماة بالمدرسـة الرومانطيقيـة والرومانطيقية الثورية بوجه خاص.

- إشاعة استعمال لغة قومية خالصة ونقية في الادب والـشعر والثقافـة الكرديـة بـصورة عامة.

– إحيـاء قـاموس لغـوي أصـيل والابتعـاد عـن المفـردات والتعـابير الاجنبيـة الدخيلـة واستعمالاتها في النتاجات الادبية والثقافية.

– شـيوع القـصيدة ذاتهـا لمـا لهـا مـن خـصائص مرتبطـة بـشكلها الفـني الحـديث، ومضامينها ذات البعد القومي الثوري، ولما لها من مميزات الايقاع الفني والاسلوب المبـدع والنواحي الجمالية ذات البعد الرومانسي...

كـل ذلـك لفـت انتبـاه الباحـث الى تنـاول تلـك القـصيدة وتحقيقهـا مـن خـلال النـسخ المنشورة خـلال الاعـوام الـسبعين مـن عمـر القـصيدة، ومـن ثـم دراسـة وتحليـل النـواحي الابداعية والاسس الجمالية التي اضفت ملامح الشعرية الفياضـة علـى القـصيدة نفـسها مـن خلال بنياتها الفنية والادبية.

يتألف البحث أساساً من مقدمة وتمهيد وثلاثة فصول، تم تناول كل فـصل مـن خـلال مباحث وفقرات عديدة وعلى الشكل الآتي:

## ABSTRACT

Poetic StrcturesIn" yadgar and Hiwa" of Ibrahm Ahmad The begining of Therties of the last century Withnessed aliterary, cultural and modern comprised serveral Fields such as purification of kardish language innovation in same genres of new literature as poetry and prose and critical trends.

During that time, this Poem "yadgar and Hiwa" of Ibahim Ahmad appeared as well as number of other literary products. This poem participated in:

- purification of Kurdish language.
- Birth of anew school in kurdish literature which resembled Roman ticism and revolutionary romantisim.
- Using an eloqnent national language in literature, poetry, and general Kurdish culture.
- Renovation of an orginal and national wordis dictinary, avoiding using foreign vocabulaies.
- Dess imination the Peom itself due to its properties such its new artistic form, national revolutionary context, rythmical charater, and its aesthetic and romantic views. So, the researcher has analyzed this poem and discriminating the Originality of the poem then stadied its aesthetic, artistic Structure and poetic dicton.

The stady consists in a preface, prelude and three preface, prelude and three chapers. Each chapter comprises anumber of Subjects as following:

# بەراوردیٚ لەنیٚوان شیٚخی سەنعانی فەقیٚ تەیران و تیٚکستیٚکی عەرەبیدا

د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان
زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر
کۆلێژی زمان – زمانی کوردی

## پێشەکی

ئەو حەکایەت و داستانانەی کە لەناو میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا باون، هەندێکیان لە ڕەگ و ڕیشەیەکی لێکچووەوە سەریان هەڵداوەو لە هەر شوێنێك تۆمارکرابن سروشتی ئەو شوێنەیان وەرگرتووە و بەپێی ئارەزووی نووسەرەکە یاخود حەکایەتخوانەکە شتیان بۆ زیاد کردووە و لێیان قرتێنراوە.

یەکێك لەو داستانانەی یاخود لەو حەکایەتانەی کە لەناو میللەتانی عەرەب و فارس و کورد باوە حەکایەتی شێخی سەنعانە، پاڵەوانی ئەم داستانە لای فارس و کورد (شێخی سەنعان)ە و بەڵام لە یەکیٚ لە تێکستە عەرەبییەکان ناوی بووەتە (أبو عبدالله الاندلسی). لە دەقە عەرەبییەکەدا ئەم حەکایەتە لەسەدەی سێیەمی کۆچی لەبەغدا سەری هەڵداوە و پاڵەوانەکەی سۆفییەکی قوتابخانەی سۆفیگەری بەغدا بووە و هاوچەرخی ( جونێد ٢٩٧ ك ) بووە.

بەگشتی ئەم جۆرە حەکایەتانە لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا گرنگییان پیٚ نەدراوە و وەکو ئەدەبی سەرزاری ماونەتەوە هەرچەندە لە بنەچەدا عەرەبی بوونە.

جگە لەم حەکایەتە، حەکایەتی لەیل و مەجنوون کە لە سەردەمی ئەمەوییەکان لە دەوروبەرێکی عەرەبی سەری هەڵداوە، کەچی میللەتە موسڵمانە

ناعەرەبەکان بەتایبەتی فارسەکان وەریانگرتووەو بەرهەمێکی نایابیان لەسەر بنیات ناوە و دواییش کورد و تورك سوودیان لە فارسییەکە وەرگرتووە.

شێخی سەنعان بۆ یەکەم جار لەئەدەبیاتی فارسی وەکو دەقێکی هونەری پەیدابوو و لە ئەدەبی سەرزارییەوە گەیشتە ئەدەبی نووسراو، هەندێ ڕایان وایە لەوانەش (مجتبی مینوی) کەوا ((کتێبی – تحفة الملوك – ی غەزالی سەرچاوەی ئەو داستانەیە))[1]. بەڵام گەلێ لە لێکۆڵەرەوە تازەکان لەوانەش (منوچهر مرتضوی) پێیان وایە کە ((عەتاری نیشابووری یەکەم شاعیر بووە کە بەم جۆرە شێخی سەنعانی هۆنیوەتەوە))[2].

ئەم حەکایەتە تەنیا بەناوی شێخی سەنعانەوە نەهاتووە، بەڵکو یەکێکە لە کۆمەڵە ناوێك، وا هەندێك لەوانە دەخەینە بەرچاو:

١– لای (فرید الدین عطار ) شێخی سەمعان بووە.

٢– لە کتێبی ( غیاث اللغات) شێخی سەنعانە و مورید ی عبدالقادری گەیلانییە[3].

٣– بەناوی (ابن سقا ) هاتووە و چووەتە قوستەنتینییە و لەوێ عەشقی کچە دیانەك بووە و بۆی لە ئایین وەرگەڕاوە[4].

٤– محەمەدی سوودی بە (عبدالرزاق یمنی) ناوی دەبات و پێی وایە بەیتە شیعری (دوش أز مسجد سوی میخانه أمد پیرما) ئاماژەیە بەو شێخە[5].

٥– لەلایەکی دیکە بە (عبدالرزاق صنعانی) یش هاتووە کە گوایە لە ١٢٦ ی کۆچی لە دایك بووە و لە ٢١١ ك. مردووە.

٦– لە کتێبی (المستطرف في کل فن مستظرف) بەناوی (أبوعبدالله الاندلسی)یە[6].

جگە لەمانەش بەکۆمەڵە ناوێکی دیکەش هاتووە و لێرەدا جێگەی ئەم درێژدادرییە نابێتەوە.

لە سەرنجدانی ئەم ناوانە دەردەکەوێ کە ئەم حەکایەتە لەزۆر شوێندا بڵاو بۆتەوە و کەوتۆتە سەر زاران و ناوەڕۆکی بەگشتی یەکە و ناوی پاڵەوان و شوێنی ڕووداوەکان جودان.

دوای ئەوەی ئەم حەکایەتە لەلایەن عەتارەوە تۆمار کرا، بووە بەشێك لە ئەدەبیاتی فارسی، ئەوجا ئەو بەرهەمە وەکو ئەوانی دیکە بڵاوەی لیٚ کرد و کوردستانی گرتەوە و خوێندەوارانی کورد لەو سەردەمەدا مەلا بوون و دەرچووی حوجرە و مزگەفتەکان بوون ئاشنایەتییان دەگەڵ ئەدەبیاتی فارسیی هەبوو کە لە حوجرەکان دەخوێندرا ئەوانیش وەریان گرت و بە شیعر تۆماریان کرد.

فەقیٚ تەیران کە لە ١٠٤١ ك. زیندوو بووە چاوی بەشێخی سەنعانی عەتار کەوتووە و پێی کاریگەر بووە و چاوی لیٚ کردۆتەوە و لەشێوەی دووبەیتی ئەم داستانەی بەکرمانجی ژووروو هۆنیوەتەوە.

لەبەرئەوەی ئەم نووسینە لەنێوان دەقەکەی فەقیٚ تەیرانی کورد و دەقێکی عەرەبییە، بۆیە ئاماژە بەدەقە فارسییەکە ناکریٚ، چونکە ئەم بەراوردە لە نامەیەکی دوکتۆرا لە زانکۆی سەلاحەدین – کۆلێژی زمان– بەشی زمانی کوردی لەلایەن قوتابی (عماد وەیسی)یەوە ئەنجامدراوە، هەرچەندە بیٚ کەم و کورتی نییە.

ئەم کارە بەپێی هەموو قوتابخانەکانی ئەدەبی بەراوردکاری بەگشتی و فەرەنسی بەتایبەتی دەکەوێتە تای تەرازووی بەراوردی ئەدەبییەوە و بنەماکانی قوتابخانەی فەرەنسی لیٚ دێتە دی کە ئەمانەن: هەبوونی پەیوەندی مێژوویی و جیاوازی زمان و کاریگەر بوون و کارتێکردن . لێکۆڵینەوەکەش لە دوو تەوەرە دەخولێتەوە:

١– جیاوازییەکانی هەردوو دەقەکە لە چەند خاڵێکدا.

٢– لێکچوونەکانی هەردوو دەقەکە لە چەند خاڵێکدا. ئەوجا بەچەند خاڵیٚ ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە دیاری کراوە. بەهیوای ئەوەی کەلێنیٚ لە لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری کوردی گرتبێت.

### تەوەرەی یەکەم :

ئەم لێکۆڵینەوەیە کە بەناوونیشانی (بەراوردیٚ لەنێوان شێخی سەنعانی فەقیٚ تەیران و تێکستێکی عەرەبیدا) یە، بریتییە لە کارێکی بەراوردکاری، لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریش ((لە پەیوەندی ئەدەبی نێوان دوو نەتەوە یان دوو

نووسەر دەكۆڵێتەوە كە بەرهەمەكانیان لەیەك بچن و لەدوو نەتەوەی جیاواز بن))[7].

ئەم دوو بەرهەمەش هەرچەندە لە ڕووی سەردەمی بڵاوكردنەوەوە ماوەكی زۆر لەنێوانیاندا هەیە ، بەڵام ڕیشەیان دەچێتەوە سەر یەك و لە زۆربەی ڕووداوەكان هاوبەشن.

نكوولی لەوە ناكرێ كە شاعیرانی كۆنی كورد زیاتر كاریگەری شاعیرانی فارسییان لەسەرە و بەرهەمەكەی فەقێ تەیران لەوەی عەتار نزیكترە نەك لە تێكستە عەرەبییەكە، چونكە هەردووكیان بەشیعرن و پاڵەوانی سەرەكییان شێخی سەنعانە . بەڵام لەبەرئەوەی بەپێی زانیاری من تائێستا تێكستە عەرەبییەكە لەگەڵ شێخی سەنعانی فەقێ تەیران بەراورد نەكراوە، بۆیە هەوڵدرا ئەم كارە جێبەجێ بكرێ.

ئەگەر فەقێ تەیران دەقە عەرەبییەكەشی نەدیبێ ئەوا لە عەتاری وەرگرتووە و عەتاریش لە سەرچاوە عەرەبییەكانی وەرگرتووە.

دان و وەرگرتنی ئەدەبی لە نێوان میللەتاندا بەردەوام بووە و هەر بەردەوام دەبێ چونكە ((ئەدەبی نەتەوایەتی بەرهەمی بەهرەی ئەدەبەكانی تر هەڵدەمژێ و سوودیان لێ دەبینێ، لەهەمان كاتیشدا ڕەسەنایەتی خۆی دەپارێزێ و شەقڵی نەتەوایەتی ناشكێنێ))[8].

ئەم دوو تێكستە دەتوانرێ پرۆگرامی قوتابخانەی ئەدەبی بەراوردكاری فەرەنسی و بنەماكانی دەقئاوێزانی (التناص) لەسەر جێبەجێ بكرێت. زاراوەی دەقئاوێزان لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی دانراوە[9]. لە عەرەبی وشەی (التناص)ی بۆ بەكارهاتووە كە بەواتای بۆ Intertextuality – چەند دەقێك دێ كە یەكدی لەباوەش دەگرن[10].

ئەم زاراوەیە لە زمانی فارسیدا بەم شێوەیە هاتووە (آمیختن) بەواتای تێكەڵكردن، هەروەها (آمیخته كردن) بۆ نموونە (در حال آویختن) واتا لە دۆخی هەڵواسیندا[11]. لە زمانی كوردیش زاراوەی (دەقئاوێزان)ی بۆ بەكارهێنراوە كە لە (تناصی) ی عەرەبییەوە وەرگێراوە.

دوای ئەم گوتە كورتە بەرەو لایەنی پراكتیكی لێكۆڵینەوەكە هەنگاو دەنرێ و بەنموونە تێكستەكان و بۆچوونەكان دەسەلمێنرێن.

## لایەنی پراکتیکی لێکۆڵینەوەکە
## جیاوازییـــەکان

١ –دەستپێکردنی تێکستەکان: فەقیٚ تـەیران وەکـو شـاعیرێکی موسـڵمان بەناوی خودا دەستی پێکردووە، چونکە هـەر کـاریٚ بـەناوی خـودا دەسـتی پـیٚ نەکریٚ بیٚ خێرە ((کل أمر ذي بال لَم يبدأ باسم الله فهو أبتر)).[سەرچاوە]

پاشان وەسفی خود و سیفەتەکانی خـودا دەکـاو هـەموو عەشـقێك بـۆ خـودا دەگێڕێتەوە و لە هەمان کاتدا خودا دەکاتە دڵدار و دولبەر ، چونکە لە سـەرەتادا خودا عەشقی جوانی خۆی بووە:

فەقیٚ تەیران

| | |
|---|---|
| گـــوهـــدێرن نوتقا عـــاشـــقی | دا ئەز بخوونم ڤیٚ خـــــەتیٚ |
| حەمـــد و ســـــــەنایا خـــالقی | سوبحان ژ شاهیٚ قودرەتیٚ |
| ســــــوبحان ژ شاهیٚ زولجەلال | فکریمە نەقشـــیٚ بیٚ زەوال |
| حال بیٚ مەجــــاز نا ئێتە بال | کامـــــل دبت د ئولـــــفیەتیٚ |
| عاشــــق تویـــــی دولبەر تویی | نازیر تویی مەنـــزوور تویی |
| رووحیٚ رووحان گەوهەر تویی | میســــــباح و دوڕا قیمەتیٚ |

*دیوانی فەقیٚ تەیران، سەعید دێرەشی، ل٣١٣*

بـەڵام حەکایەتـە عەرەبییەکـە بـیٚ پێـشەکی بـە شـێوازی گێڕانـەوە دەسـت پێدەکات بیٚ وەسف و ڕازاندنەوە و هەڵبژاردنی وشەو خولقاندنی کەشێکی شیعری و ستایـشکردنی خـودا (( حكـي انـه كـان بمدينـة بغـداد رجـل يعـرف بـأبي عبـدالله الأندلسي ..... )) المستطرف/١٥٣.

٢ – لای فەقیٚ تەیران شێخەکە شێخی سەنعانە و (٥٠٠) موریدی هەیە، بەڵام لە تێکستە عەرەبییەکە شێخەکە ناوی (أبو عبدالله الأندلسي) یە و خاوەنی (١٢٠٠٠) موریدە، بۆ نموونە:

فەقێ تەیران

**شەیخەك هەبوو سەنعانیان سەرداری پانسەد سۆفییان**

*دیوانی فەقێ تەیران، ل٣٢٣*

تێکستە عەرەبییەکە

(( كان بمدينة بغداد رجل يعرف بأبيٍ عبدالله الأندلسي وكان شيخاً لكل من العراق ..... وعدد مريده اثنا عشر ألفاً)) ـ المستطرف في كل فن مستظرف، ص١٤٣.

سەرەڕای ئەمە لای فەقێ تەیران سەردەمەکەی دیار نییە و شوێنەکەی یەمەنە بەڵام لە سەرچاوە عەرەبییەکە شوێنەکەی بەغدایەو شێخ لە سەردەمی (شبلی و جونێد)دا ژیاوە کە دەکاتە کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی چونکە جونێد لە ٢٩٧ ك. مردووە.

٣- لە سەرچاوە عەرەبییەکە وەکو حەکایەتێ ئەم داستانە دەگێڕدرێتەوە و لە توێی دوو لاپەڕەدایە و گرنگی بە لایەنی ئەدەبی نەدراوە و لەوەی فەقێ واقیعی ترە، بەڵام لای فەقێ تەیران پۆشاکێکی سۆفییانەی بەبەردا بڕاوە و باسی لایەنەکانی دەروونی سۆفی دەکات لە: جەزبە و حاڵ و مەقامی سۆفییانە، هەروەها بەدرێژی وەسفی شێخ دەکات لە هەموو لایەنێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و ڕۆشنبیرییەوە و پێوەنانێکی زۆری پێوە دیارە، بێ گومان ئەمەش لەبەرئەوەیە کە شیعرە و شیعریش پێویستی بەم جۆرە ڕازاندنەوانە هەیە:

فەقێ تەیران

**حەز بە چ ڕەمزا چاڤییە مەبـــدەء چ حاڵـی خافییە**

**تێتن د دلــدا تاڤییـــە مەوجەك ژ بەحرا حیکمەتێ** /٣٢٤

تێکستە عەرەبییەکە

دەقەکە حەکایەت ئامێزەو حەکایەتخوانی هەموو شت زان دەیگێڕێتەوەو دوورە لە ڕەوانبێژی و وەسفی شیعریانە ((كان بمدينة بغداد رجل ............ )). المستطرف، ص١٥٣

لایەنێکی دیکەی سۆفییانە لـە دەقەکـەی فـەقێ تەیرانـدا ئەوەیـە، کـە شـێخ جـوانی خـوایی لـە دەموچـاوی کـچەکە بینیـوە بۆیـە عەشـقی بـووە، چـونکە سەرچاوەی جوانییە و جوانییەکەی هەمیشەییە و لەناو ناچێت، بۆنموونە

**نارێ کچێ داگـــر هناڤ      دێمـــا کوتێـــدا نوورو تاڤ**

**عەکسا ئیلاهی هاتە ناڤ      موزهیر دییە سەبر ژێ نەتێ /٣٤٩-٣٥٠**

٤- شێخی سەنعان و حەجکردن:

لە تێکستە عەرەبییەکەدا باسی حەجکردنی تێدا نییە، بـەڵام فـەقێ تـەیران لە چەند جێگایەك لە داستانی شێخی سەنعانەکەیدا باسی ئـەوە دەکـات کـە شـێخ حاجییە و پەنجا حەجی کردووە و خاوەن کەرامەتە.

فەقێ تەیران

**شەیخێ مە شەیخەك حاجییە      حەمیان کەرامەت ژێ دییە /٣٥٦**

**ئەو تاعەتێ تەی بێ حیساب      پەنجە حەج و پەنجە ڤە واب /٣٨١**

٥- تەمەنی شێخ: لای فەقێ تەیران تەمەنی (٧٧) ساڵەو لە بەیتە شیعرێکدا دەڵێ نزیکی هەشتا ساڵ بووە، بەڵام لە حەکایەتە عەرەبییەکە باسی تەمەن نەکراوە:

فەقێ تەیران

**هەفتێ و هەفت ساڵی تەمام      خالی نەبوو ژڤێ خـــدمەتێ /٣٢٨**

**ئەو پیرەمێری کـــال بوویی      نێزیکی هەشتێ سال بوویی /٣٥٣**

٦- چۆنیەتی دیتنی کـچەکە لەلایـەن شـێخەوە: لـە حەکایەتـە عەرەبییەکـە شێخ بۆ گەشت دەچێ و ڕێگـەی دەکەوێتـە گونـدێکی گاورەکـان و لـەوێ عەشـقی کـچەکە بـووە، بـەڵام لای فـەقێ تـەیران شـێخ خـەون دەبـینێ و لـە خەونیـدا حۆرییەکی بەهەشت لە سـەربانی کەنیسـەکەوە بـۆی دەردەکـەوێ و پێکـی مـەی دەداتە شێخ و پێی مەست دەبێت، ئەوجا سۆفییەکان لەگەڵ شێخ تەگبیر دەکەن کـە بگەنـە ئـەو شـوێنە و کـە دەچـن دەسـت بـە زیکرکـردن دەکـەن و کـچەکە لەپەنجەرەوە خۆی نیشان دەدا و شێخ عەشق و گیرۆی داوی دەبێت:

فەقێ تەیران

**با تینی کچ ڤـە دخوینی پەردەیێ ژبەر خوە هلتینی**
**شـێخ دخـەونیدا دبینی جام و تاسـەك مەی ددەتێ /٣٣٧**
**سوَڤ جەڤیابوون ب شەڤە حەتتا ستێرا سـەعادەتێ /٣٥٧**
**وێ سـاعەتێ سـوارکرن زاد و زەوادە کـارکـرن**
**قەسـدا کچا کوففار کـرن یا رەب تو خێر کەی نییەتی /٣٥٩**

تێکستە عەرەبییەکە

((فخرج في بعض السنِين الى الساحة ومعـه جَماعـة مـن أصـحابه مثـل الجنيـد والشبلي وغيرهما من مشايخ العراق ....... الى أن وَصَلنا الى قرية مـن قـرى الكفـار ....... وإذا نحن بكنائس ..... ثم انصرفنا الى بئر في آخـر القريـة وإذا نحـن بجـوار يستقين الماء على البئر وبينهن جارية حسن الوجـه ......فلمـا رأهـا الـشيخ تغـير وجهه........ثم اقام ثلاثة أيام لايَأكل ولايَشرب........ )) المستطرف/ ص١٥٣.

هەروەها لە تێکستە عەرەبییەکەدا کە شێخ چاوی بەو کچە دەکەوێ کەوا ئـاو دەکێشێ، دەپرسێ: بۆچی باوکی نازی راناگرێ و ئاوی پێ دێنێ؟ گوتیان : باوکی بۆ ئەوەیەتی هەرکە مێردی کـرد رێـزی پیاوەکـەی بگـرێ و خزمـەتی بکـات، ئـەم خاڵـە جـۆرە واقیعـەتێك بەحەکایەتەکـە دەدات، بـۆ نموونـە: ((فقـال الـشيخ: لم لايدللها أبوها ويكرمها ولايدعها تستقي الماء ؟ فقيل له أبوها يفعـل ذلـك بهـا حتـى اذا تزوجها رجل أكرمته و خدمته ولا تعجبها نفسها ....... )) المستطرف/ ص١٥٣

٧- **هاوڕێیـەکانی شـێخ :** لـە حەکایەتـە عەرەبییەکـە (شـبلی و جونێـد) و شێخەکانی عێراق لەگەڵ شێخدان و (شبلی) حەکایەتەکە دەگێڕێتـەوە، بـەڵام لای فـەقێ تـەیران نـاوی کـەس نییـە و تـەنیا موریـدەکان لەبـەردەم کـچەکە زیکریـان دابەستاوە بۆئەوەی کچەکە خۆی نیشا بدا و شێخ بەدی بکات:

فەقێ تەیران

**عاشق لە مەعشووق فەڕجی بەحرا ئەڤینێ مەووجی**
**مورشید دخوونێ کـە پچی ژ تیرا کڤانێ جەبهەتێ /٣٦٨**

لـەم بەیتـەی سـەرەوەدا شـێخ خـەڵتانی خوێنـە و پێکـاوی تـیری ناوچـەوانی کچەکەیە و دەریای ئەوینی شەپۆلی داوە.

**چەشمێ دوێ حووری پەچێ سـوَڤ ژ عەشـقا وێ کەچێ**
**چەرخان ددەن ل دێرا نـەچێ زاهید بکەن بوّی حوججەتێ /٣٦٦**
**دەنگی موریدان چوو فـەلەك دێـــرا کو راهیب تێ گەلەك**
**واهاتە پێش پاچاڤ بەلــــەك هــاتــە شـــباکا قیبلـەتێ /٣٦٧**

تێکستە عەرەبییەکە:

((قالَ الشبلي: فتقدمَت اليهِ فقلت يا سَيدي أن اصحابك ومريديك يتعجبـون من سكوتك ..... قال: يا قوم اعلموا ان الجارية التي رأيتها أمس قد شغفت بها حباً ..... )) المستطرف/١٥٣.

٨- گەڕانەوەی هاوڕێیەکانی شێخ بۆ بەغدا: لە سەرچاوە عەرەبییەکە دوای ئەوەی شێخ گیرۆدەی کچەکە دەبێ، ئەوانیش بەناچاری دەگەڕێنەوە بۆ بەغـدا و هەندێ لە شێخ و موریدەکان کە گوێیان لەو خەبـەرە دەبـێ لـە داخانـدا دەمـرن و خانەقا و تەکیـەکان دەرگایـان دادەخـرێن، بـەڵام لـە داسـتانەکەی فـەقێ تـەیران ئەمانە نین.

تێکستە عەرەبییەکە: ((ثم انصرفنا عنه راجعين الى بغداد، فخـرج النـاس الى لقائه فلم يروه، فسألوا عنه، فعرفناهم بماجَرى، فمات من مريـده جماعـة كـثيرة حزناً عليه ..... و غلقت الرباطات والزوايا والخوانق)) . المستطرف/١٥٣

٩- باوکی کچەکە و مەرجی بە شوودانی کچەکەی : لە تێکستە عەرەبییەکە کچەکە کچی گەورەی گوندەکەیەو کچەکە باوکی ماوە و کـە شـێخ داوای کـچەکەی لێ دەکات، باوکی مەرجی بوونە مەسیحیەتی بۆ دادەنێ، بەڵام لای فەقێ تەیران باوکی کچەکە دیارنییە و کچەکە خوّی مەرجەکانی لەسەر شێخدا دەسەپێنێ:

فەقێ تەیران

**دلبەر دبـێ یا مێر مــەزن ئیـــروّ ژتـــە تێتن کــفن**
**محــەمەدی ناخـــوّن لمن ئەز عیسایی تو سوننەتێ/٣٩٩**
**ئەر قەبول دکەی زنارەکێ هــەڕوّ هــەڕوّ ئێڤارەکێ**
**ئەز تە ڤەخوینم جارەکـێ ب هـــەیجە تا زیـــافەتێ /٤٠١**
**روونین ل سەر دینا شەڤێ ئەر شەیخ دسووژی مسحەڤ**
**راســـتە جــەمالا من دڤێ حــەق و یەقین من ب تەنێ /٤٠٢**

تێکستە عەرەبییەکە :

((فقيل له ابنة ملك هذه القرية .... قالوا انه خطب الجارية من ابيها فـأبى أن يزوجها الا ممن هو على دينها ويلبس العباءة ويشد الزنار ... )) المستطرف/١٥٣.

١٠– برادەرانی شێخ، پێغەمبەر (ص) لە خەون دەبینن :

فەقێ تەیران لای وایە کە سۆفییەکانی برادەری شێخ پێغەمبەریان (ص) لە خەون بینیوە و موژدەی داونەتێ کە حاڵەتەکەی شێخی سەنعان رەحمانییە و نەفسانی نییە، کەچی ئەم خەونە لە حەکایەتە عەرەبییەکەدا نییە:

| | |
|---|---|
| ئـــەو ســـۆفییێ ئـەوراد ددەۋ | وان مەجلیسەك دانی ب شەۋ |
| شێخ سەحەرێ چاۋ چوونە خەۋ | زوو دێ شـــەفیعێ ئوممەتێ /٤٢١ |
| رووحی وی دی زاتی رەســوول | مزگێنیا شـــەیخ بوو قەبوول |
| ئیرۆ بـــدە خــــەلقێ مـــــەلوول | دا ســـەح بکین کەرامــــەتێ /٤٢٢ |
| داهوون نەبێن شـــــەیخ کـــافرە | زێـــــر باتینە، زیـــڤ زاهیرە |
| ژ هــــەردوو وەجـــهان تـــاهیرە | عیشـــقی برە تـــو هوورەتێ /٤٢٢ |
| حالـــــێ ل شـــەیخ رەحمانییە | داهـــوون نەبێن نەفسانییە |
| وی یــــەك دیــە یــەك زانییــە | دیـــن کرمە یا وەحـدانەتێ /٤٢٢ |

١١– شێخی سەنعان هاورێکانی سەری لێدەدەن :

لە حەکایەتە عەرەبییەکە شێخی سـەنعان لـە گوندەکـە بـووە بـەرازەوان، شبلی دەڵێ: هەموو دڵمان شەقی برد و لە پرمەی گریانمان دا و چووینە لای شێخ و بینیمان لە بەردەم بەرازەکان وەستاوە و کە چاوی بەئێمە کەوت سـەری شـۆڕ کرد و قولنسوەی دیانەکانی لەسـەر بـوو، خـۆی خـستبووە سـەر گۆچـانەکەی، ئەم چاوپێکەوتنە لای فەقێ تەیران بەدی ناکرێ.

تێکستە عەرەبییەکە

((قال الشبلي : فانصدعت قلوبنا وانهملت بالبكاء عيوننا وسرنا اليه واذا بـه قـدام الخنـازير، فلمـا رآنـا نكـس رأسـه واذا عليـه قلنـسوة النـصارى)) المستطرف/١٥٣.

١٢- پەشیمان بوونەوەو پاڕانەوەی شێخی سەنعان لە خودا:

لە حەکایەتە عەرەبییەکە باسی پەشیمان بوونەوەو پاڕانەوەی شێخی سەنعان دەکات لەخودا و شێخ دەری دەخات کە ئەم حاڵەتەی ئەم جۆرە قینێکی خوایی و دوورخستنەوەیەتی لەخۆی، ئەوجا روو لە شبلی دەکاو پێی دەڵێ پەند لەم ڕووداوە وەربگرە. شبلیش دەستی بەپاڕانەوە کرد و کە بەرازەکان گوێیان لە نووزانەوەو پاڕانەوەی شبلی و هاوڕێکانی بوو، ڕووی خۆیان لەزەوی خشاند و قیژەیەکی گەورەیان لێوە هات هەر دەتگوت قیامەت داهاتووە، کەچی لەلای فەقێ تەیران سۆفییەکان داوا لە شێخی عەتار دەکەن کە چارەیەکیان بۆ بکاو شێخی سەنعانیان بۆ بگێڕێتەوە، شێخی عەتاریش داوا لە سۆفییەکان دەکا بچنەوە لای شێخ و دوعای بۆ بکەن.

لێرەدا تەنیا گەڕانەوەی برادەرانی شێخی سەنعان بۆلای شێخ دووبارە بۆتەوە بەڵام ناوەکان گۆڕاوەو لە سەرچاوە عەرەبییەکە (شبلی)یە و لای فەقێ تەیران باسی شێخی (عطار) دەکات، کەچی (عطار) خۆی ناگەڕێتەوە و موریدەکانی شێخی سەنعان دەنێرێ:

فەقێ تەیران

| | |
|---|---|
| ئەو مورشیدێ شیرین نەزەر | بەهەڤ کرن ساحێب کەمەر |
| حەمیان ژ ماڵ هەودانەسەر | ژ زاکیران هنگا مەتێ /٤٢٠ |
| ئەو وەل گهانە جا یەکێ | ئیشەق بکین سەمایەکێ |
| ڤێکرا بکین دوعایەکێ | کانی نابینن روئیەتێ /٤٢١ |

تێکستە عەرەبییەکە

((فقال يا أخواني واحبابي ليس لي من الأمر شيئ ، سيدي تصرف كيف شاء وحيث أراد أن أبعدني عن بابه بعد أن، كنت من جملة احبابه، فالحذر الحذر يا أهل وداده من صره وابعاده، والحذر الحذر يا أهل المودة والصفاء من القطيعة والجفاء..... ونادى يا شبلي اتعظ بغيرك/ فنادى الشبلي بأعلى صوته بك المستعان وأنت المستغاث أكشف عنا هذه الغمة....فلما سمعت الخنازير بكائهم اقبلت اليهم وجعلت تمرغ وجهها بين أيديهم وزعقت زعقة واحدة دويت منها الجبال، قال الشبلي : فظننت أن القيامة قد قامت)) المستطرف /١٥٤.

١٣- گفتوگۆی شبلی و شێخی سەنعان :

دوای ئـەوەی بـەرازەکان قیژانـدیان، شـبلی بـە شـێخی سـەنعان دەڵـێ: لەگـەڵمان ناگەڕێیتـەوە بەغـدا؟ شـێخ گـوتی: چـۆن بگەڕێمـەوە؟ پێـشان دڵـی موریدەکانم پەروەردە دەکرد و ئێستا بەراز پەروەردە دەکەم. شبلی گـوتی : تـۆ قورئانت هەموو لەبەر بوو، ئێستا چیت لەبەر مـاوە؟ شـێخ گـوتی تـەنیا ئـەم دوو ئایەتەم لەبەر ماوە ((ومن یهن الله فما له من مکرم إن الله یفعل مایشاء/ ومن یتبدل الکفر بالإیمان فقد ضَّل سواء السبیل)). ئەوجا شبلی پێی گوت: یا شێخ تـۆ ٣٠٠٠٠ هەزار حەدیست لەبەر بوو، ئێستا چیت لەبـەر مـاوە؟ شـێخ گـوتی: تـەنیا ئەمـەم لەبیر ماوە((من بدل دینه فاقتلوه)). بەڵام ئەم گفتوگۆیە لای فـەقێ تـەیران دەس ناکەوێ.

تێکستە عەرەبییەکە

((قال الشبلي : فقلنا له هل لك أن ترجع معنا الى بغداد؟ فقـال: کیـف لـي بذلك وقد استرعیت الخنازیر بعد أن کنت ارعی القلـوب. فقلـت: کنـت تحفـظ القـرآن وتقرؤه بالسبع فهل بقیت تحفظ منه شیئاً؟ فقال: نسیت کله الا آیـتین ((ومـن یهـن الله فما له من مکرم أن الله یفعـل مایـشاء / ومـن یتبـدل الکفـر بالأیمـان ........)). فقلت یا شیخ کنت تحفظ ثلاثین ألف حدیث فهل تحفظ منهـا شـیئاً؟ فقـال: حـدیثاً واحداً وهو قوله (ص) (( من بدَّل دینه فاقتلوه)) المستطرف/١٥٤.

هەروەها لە حەکایەتەکە هاتووە، هەرکە شێخ بوویەوە موسـڵمان هەرچـی قورئـان و حەدیـسی لەبـەربوو هـەمووی بـەبیر هاتـەوە و بەزێدەکییـەوە (( وردَّ لله علیه ماکان نَسیه من القرآن والحدیث وزاده علی ذلك)) المستطرف/ص١٥٤.

١٤- هۆی وەرگەڕانی شێخی سەنعان لە ئایینەکەی :

لە سەرچاوە عەرەبییەکە دوای ئەوەی شێخی سەنعان لە گاوری دەگەڕێتـەوە سەر موسڵمانی، هاوڕێیە سۆفییەکانی لە هۆی سەرەکی وەرگەڕان و گاوربوونی لێ دەپرسن، ئەویش وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێ: هەرکـە سـەرەتا هاتینـە گوندەکـە و بەلای هەندێ لە کەنیسەکاندا ڕەت بـووین لـەدڵی خۆمـدا گـوتم: دەبـێ ڕێـزی ئـەو ڕەبەن و قەشانە لای منێکی باوەڕدار و یەکتاپەرست چی بێت؟ لە ناخەوە بانگیان کردم و پێم گوترا ئەمە کاری تۆ نییەو گەر دەتەوێ تێت دەگەیەنین، ئیدی هەستم

کرد باڵندەییٚ لە دڵمەوە دەرچوو و فڕی، ئەو باڵندەیەش ئیمان بوو . بەڵام لای فەقیٚ تەیران ئەم مۆنۆلۆگە نییە هەر خەونەکەیە کە پێشتر باس کراوە.

تێکستە عەرەبییەکە

((فقلنا له بالله نسألك هل كان لمحنتك من سبب؟ قال : نعم، لما وردنا القرية وجعلتم تدورون حول الكنائس، قلت في نفسي ما قدر هؤلاء عندي وأنا مؤمن موحد، فنوديت في سرّي ليس هذا منك ولو شئت عرفناك، ثم أحسست بطائر قد خرج من قلبي فكان ذلك الطائر هو الأيمان))/١٥٤

لەم دەقەدا وا دەردەکەویٚ کە شێخی سەنعان تووشی کیبر بووەو خۆی بەپیاوچاك دانـاوە، چونکە هەر خودا بەدەروونی مرۆڤ ئاگادارەو ئەمەش بۆچوونێکی سۆفییانەی فەلسەفییە کە بەچاوێکی یەکسان سەیری ئایینەکان دەکەن.

١٥– چۆنیەتی گەڕانەوەی شێخی سەنعان بۆ لای سۆفییەکان :

لە دەقە عەرەبییەکە وای نیشان داوە کە دوای ئەوەی سۆفییەکانی هاوڕێی شێخ لە گەڕانەوەی شێخ نائومێد دەبن، هەموویان دەگەڕێنەوەو دوای سیٚ ڕۆژان دەبینن وا لەبەردەمیانە و شایەتمان دێنیٚ و داوای جلوبەرگی پاکی لیٚ کردن تا خۆی بگۆڕیٚ و نوێژ بکات. ئیدی هاوڕێکانی سوپاسی خوایان کرد و لێیان پرسی هۆکاری گەڕانەوەت چی بوو؟ شێخ گوتی : کە ئێوە ڕۆیشتن لەخوا پاڕامەوەو گوتم: بە خۆشەویستییە قەدیمەکەت بمبوورە و من تاوانبارم، ئیتر بە بەخشندەیی خۆی بووردمی و بە سەتری خۆی داپۆشیم. ئەم جۆرە پرسیارو وەڵامانە لە داستانەکەی فەقیٚ تەیراندا نییە و ئەو زیاتر بەچەند وێنەیەکی سۆفییانە و وەسفی سۆفییانە کۆتایی بەداستانەکە هێناوە.

فەقیٚ تەیران

**گەر د شا وەقتیٚ وجوودیٚ شەیخ برە عەینیٚ شهوودیٚ**
**سۆفییان بەردا سجوودیٚ ژ حەق د خوازن میننەتیٚ**
**سەجدەیا شوکریٚ تەمام کر موعجیزا شەیخ دی وەتام کر**
**دلبەریٚ ئەووەل سەلام کر خۆه ژ شەرمان ڤێکەتیٚ /٤٤١**

شێخی سەنعان کەوتۆتە حاڵەتی شهوودەوە، واتـا: لـەڕێگای دڵبینییـەوە ئـەو ڕێگای نیشاندرا کـە دووبـارە بـەرەو ئیـسلام دێتـەوە و سـۆفییەکانیش کڕنووشـی سوپاسیان برد.

تێکستە عەرەبییەکە

((فصف لنا ما جرى لك وكيف كان أمرك؟ فقال : يا قوم لما وليتم من عندي سألته بالوداد القديم وقلت له يا مولاي أنا المذنب الجاني فعفا عني بجوده وبستره غطاني.... )) / ١٥٤

١٦- هاتنی کچە مەسیحییەکە بۆ لای شێخی سەنعان و موسڵمان بوونی :

لە دەقەکەدا باسی هاتنی کچەکەو موسڵمان بوونی دەکات، بەڵام چـۆنیەتی هاتنەکەی بۆ لای شێخی سەنعان جیاوازییان هەیە .

لە تێکستە عەرەبییەکە بەم جۆرەیە: هەرکە سۆفییەکان دوای نوێـژی بـەیانی لای شێخی سەنعان دادەنیشن، یەکێکی ڕەشپۆش لە دەرگا دەدا و دەڵێ: بە شێخ بڵێن جاریە ڕۆمییەکەی گوندەکە هاتووە بۆ خزمەتکردنتان، شـێخ زەرد هەڵگـەڕاو وتی با بێتە ژوورەوە، کە هاتە ژوورەوە لە پرمەی گریانی دا، شێخ گوتی کێ تۆی گەیاندە ئێرە؟ کچەکە گوتی هەرکە لە گوندەکەمان ڕۆیشتی، یەکێ خەبەری پێدام و شەوێ ئارامم لێ بڕاو لەخەونمدا پیاوێکم بینی و پێی گوتم: گـەر دەتـەوێ ببیـە ئیماندار واز لە ئایینەکەت بێنەو بەدوای شێخ بکەوە، گـوتم: ئـاینی شـێخ چـییە؟ گـوتی: ئیـسلامە. گـوتم: چـۆن بـچمە سـەر ئیـسلام؟ گـوتی شـایەتمان بێنـە. کـە شـایەتمانم هێنـاو گـوتم: چـۆن بگەمـە شـێخ؟ گـوتی دەسـتت بـدە مـن و چـاوت بنووقێنە، چاوم نووقانـد گـوتی چـاوت بکـەوە، کـە چـاوم کـردەوە بینـیم لەسـەر کەناری دیجلەم. گوتی: بڕۆ ئەو خانەقایەو سەلامی من بە شێخ ڕابگەیەنـە و بڵـێ: خدری برات سەلامت لێ دەکات.

لە داستانە کوردییەکە ئەم ڕووداوانە بەبەر چاو ناکـەوێ و شـێخی سـەنعان بە شێخی عەتار دەڵێ: کچە مەسیحییەکە وا بەڕێوەیە و بۆ لای من دێـت، ئەمـەش جۆرە کەرامەتێکی شێخە کە دڵی خەبەری پێداوە.

فەقیٚ تەیران

| | |
|---|---|
| شەیخ گۆتی یا شێخ عەتارە | نـــــاز کـــا مـــــن ئیختیارە |
| خـــــالقیٚ ژ دیـــــریٚ هنـارە | ڕیٚ گرتـــیە پیٚ پیٚ مـــەتیٚ |
| تیٚ ب لەز شـــــوبهەتیٚ باییٚ | ل فەرەسیٚ چەنگ ژ هەوایيٚ |
| د مەنـــــزلا ســــــانی گهاییٚ | رۆژ د پۆشـت روکبیٚ کەتیٚ /٤٤٠ |

تێکستە عەرەبییەکە

(( فبينما نحن جلوس عنده في بعض الأيام بعد صلاة الصبح واذا نحن بطارق يطرق باب الزاوية فنظرت من الباب فإذا شخص ملتف بكساء اسود فقلت له ماالذي تريد؟ فقال: قل لشيخكم ان الجارية الرومية التي تركتها بالقرية الفلانية قد جاءت لخدمتك ، قال: قد خلت، فعرفت الشيخ فاصفر لونه وارتعد ثم امر بدخولها ، فلما دخلت عليه بكت بكاءاً شديداً، فقال لها الشيخ: كيف كان مجيئكِ ومن أوصلك الى هنا؟ قالت: ياسيدي لما وليت من قريتنا جاءني من اخبرني بك فبكت ولم يأخذني قرار فرأيت في منامي شخصا وهو يقول: ان احببتِ ان تكوني من المؤمنات فاتركي ماأنت عليه من عبادة الاصنام واتبعي ذلك الشيخ وادخلي في دينه، فقلت: وما دينه؟ قال دين الاسلام. قلت وما هو؟ قال: شهادة أن لا اله الا الله و أن محمد رسول الله، فقلت: كيف لي بالوصول اليه؟ قال : اغمضي عينيك واعطيني يديك، ففعلت فمشى قليلاً ثم قال : افتحي عينيك ففتحتهما فأذا أنا بشاطئ الدجلة، فقال: إمضي الى تلك الزاوية واقرأي الشيخ مني السلام وقولي له : أن أخاك الخضر يسلّم عليك))/١٥٤

بەگشتی ئەم خاڵانەی کە ئاماژەیان پێکرا خاڵی سەرەکیی جیاوازییەکانن و گەر بە وردو باریکی هەمووی بەراورد بکرێت ئەوە هەویرەکە ئاوێکی زۆری دەویٚ و جۆرە درێژدادرِی و بێزارییەك دەنوێنیٚ.

## تەوەرەی دووەم

لێکچوونەکان

١- هەڵگەڕانەوەی شێخێکی تەریقەت لە عەشقی حەقیقییەوە بەرەو عەشقی مەجازی: لە هەردوو دەقەکەدا شێخێکی بەساڵاچووی خاوەن تەریقەت و خانەقاو موریدێکی زۆر لە گەشتێکدا کە چاوی بە کچە مەسیحییەك دەکەوێ عەشقی دەبێ:

فەقێ تەیران

**شەیخ ل خوە ناکەت ستارە ئاشکەرە خەون گۆتەیارە**
**ئاه ژ دەست دۆهتا کوففارە برمە دینێ شیرکەتێ/ ٢٤٦**

تێکستە عەرەبییەکە

((فلما رأها الشيخ تغير وجهه.......وقال ياقوم اعلموا ان الجارية التي رأيتها امس قد شغفت بها حباً))/١٥٣

٢- لە هەردووکیان شێخ بۆ کچەکە دەبێتە مەسیحی و زوننار دەبەستێ و بەرازەوانیشی بۆ دەکات:

فەقێ تەیران

**بێ مەزهەب و بێ دین کرم بێ خووندن و یاسین کرم/٢٤٦**
**هەم نووکرم هەم بەد کرم عیسایی بێ مورتەد کرم/٢٤٧**
**ژڤێ تەریقێ رەد کرم کافر کرم بێ مروەتێ/٢٤٨**
**ئەر قە بوول دکەی زنارەکێ هەڕۆ هەڕۆ ئێڤارەکێ**
**ئەز تە ڤەخوینم جارەکێ ب هەیجە تا زیافەتێ/٤٠١**

تێکستە عەرەبییەکە

((أنه خطب الجارية من أبيها فأبى أن يزوجها الا ممن هو على دينها ويلبس العباءة ويشد الزنار.... ويرعى الخنازير..........))/١٥٣

٣- شێخ خاوەنی موریدێکی زۆرەو بۆی بە پەرۆشەوەن: لە هەردوو تێکستەکەدا شێخ رابەری تەریقەتی سۆفیانەیەو ژمارەیەکی زۆر موریدی هەیە ، لە حەکایەتە عەرەبییەکە (١٢٠٠٠) هەزارەو لای فەقێ تەیران (٥٠٠) موریدە. هەروەها هەموو موریدەکان خەمی لێ دەخۆن و بە بەردەامی لە هەوڵی ئەوەدان کە شێخی سەنعان پەشیمان بکەنەوەو بیبەنەوە شارەکەی خۆی.

فەقیێ تەیران

| | |
|---|---|
| **شـــەیخەك هەبوو سەنعانیان** | **سەرداری پانسەد سۆفییان** |
| **چـــوو بوو مەقامی ئەولییان** | **دائیم د زیکـــر و تاعـــەتێ/٣٢٣** |
| **ئاهـــو فیغان دەربوون هەزار** | **هنگی هەبوون دەروێش و یـار** |
| **هەمیان ل شەیخ دکر پرسیار** | **با ژار و ئەهلێ هیشـــەتێ /٣٣٩** |

تێکستە عەرەبییەکە

(( قال الشبلي: فقلت يا سيدي انت شيخ أهل العراق ومعروف بالزهد فى سائر الآفاق وعدد مريديك أثنا عشر الفا........ فخرج الناس الى لقائه ومريدوه في جملة الناس فلم يروه، فسألوا عنه فعرفناهم بما جرى فمات من مريده ... وجعل الناس يبكون ويتضرعون الى الله تعالى أن، يرده عليهم)) ١٥٣.

٤– عەشقی شێخ و وەرگەڕانی لە ئایین بـە ویست و قـەدەری خـوا بـووە: هەردوو تێکستەکە بەگشتی لەسەر ئـەو بـاوەڕەن و فـەقیێ تـەیران زیـاتر لەسـەری دەڕواو ئـەم ڕووداوە بـەرەو ئـەزەل دەباتـەوە کـە قەڵـەمی قـودرەتی خـوایی نووسـیویەتی و مەرەکەبەکـەی وشـك بووەتـەوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی دەقـە عەرەبییەکە کورتە بەچەند وشەیەك هێمای بۆ کردووە.

فەقیێ تەیران

| | |
|---|---|
| **بێ مەشـیە تامـیر نـــابتن** | **حەتتاکـــو تەقدیـــر نـــابتن** |
| **قیســــمەت بێ تەدبیر نابتن** | **زێـــدە ژ میقـــدارێ نـــەتێ /٣٨٤** |
| **هنگی قســـە هنگی شـوغل** | **دەفتـــەر کـــرن رۆژا ئـــەول** |
| **با خۆی بخوە موهرکر سجل** | **ئاڤێت بـــەرا تـــا حوججەتێ /٣٨٥** |
| **حەمیان قەلەم هنگافت ژ بوو** | **هەم شاد و غەم هەم نیك و نوو** |
| **فیلحال قەلەم حشك بوو چوو** | **هـــوور بوو ل سەر کیتابەتێ /٣٨٥** |

تێکستە عەرەبییەکە

(( فقال: يا قوم جرى القلم بما حكم ...... وقال يا قوم انصرفوا فلقد نفذ القضاء والقدر......)) /١٥٣.

٥– پێك نەگەیشتنی شێخ و کچەکە:

شێخی سەنعان و کچە مەسیحییەکە لە هەردوو تێکستەکەدا بەیەکدی ناگەن و بەهیوای ئەوەن کە لە ڕۆژی بەپابوونەوە بەیەك بگەن، ئەمە ئاماژەیە بـە پـاکی

عەشقەکەیان و زاڵبوونی کەشی سۆفییانەیە بەسەر دەقەکاندا هـەروەك لـە لـەیلا و مەجنون و مەم و زینیشدا لە ڕۆژی دوایی پێك دەگەن، بۆ نموونە:

فەقیێ تەیران

| | |
|---|---|
| ل حەرزەتا هەڤ ناگــرن | ل بەر ســـــووڕیێ ناسەبرن |
| هەردوو ب هەڤرا دمـرن | ل ویێ گهانــــە وەســـڵەتیێ /٤٤٣ |
| ژ وەسلەتا حالەك وەدی | هەردوو ب لبسیێ جەسەدی |
| چوونە حەیاتا ئەبـــەدی | زاڤا و بووکـــیێ ئـاخیرەتیێ /٤٤٤ |

تێکستە عەرەبییەکە

(( فقال: لاتبكي فأن اجتماعنا غداً في القيامة في دار الكرامة))/١٥٤

٦- پەشیمان بوونەوەی شێخ و گەڕانەوەی بۆ ئیسلام:

لە هەردوو سەرچاوە کوردی و عەرەبییەکە باسی گەڕانەوەی شێخ دەکا بـۆ ئیسلام لەگەڵ هەندێ جیاوازی.لە عەرەبییەکەدا شێخ بەخۆی دەگەڕێتەوە و خۆی لە ڕووبارێ دەشواو شایەتمان دێنێ و داوا لە سۆفییەکان دەکـات جـل و بـەرگێکی پاکی بدەنێ، کەچـی لای فـەقیێ تـەیران شـێخ عـەتار شـێخی سـەنعان دێنێتـەوەو بـەئاوی ڕەحمـەت پـاکی دەکاتـەوە و زوننـاری لـە پـشت دەکاتـەوە. لـە هـەردوو تێکستەکەدا هاوڕێیەکانی شێخ زۆر شادو دڵخۆش دەبن بە گەڕانەوەی.

فەقیێ تەیران

| | |
|---|---|
| شەیخ بوویە دۆلاب ل دەشتیێ | مەلەکــیێ هادی گەهشـتیێ |
| وی زنــار ئاڤێت ز پوشـــــتیێ | شوشتی ب ئاڤا رەحمەتیێ /٤٢٦ |
| مەلەکـــیێ هـــادی بخار هات | قیسەتا مورشید بکارهات |
| شەیخ بدەستی شێخ عەتار هات | هەروەکـــی ژ کەعبە ڤەتیێ |
| دوڕ ژ بەحـــرا نـــوون و کاڤ | شەیخ عـەتار ئینا کەشاڤ |
| ســـــۆفیان بــــەردا تـەواڤ | خـــاچ حەبینیێ دل کەتیێ |
| دل کــــەتە زیکر و ســـەمایێ | گـازیبا بانـگا فــــەزایێ /٤٢٧ |
| دلبـــەری ل (دێـــرا کەلایێ) | ســـەکنی گـــوه ددەتیێ /٤٢٨ |

تێکستە عەرەبییەکە

(( واذا نحن به أمامنا قد تطهر من نهر وطلـع وهـو يـشهد شـهادة الحـق وهـو يجدد اسلامه، فلما رأيناه لم نملك أنفسنا من الفرح والسرور فنظر الينا وقال يـاقوم أعطوني ثوباً طاهراً، فأعطيناه ثوبا فالبسه ثم صلى....)) المستطرف، ص١٥٤

٧- <u>هاتنی کچەکە بەدوای شێخی سەنعاندا:</u>

لە هەردوو تێکستەکەدا دوای ئەوەی شێخی سەنعان دەبێتەوە موسڵمان و دەگەڕێتەوە شارەکەی خۆی، کچەکە ئارامی لیٚ دەبڕیٚ و بەدوای شێخدا دێت، بەڵام لە جۆرو شێوەی هاتنەوەکەیدا جیاوازی هەیە، گرنگ ئەوەیە سەرەتا شێخ چووە سەر ئایینی کچەکەو ئێستا کچەکە دەچێتە سەر ئایینی شێخ و موسڵمان دەبێت.

<u>فەقیٚ تەیران</u>

**راهیبان عیللـــەت نـەزانی　　هەسپەکی چوو نخۆش دەرانی**
**دلبەرا شـــەیخیٚ یەمانـــی　　پیٚ بســـەر پوشـــتیٚ کـەتیٚ/ ٤٣٨**
**بیٚ حیســاب لیٚ دلە زینیٚ　　دەم دەمـــان وی د تەزینـــیٚ**
**ژ موحبەتا شەیخ د بەزینیٚ　　بـــا ببەرز و لفـــان کـــەتیٚ /٤٣٩**
**ســۆفییان شەرما کچیٚ کر　　وان ژ دوور زیکریٚ خودیٚ کر**
**هــوون بنیٚ قۆجە چ چێکر　　کچ گـــەهانـــدە تـــەوبەتیٚ /٤٤٢**

<u>تێکستە عەرەبییەکە</u>

(( واذا نحن بطارق يطرق باب الزاوية فنظرت من الباب فأذا شخص ملتف بكساء اسود .... قل لشيخكم ان الجارية الرومية ... قد جاءت لخدمتك.... فقلت وما دينه؟ قال: دين الاسلام. قلت وماهو؟ قال: شهادة أن لااله الا الله ............. ))١٥٤.

---

١- مجتبي مينوي ، أز خزينة تركي ، ص١١.
٢- منوچهری مرتضوی ، مکتب حافظ، چاپ چهارم ، ص٢٩٧.
٣- غياث الدين محمد جلال بن شرف الدين، غياث اللغات، ص١٠٠.
٤- محمد رضا شفيع كدكني ، منطق الطير، ص٥٧.
٥- محمد جواد مشكور، منطق الطير، ص٥٧.
٦-المستطرف في كل فن مستظرف، شهاب الدين محمد بن أحمد أبي الفتح الابشيهي المحلي ٧٩٠ – ٨٥٠هـ، ص١٥٣.
٧-ريمون طحان، الأدب المقارن والأدب العام ، دار الكتاب اللبناني، بيروت، ١٩٧٢، ص٨
٨- عەزیز گەردی، ئەدەبی بەراوردکاری ، ل١٧ .

٩ – د. أحمد الزعبي، التناص نظرياً أم تطبيقياً، ط١، ١٩٩٥، ص٩.
١٠- عبدالواحد لؤلؤة ، التناص مع الشعر الغربي، مجلة الأقلام، العدد ١٠ ، ص٢٧.
١١– د. محمد معين ، فرهنگ فارسي ، ج١، ص٩٣

## ئەنجـــــام

نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا گەیشتە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١– فەقێ تـەیران و حەکایەتـە عەرەبییەکـە لـە خاڵـە سـەرەکییەکانی وەکـو سـەرەتای داسـتانەکە و کۆتـایی و ڕووداوە سـەرەکییەکان لێکـچوون و لـە خاڵـە لاوەکییەکان جیاوازن.

٢– لە دەقە عەرەبییەکەدا شێخی سەنعان خەڵکی بەغدایەو تا کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی ژیاوە چونکە هاوڕێی شبلی بووە کە لە ٢٩٧ ك. مردووە. بەڵام لای فەقێ تەیران شێخ خەڵکی یەمەنە.

٣– تێکـستە عەرەبییەکـە حەکایـەتئامێزەو لای فـەقێ تـەیران هونـەری و سۆفییانەیە.

٤– لە دەقـە عەرەبییەکـە دیـتنی کـچەکە واقیعییـە و لای فـەقێ تـەیران بـە خەونە.

٥– لە تێکستە عەرەبییەکە (شبلی) لەگەڵ شێخ هەوڵدەدا کە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، بەڵام لای فەقێ تەیران (شێخی عەتار) ئەمەی پێ سپێردراوە.

٦– لە دەقە عەرەبییەکە هۆی وەرگەڕانی شێخ خۆ بەزل زانین و کیبرە.

٧– لە هەردوو سەرچاوەکە لەئەنجام شێخ و کچەکە دەبنە موسڵمان.

٨– لە هەردوو سەرچـاوەکە بـەپێی قەزاوقـەدەری خـوا شـێخی سـەنعان لـە ئایین وەرگەڕاوە.

٩– لە هەردووکیان شێخ و کچەکە لە قیامەت بەیەك دەگەن.

## المصادر

فارسییەکان

١- غياث الدين محمد جلال بن شرف الدين راپوری، غياث اللغات، تحقيق: منصور ثروت، تهران، انتشارات أمير كبير ١٣٦٣.

٢- فريد الدين العطار، منطق الطير.

٣- مجتبى مينوى، أز خزينه تركى.

٤- محمد جواد مشكور، منطق الطير فريد الدين العطار، تهران، چاپخانه پيام ١٣٤٨.

٥- محمد رضا شفيع كدكني، منطق الطير عطار، ج٢، تهران، چاپخانه مهارات ١٣٨٨.

٦- محمد معين (دكتر)، فرهنگ فارسى.

٧- منوچهر مرتضوى، مكتب حافظ يا مقدمه بر حافظ شناسى، چاپ٤، تبريز، انتشارات ستوده، چاپ گلشن ١٣٨٤.

عەرەبییەکان

٨- أحمد الزغبي (د)، التناص نظرياً وتطبيقياً، ط١، ١٩٩٥.

٩- ريمون طحان، الأدب المقارن والأدب العام، دار الكتاب اللبناني-بيروت ١٩٧٢.

١٠- شهاب الدين محمد بن احمد أبي الفتح الابشهي المحلي، المستطرف في كل فن مستظرف.

١١- عبدالواحد لؤلؤة، التناص مع الشعر الغربي، مجلة الأقلام، العدد ١٠.

کوردی

١٢- عەزیز گەردی، ئەدەبی بەراوردکاری، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٨ بەغدا.

## ملخص البحث

هذا البحث المعنون بـ ( المقارنة بين شيخ صنعان لفقي طيران و حكاية عربية) عبارة عن مقارنة بينهما، حيث ان النص العربي مأخوذ من كتاب (المستطرف في كل فن مستظرف) لشهاب الدين محمد بن أحمد المحلي.

هذا البحث محاولة لمعرفة جوانب التشابه والإختلاف بين النصين، وهذا أيضاً اشارة الى أن الحكايات إما أن تكون مصادرها واحدة وبحسب ظهورها بين الشعوب دخلتها بعض الإختلافات، وإما أن تكون راجعة الى وحدة الطبيعة والحياة الإنسانية وتوارد الخواطر.

يتكون البحث من مقدمة ومحورين:

المحور الأول: عرض ملخص للأدب المقارن وتعريفه مع الإشارة الى التناص في اللغات الإنكليزية والفرنسية والعربية والفارسية والكردية. وفي نهاية المحور قام الباحث بعرض نقاط الإختلاف بين النصين مستنداً الى النماذج من النصين.

المحور الثاني: عبارة عن عرض نقاط التشابه بين النصين، ثم اختتم البحث بالنتائج التي توصل اليها الباحث مع قائمة المصادر وملخص البحث باللغتين الكردية والعربية.

## Abstract

This research, entitled "sheik sanaan in faqe taeran and in an Arabic text", consists of introduction and two sections. First section is sub-divided into two parts.

Part one consists of a brief comparative literary introduction in addition to the definition of intertextuality.

Part two deals with the differences between the specified text with reference to examples from both.

Section two is devoted to the similarities between the two texts with reference to examples.

Finally, a few points sum up the conclusion of the paper.

# کەسایەتی ژن
# لە پەندی پێشینانی کوردیدا

د. پەخشان سابیر حەمەد
کۆلیژی پەروەردە - زانکۆی سۆران
٢٠٠٩-٢٠١٠

## بەشی دووەم

### پێشەکی

پەندی پێشینان سامانێکی نەتەوایەتی و بەشێکی گرنگ و پڕ بایەخی ڕۆشنبیری هەر نەتەوەیەکە، کە هەمیشە بەشێکی قسەکردن و نووسین بە پێی پێویستی و سروشتی نووسینەکە بابەتەکە پێك دەهێنێ . بە درێژایی کات و مێژوو ئەزموونە مرۆڤایەتییەکان لە ئاکامی دیاردە یا ئیش و کار یا کارەسات و ڕووداوێکی دیاریکراو، لە قاڵبی پەندێکی دانایی ئامێز داڕێژراون، کە پەندەکان هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤیان گرتۆتەوە، فراوانی بڵاوبوونەوەی پەند نیشانەی ڕاستگۆیی گوزارشتکردنیەتی لە پاڵ پێویستی زۆری کۆمەڵگا بۆ ئەم جۆرە پەندانە.

فراوانی واتایەکی زۆر و کۆکردنەوەی لە دەربڕینێکی کورت و چڕدا بەخششێکی جوانناسی پێ داوە.

پەند لە نێو هەموو ڕۆشنبیری نەتەوەکاندا ڕۆڵێکی باڵا دەنوێنێ و توانای مانەوەو ژیانی بەردەوامی لەنێویاندا هەیە، بە تەنیا پیاو لە کەموکوڕیی نێو پەندەکان و بەکارهێنانیان بەرپرس نییە، بەڵکو ژنیش بە هەمان شێوە بەرپرسە.

## پلانی لێکۆڵینەوەکە

لێکۆڵینەوەکـە تـەرخان کـراوە بـۆ (کەسـایەتی ژن  لـە پەنـدی پێـشینانی کوردیدا) جگە لە  پێشەکییەك بریتییە لە دوو بەش، بەشی یەکـەمیان تایبەتـە بـۆ کەسایەتی ژن و بە پێی بایـەخی کەسـایەتییەکان دابـەش کـراوە بـۆ: (کەسـایەتی بێـوەژن) و (کەسـایەتی بـاوەژن)و (کەسـایەتی پـیرەژن)و (کەسـایەتییەکانی تـر) ئەمەی دواییـان بـۆ ئـەو کەسـایەتییانەی ژن تـەرخان کـراون کـە بـە پێـی ڕێـژەی ئاماژەپێکردن و ناوهێنانیان لە پەندەکاندا پۆلێن کراون، بەشی دووەم تایبەتە بـۆ (ناو و کارو کەرەستەکانی ژن لـە پەنـدی پێـشینان‌دا) کـە لـەم بابەتانـە دەدوێـت: (ناوی تایبەت بە ژن) و (ئیشی تایبەت بـە ژن)و (کەرەسـتەی تایبـەت بـە ژن) کـە هەر یەکێکیان گرنگترین ئەو پەندانەی دەچنە ئەو خانەیەوە دەگرێتە خۆی .

دواتر سەرەکیترین ئەنجامەکان و لیستی سەرچاوەکان خراونەتە ڕوو.

## ئامانجی لێکۆڵینەوەکە

– کۆکردنەوەی زۆرترین پەند لە ژێرسایەی ئەو بابەتانەی بۆیان دیاری کراوە.

– جیاکردنەوەی لایەنی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی چەمك و ناوەڕۆکی پەندەکان.

– نیـشاندان و دیـاریکردنی عەقڵیـەت و پێکهاتـەی بـیری کۆمـەڵگای کـوردی بەرامبەر ژن و چۆنیەتی مامەڵەکردن لە گەڵیدا.

– بـە هۆشـیاری مامەڵـەکردن لەگـەڵ پەنـدی پێـشینان و جیاکردنـەوەی ئـەو پەندانەی چەمکێکی هەڵە هەڵدەگرن، بۆ ئەوەی بەکارهێنانیان کەم بکرێتـەوە، یـا ئەو پەندانەی باویان نەماوەو بەکارهێنانیان بەسەرچووە.

– دەرخـستنی وێنـەکانی ژن بـە پێـی پەنـدی پێـشینان و دەستنیـشانکردنی ڕۆڵیان لە نێو پەنددا.

## ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە

ڕێبـازی شـیکاری هێڵـی سـەرەکی لێکۆڵینەوەکـەی لـە خـۆ گرتـووە، لـە پـاڵ ڕێبازی وەسفی وەکو پێویستییەکی بابەتەکە، هەندێ جاریش ڕێبازی بەراوردکاری بـوونی خـۆی دەسـەلمێنێ، ئـەم ڕێبازانـە بـە یەکـەوە توانیویانـە بابەتەکـە چـڕتر بکەنەوە.

## بەشی یەکەم
## کەسایەتی ژن لە پەندی پێشینانی کوردیدا
### ١_کەسایەتی بێوەژن

(بێـوەژن) وەك کەسـێکی نێـو کۆمـەڵ بـەپێی تەمـەنی بێوەژنێتییەکـەی، دڵەڕاوکێ و خەمی هەیە، هەندێ جـار ڕەمـزی خۆبەخـشین و تـەرخانکردنی ژیـانی داهاتوویەتی بۆ منداڵـەکانی و هەنـدێ جـاری تـریش ڕەمزێکـی پێـچەوانە دروسـت دەکات. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ هێڵی ژیانی پێش بوونی بە (بێـوەژن)، واتـە ئەمـەی دوایی هەمووی ڕەنگدانەوەی زەمینەی ژیانێتی .

ئاڕاستەی کۆمەڵگا ئاڕاستەیەکی بێ بەزەییانەیە بـۆ ( بێـوەژن) و (بێـوەژن) هەمیشە هەڵسوکەوت و ڕەفتار و جوولەکانی لەژێر چاودێرییەکی وردی کۆمەڵـدان. بۆ نموونە بەتەوس و پلار ئەو پەنـدەی ئاڕاسـتە دەکرێـت (( ئـەوەی بـە بێـوەژنی دەیکەی بە کچێنی بتکردایە))[1] ، چونکە بێوەژنی لەڕوانگەی کۆمەڵەوە قۆناغێکی ناسکەو هەموو شتێکی لێ ناوەشێتەوە، بەڵام کە کچ بێ پاساوی هەیە. بەتایبـەتی لە چوارچێوەی کۆمەڵگای کوردی کە بێوەژن بوون دوو جۆری هەیە :

أ- ئەوەی لە ئاکامی مردنی هاوسەرەکەی دەبێتە (بێوەژن) .

ب- ئەوەی لەئاکامی تەڵاقدان دەبێتە (بێوەژن) .

هەریەك لەو جۆرانەش پێوانەی خۆیان هەیە، تاڕادەیەك جـۆری (أ) بەباشـترو گونجاوتر دەناسرێت، هەندێك جار ئـەم جـۆرە بێـوەژن بوونـە گەورەییـەکی تێـدا بەدی دەکرێت، کە وەك پیاو مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، هەرچەندە بـەپێی جـۆری کەسایەتی و پەروەردەو تەمەنی دەگۆڕێت .لەگەڵ ئەوەشدا دەوترێت (( بێوەژنان مەخوازن بلا میریش بن، کیژان بخوازن بلا پیریش بـن))[2] . ئەمـە بەواتایـەکی تـر بەبێ ناوهێنانی (بێوەژن) هاتووە، دەڵێن: (( ئەگەر ژن خوازی کچ خوازبە، ئەگـەر دەغـڵ کـڕی گـەنم کڕبـە))[3]. بڕگـەی (کـچ خوازبـە) بەتـەواوی (بێـوەژن) ڕەت دەکاتەوە .

لە پەندێکی تردا ((مەکری بێوەژنان، ڕێوی دەکاتە کونان))[4]، لەبـەر ئـەوەی بۆتـە خـاوەن تاقیکردنـەوە لەژیانـدا . بۆیـە ئەگـەر مەکرکـەربێ، ئـەوا ململانـێ و پێشبڕکێ لەگەڵ ڕێوی دەکات، تەنانەت لێشی دەباتـەوە، لەکاتێکدا (ڕێـوی) وەك

ئاژەڵێك ڕەمزی فڕوفێڵە . ئەم لێكچواندن و بەرامبەركردنە مامەڵەكردنێكی بێ بەزەییانەیە لەگەڵ ئەم جۆرە بارەی ژن . یا گەڵێ خەوش و ناو و ناتۆرەی تری دراوەتە پاڵ، وەك ((بێوەژن ئەستوونی ماڵی زێڕبێ، خێری پێ دەشێ))[٥] ،چونكە بەرپرسیارێتییەكی زیاتری لەسەرە، بۆیە هەمیشە دەكرووزێتەوە و خۆی بە نەدارا نیشان دەدات . بۆ ئەوەی ببێتە جێگەی بەزەیی دەوروبەر، چونكە كەسێك شك نابات باری قورسی سووك بكات. ئەمەش كاریگەری لەسەر منداڵەكانیشی دەبێ، لەبەر ئەوە وتوویانە ((كوڕ بێوەژن ڕك ڕك كەرە))[٦] لە ئاكامی خەسڵەتی دایكییەوە وەری گرتووە .

هەندێ جار گشتاندنێكی دیاریكراو بەناوی بێوەژنەوە ئەنجام دەدرێت، وەك: ((بێوەژن بەتەمای مارەیی نەبوو، داوای هەشتەكی دەكرد))[٧] ئەمە بە هەریەكێك دەوترێت كە لە مافی خۆی زیاتر داوا بكات، واتە لە سنوورو بازنەی بێوەژن چۆتە دەرەوە، هەرچەندە دیسان وەك پەندەكەی پێشتر.

بێوەژن وەك بوونەوەرێكی پشتگوێ خراو تەماشا دەكرێ و مافی ئەوەی نادرێتێ  كە مرۆڤێكی خاوەن حەزو غەریزەو ئارەزووی تایبەت بەو قۆناغەو مافی ژیانێكی ئاسایی وەكو خەڵكانی تری هەبێت . بەڵگەی ئەوەی وەك كەسێكی ئاسایی سەیر ناكرێت ، ئەوەیە كە بێوەژن خاوەن  سروشتێكی ناخۆش و ڕەق و سەیرن، بۆیە دەوترێت ((بێوەژن لە نیمەی شەوا پەشیمان ئەوێتەوە))[٨] دیسان نیشانەی دەروونی بێوەژنە كە ، خاوەن دەرونێكی شڵەژاو و ئاڵۆزە لەئەنجامی ئەو بۆشاییەی لەژیانی كۆمەڵایەتیدا بۆی دروست بووە. لەڕۆژدا لەبەر كاروبار تاڕادەیەك ئازادەو ئاگاداری زۆر شت نییە، بەڵام لە شەودا حەسرەت بۆ تەنیایی خۆی دەكێشێ  .

ئەگەر بێوەژنێك شوو بكاتەوە (دووبارە شوو بكاتەوە)) بەشەو دەگوێزرێتەوە بۆ ماڵی مێردو ئاهەنگ و شایی بۆ ناگێڕن.[٩] لەبەرئەوەی دووەم جاریەتی .

كۆمەڵگای كوردی بەرامبەر جۆری دووەمی بێوەژن كە بەهۆی تەلاقدانەوە ئەم نازناوەیان وەرگرتووە، زۆر توندە، بەڕق و كینەوە سەیری ئەم جۆرە ژنانەیان كردووە و بەپەسندیان نەزانیوە، هەرچەندە حاڵەتی تەلاقدان زۆر دەگمەن و كەمیش بووە، بەبەراورد لەگەڵ دوو جۆری بێوەژنەكە لەم پەندە بەدی

دەکرێت (( چەن مێرد مردوو بخوازە، تەلاّقدراوێ مەخوازە )) [١٠]. جۆری یەکەم پەسندتر کراوە، لە هەندێ شوێن شێوازی ئاراستەکە زۆر سووك و کەم کراوە و هیچ مرۆڤایەتییەکی لە مامەڵەکردن لەگەڵ بێوەژنی تەلاّقدراو تێدا بەدی ناکرێت. ((کەران گایی بخوازە، تەلاّقدرایێ مەخوازە)) [١١] .

کورد هەرگیز لەگەڵ تەلاّقدان و جیابوونەوە نەبووە، هەمیشە بیری تەلاّقی ڕەت کردۆتەوە وەك چۆن لەم فەرموودەیەدا هاتووە ﴿ **أبغض الحلال عند الله الطلاق**﴾ [١٢] ، بۆیە زیز بوونی(*) لا چاکتر بووە (( حەفت جار ڕۆیینی بخوازە، تەلاّقدرایێ نەخوازە)) [١٣]. یا ((ژنی جوان دەردی بێ دەرمان، نەکوشتن، نەتەلاّقدان)) [١٤]، تەلاّق لە پەندی پێشینانی عەرەبیش زۆر کەمە وەك ئەوەی لەناو کۆمەڵگای عەرەبیش پەسند نەبێت(**) و تەنیا دواچارەسەر بێت بۆ کێشەکە .

هەڵوێستی منداڵ دوای شووکردنەوەی دایکیان لە پەندی پێشیناندا دیاری کراوە . زیاتر ئەمە زمانحاڵی کوڕو هەڵوێستی کوڕ دەنوێنێ، نە کچ، چونکە کچ لەو قۆناغەدا هەستی دەربڕینی نەبووە، ڕاشکاوانە ئاماژەیان پێی بکات، بۆیە دەڵێن (( پیاو بەدۆستی دایکی نەوێرێ، دەبێ پێی برێ خارە )) [١٥]. هەرچەندە سەرەتا ئەم پەندە بۆ بارێکی تایبەت دانراوە، بەڵام ئێستا لەو قالبە چۆتە دەرەوە و بۆ زۆر باری تریش بەکاردێ. ئەوەی یەکیان دەخات ئەوەیە کە مرۆڤ ناچاربێت سەر بە ماڵی دوژمنیشی دادەگرێت و لای ئاسایی دەبێت، چونکە یا بەرژەوەندی ئەو لەوەدایە. کوڕیش کاتێ دایکی شوو دەکاتەوە، دوای ئەوەی باوکی نەماوە، ئیتر هەرچۆنێك بێت بەوەی دایکی دەهێنێ دەڵێ : (مامە ) یا (بابە) .... هتد، چونکە ڕێگاچارەی دیکەی لەبەردەمدا نییە، لای شێخ محەمەدی خاڵ ئەم پەندە بەم شێوەیەیە: (( پیاو کە ناچار بوو، بە دۆستی دایکی ئەڵێ لالە)) [١٦]، ناچاریی ئەو شتانەی کە ئەستەم و نەشیاویش بن دەیانگۆڕێت .

زۆر جار بەرژەوەندییەکان ئەم سنوورانە تێدەپەڕێنن، لە خەیاڵی خۆیاندا جۆرە دابەشکردنێك دەکەن (( خۆی لۆ خۆم و کیژی بۆ کوڕم، هەرکەس قسە بکا زگی هەڵدەدڕم)) [١٧] ئەمە بە تەواوی دەست بە سەرداگرتنی هەموو خێزانەکەیە بە شێوەیەکی بێ بەزەییانە و بڕیارێکی تاك ڕەوییە بە هۆی دەسەلاّتێکەوە ئەنجام دەدرێت.

### ٢_ کەسایەتی باوەژن

باوەژن لە چوارچێوەی  کۆمەڵگای کوردیدا وێنەو کەسایەتییەکی درێوی بۆ کێشراوە، بەگشتی وێنەیەکی نێگەتیڤ و بێ بەزەیی و زاڵمە، هەرچەندە لە پەندی پێشیناندا بە بەراورد لەگەڵ بابەت وێنەکانی تری ژن کەمتر ئاماژە بە (باوەژن) کراوە، لەوانەیە هۆکاری ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە باوەژن لە دیدی مرۆڤی کورد، یەك وێنەو قاڵبی دیاریکراوی هەبێت، ئەویش خراپەکارییە و لەو خانەیە دەرناچێت، بۆیە وتوویانە((باوەژن، دین دوژمن))[١٨] وەك ئەوە وایە منداڵەکانی پیاوەکەی سەر بەئاینێکی تر بن، بەم شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات . ئەم جۆرە مامەڵەکردنە بەهیچ شێوەیەك ناچێتە قاڵبی مرۆڤایەتی، کە لە فەرهەنگی مرۆڤایەتی لای زۆر نەتەوە بە (دایکی دووەم ) ناو دەبردرێت، نەك باوەژن. ئەم جۆرە مامەڵەکردنەی باوەژن، یا سیفەتی خراپەکاری زۆر جار دەبەخشرێتە ئەو کەسانەش کە هاو هەڵسوکەوتی ئەون، ئەگەرچی دایکی خۆشیان بێت، چونکە گرنگ مامەڵەکردنەکەیە، نەك نازناوەکە . وەك لای فەیلییەکان هاتووە (( ئەرا مەردم دالگ، ئەرا ئێمە باوەژن))[١٩]. بەو کەسانە دەوترێت کە دوو جۆر مامەڵەیان هەیە . لەگەڵ هەندێکدا بەسۆزو میهرەبانن چەشنی دایکێکی بەبەزەیی، بۆ هەندێکی تریش زیان بەخشن و بێ بەزەیین چەشنی باوەژن، چونکە هەڵسوکەوتی توندو تیژی پێوە دیارەو لە هی باوەژن دەکات .

واتە هەندێ جار هەڵوێستەکە وێنەی دایکیش دەگۆڕێت وەك (( دایك ئەگەر بووە زڕدایك، باوکیش دەبێتە زڕ باب ))[٢٠]، هەردووکیان بگۆڕێن و ئەم وێنە درێوەیان هەبێت خێزانەکە دووچاری نەهامەتی دەبنەوەو منداڵەکان دەبنە قوربانی ئەم هەڵسوکەوتە چەوتانە .

یا لەشێوەی پرسیاردا کاتێ کەسانێك لە شتێك بێ بەش دەبن، دەپرسن .((بۆچی ئێمە لە باوەژنەکە بووگین؟))[٢١] .

کوردی شەبەك وەك دوعایەك دەڵێن : ((بابۆژەن بابۆش بمری، براژەن براش بمری))[٢٢]. بۆ ئەوەی زوڵم و چەوسانەوەکەیان کەم بکەنەوە و بەهۆی جیابوونەوەو مردنی ئەو ئازیزانەیان کەمێك سۆزیان بجوڵێ و هەڵسوکەوتیان بگۆڕێت .

(باوەژن) وەك كەسێكی نێو كۆمەڵ، جگە لەم پەندانە لە نێو پەندی تردا بەدی ناكرێت. هۆكاری ئەوە زیاتر ئەوەیە كە كەسایەتییەكی ئامادەو نەگۆڕە و چەسپاوە، لەوانەیە پێچەوانەكەیشی هەبێت، بەلآم دەگمەن بێت، ئەمەیان دەچێتە خانەی دایكەوە نەك باوەژن .

## ٣_ كەسایەتی پیرەژن

پیرەژن وەك كەسێكی بەسالآچوو لەنێو كۆمەڵگای كوردیدا بەدرێژایی قۆناغە مێژووییەكان ڕێزی لێ گیراوە، وەك كەسێكی خاوەن ئەزموون و دیار مامەڵەی لەگەڵدا كراوە ، بەلآم بەهۆی جیاوازی تەمەن و ئەزموون لەگەڵ نەوەكانی تردا، گەلێ جار بۆتە مایەی بەشێوەیەكی نێگەتیف تێی بروانن . بۆتە ڕەمزێك بۆ پرتەو بۆڵە . یان ڕەمزی فروفێڵ وەك لە (ئەفسانەی كوردیدا بەدی دەكرێت، بە زۆری ڕۆڵی خراپی دەدرێتێ وزۆرجاریش سزای توند دەدرێ، هەر ئەو پیرەژنە لە ئەفسانە كاری زۆر ئەستەم دەكات كە بە كەسی دی ناكرێ )*

ژمارەی ئەو پەندانەی لە (پیرەژن) دەدوێن كەمن، لەو پەندە كەمانەش كە هەن تێبینی دوو شت دەكرێت :

١. پەندەكان زیاتر لە شێوەی سۆرانین، لەشێوەكانی تر بەدی ناكرێن .

٢. گشت ئەو پەندانەی لەبارەی (پیرەژن)ن تەوس و پلارن، لەگەڵ داب و نەریتی كورد ناگونجێن، بەلآم دەشێ حاڵەتە پۆزەتیفەكان گوزارشتیان لێ نەكرابێت، تەنیا حاڵەتە نێگەتیڤەكان تیشكیان خرابێتەسەر . (( ئەوەی شەیتان بەساڵەكی دەیكا پیرەژن بە ڕۆژەكی دەیكا))[٢٣] .

پیرەژن بۆتە ڕەمزی فروفێڵ و مەكر، بەمەش لە پلەو پایەی ئەو ژنە خاوەن تەمەنەیان كەم كردۆتەوە، یا نموونەی پیرێكی تەرپۆش و جوان بۆتە مایەی ڕەخنەی كۆمەڵگاو دەست تێوەردانی ژیانی . ((پیرێژنی بە نووكە نووكە، هەزار مێرد دەنێژێ و دەڵێی بووكە ))[٢٤]. ئەمە لەبارێكدا دەبێت كە زوو شووی كردووەو منداڵەكانی پێگەیاندووە، بۆیە پیرییەكەی هێندە پێوە دیار نابێت .

پەندەكان زمان حاڵی پیرەژنن، بەڵام بۆ هەموو هەڵوێستێكی هاوشێوە دەگونجێن . ((پیرێژنی بەلۆتەوە بەخۆی دەدڕێ و دەدروێتەوە))[٢٥]، چەمكی ئەم

پەندە لەگەڵ پەندی سەرەتا یەك دەگرنەوە، ئەم حاڵەتە گوزارشت لە تەنیایی پیرەژن دەکات . تاڕادەیەك کە دەکەوێتە تەمەنەوە فەرامۆش دەکرێت، بەڵگەی ئەمەش ئەرکەکانی پیرەژن هەروەك خۆی ماوەتەوە ئیش و کارەکان هەر لەئەستۆی خۆیدان و کەسێکی تر کەم و زۆر یارمەتی نادات . ئەمە مامەڵەکردنێکی نامرۆڤانەیە لەگەڵیدا ئەنجام دەدرێت ((پیرەژن دەچێتە کیستانێ بارەداران دەینێ لۆ زستانێ))[٢٦] .

وادیارە هەڵسوکەوتی ژنە لەو تەمەنەیدا کە تەمەنێکی زۆر ناسکەو هەموو جوولەکانی حیسابیان بۆ دەکرێت و شی دەکرێنەوە، بەمەش ئازارێکی دەروونی لای ژن لەم قۆناغەیدا دروست دەکەن . دەشێ هەندێ لە هەڵسوکەوتەکانی ڕەنگدانەوەی مامەڵەکردنی دەوروبەر بێت . سەرباری ئەوەی لەو قۆناغەدا منداڵ ئاسا ئارەزووی هەندێ شت دەکەن . لەوانەیە لەگەڵ بارودۆخ یا نەریتی کۆمەڵگا نەگونجێت، بۆیە هەر بە تەوس و پلارەوە دەوترێ (( تازە بەتازە، پیرێژن بیرازە))[٢٧]. واتە کاتی ئەوە بەسەرچووە، ئەمە وادەکات پیرەژن هەمیشە لەئاگاداری دابێت، چونکە دەوروبەر حیساب بۆ ناهەستی ژن لەو قۆناغەدا ناکەن . سەرباری ئەمەش ((پیرێژنی خوار بازێڕی، فیتەکی لۆ ڕابێری، لانك و لۆلکان بەجێ دێلی))[٢٨]. چەمکی ئەم پەندە مەگەر کەسێکە ناوازە، ئەگەرنا لەگەڵ پیرەژن ناگونجێت . دەچێتە خانەی گاڵتەپێکردن، بەتایبەتی ( فیتە) گەنجان بەمەبەستی ڕابواردن بەکاری دەهێنن . یا ((دەنگی دەهۆڵێ هات، پیرەژن بە کەچە سۆڵێ ڕانەگەیشت))[٢٩]. دیسان لە چەمکی ئەم پەندە دەردەکەوێت کە پیرەژن بخرێتە دەرەوەی بازنەی هەستەکانەوە و خاوەن هەست نەبێت . لەبەر ئەوەی شتی خۆش دەشێ ژن لە قۆناغی پیرێتییەوە بخاتە خۆشی و کامەرانی، ئارەزووی بەشداریکردنی هەبێت . تەنانەت لەحاڵەتێکدا کەسێك قسەی نابەجێ بکات، پەندێکی پیرەژن ئامێزی ئاڕاستە دەکەن (( پیرەژن هەندەی نەگوت، کەپوویان بڕی))[٣٠] پیرەژن وەك کەسێك هەندێ جار وەك بار قورسییەك بەسەرشانی خێزان و دەوروبەرەوە تەماشا کراوە وەك ((هەی پیرەژن سەر وەك جەڕە، قسەی خێریشت هەر شەڕە)) [٣١]

ئەمە دەچێتە ناو خانەی سووکایەتی پێکردنی ئەم تەمەنەی ژن، لە کاتێکدا (پیرەژن) پەیوەست کراوە بە بەخت ((ئەگەر بەخت بێ بە یارە،چ پیرەژنێك بێت چ هەزار سوارە)) [٣٢] بە هۆی بەختەوە (پیرەژن) و (هەزار سوار) لە تای تەرازووی ژیاندا هاوسەنگ کراون.

هەر لە بارەی پیرەژن و بە هۆی کەسایەتییەکەی وەك کەسێکی دنیا دیو وتراوە ((گا بە ڕانەوە دەچوو،پیرەژن لە گۆلکە سۆری دەپێچایەوە)) [٣٣] ئەمە لە سنووری پیرەژن دەرچووەو هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە سەر شتی گەورە دەنگ ناکەن و بۆ شتی بچووك و کەم بایەخ هەرا دەکەن.

## ٤_کەسایەتییەکانی تر

جگە لەو کەسایەتییانەی خستمانە ڕوو، چەندین کەسایەتی تری ژن هەن کە پەیوەندییە خزمایەتییەکانیان دروست کردووە، جۆری پەیوەندییەکان بەشدارییان لە چێکردنی ئەم پەندانەدا کردووە، بەلاّم ئەم پەیوەندییانە زۆر بە کەمی باس کراون. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم پەیوەندییانە ئاسایی بوون و شتێکی وای لێ نەکەوتۆتەوە، خێزانی کورد وەك هەر خێزانێکی تر ئارەزووی ئەوەی بووە منداڵی کچ و کوڕی هەبێت نەبوونی کوڕ کێشە و گرفتی بەتایبەتی بۆ ژن دروست کردووە. لەو بڕوایەدا بوون ((خوشکی بێ برا، وەك داری بێ گەلاّ وایە)) [٣٤]، چونکە (برا) لایان پەرژین ئاسا خوشك دەپارێزێ، ئەرکێکی قورس دەکەوێتە سەر ئەستۆی برا، بۆیە دەڵێن: ((خوشك بەرایە، داك قەزایە)) [٣٥] ئەمە تێڕوانینێکی نامرۆڤانە بووە بەرامبەر خوشك، کەچی هەستی خوشك بەرامبەر برا پێچەوانە بووە، بۆیە خوشکیش شوو پەسندتر دەکات لە برا ((نە ئاگر و نەدوو، هیچی نابێ بە شوو)) [٣٦].

لەوانەیە هەر لەبەر ئەم پەیوەندییەی لەگەڵ برا بووبێتە مایەی ئەوەی کە دەبێتە (دش) * ڕۆڵێکی خراپی دەبێت ((هەرچی دشێکی لە گەلاّیە، درەوشێکی لە پێدایە)) [٣٧] پەیوەندی دش و براژن لەسەر بنچینەی ڕق و کینە دامەزراوە، دش بۆ براژن چەشنی درەوش وایە لە پێی دەچەقێ و ئازاری دەدات. ئەم پەیوەندییە

بەردەوامی هەیە، تاکو ئێستا ئەم تێڕوانینە هەیە، دەگاتە ئەو ڕادەیەی بووك بڵێ ((سووژن بکەن وە پاما، هەر دش نەیەت وەلاما))[٣٨]

هێندە ڕقێکی گەورەی بۆی هەیە، لە کاتێکدا ((نازی برا و براژن بە نووکی زوانە))[٣٩] لەلایەن خۆیەوە براژنیش نازی (دش) هەڵناگرێ، بەمەش ناوەستێ، بەڵکو(( براژەن کەسی بوی نمەکەرۆ - براژن کەس بەخێو ناکا))[٤٠]، ناشێ کەس پشت بە براژن ببەستێت جۆری ئەم پەیوەندییانە ڕەنگدانەوەی نالەباری بەسەر خێزاندا دەبێت.

بابەتێکی تر کە پەندی پێشینان جەختی لەسەر کردۆتەوە (دەستە خوشکی)یە، ((دەستە خوشکی بە دەستە برای، دەستە برای بە دەستە خوشکی، کۆنە پاسۆکی))[٤١] کورد لە قۆناغە هەمەجۆرەکاندا باوەڕیان بە هاوڕێیەتی کچ و کوڕ نەبووە، گەیشتوونەتە ئەوەی کە ئەنجامەکەی هەر بە یەکگەیشتنە، پەیوەندییەکە دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستی، ئەمەش لە ئەنجامی دوو فاکتەری سەرەکییە[٤٢]:-

١- ئەو تێکەڵبوونە کتوپڕییەی کە دوای جودایی و نامۆییەکی زۆر دێتە گۆڕێ، ئەمەش وا لە هەردووکیان دەکات، نەتوانن بە شێوەیەکی ئاسایی گوزارشت لەو پێکەوەبوونە بکەن و بە سانایی پێناسەیەك بە بالای پەیوەندییەکاندا ببڕن، بۆیە ئامانجی بەیەکدی گەیشتن دەکەنە ئەلتەرناتیف بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی دوودڵی و دڵەڕاوکێ و سووڕانەوەیەکی بێ مەرام.

٢- دەرکەوتنی ئامانج بۆ برەودان بەو پەیوەندییەو بەردەوامبوون و درێژبوونەوەیە تا کۆتایی، زۆربەی پەیوەندییە هاوشێوەکانی هاوڕێیەتی پرۆسەی هاوسەرگیری دروست دەکەن، گەر شکست بێنن لەم هاوڕێیەتییە، ناگەڕێنەوە بۆ خاڵی هاوڕێیەتی، بەڵکو دابڕان و جیابوونەوەی کۆتایی ئەنجامیان دەبێت، چونکە ((هاوڕێیەتی کوڕو کچ لە کۆمەڵگای کوردەواریدا هەڵگری کۆمەڵێك گرێی دەروونییە و تاکو ئێستاش ڕەوتی ئاسایی و دڵنیایی خۆی وەرنەگرتووە))[٤٣] ئەم بابەتانە لە دووتوێی ئەم پەندانەدا بەدی کراون، یاسایەك بوون بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگا، وەك بنکە و سەنتەرێك بووە، کەسەکانی لە دەوروبەری خۆیدا کۆکردۆتەوە. پەیوەندییەکی تر کە باس کرا بێ پەیوەندی ژنی براکانە، زۆرجار لە

کوردەواری یەك دوو برا یا زیاتریش ژنیان هێناوە و لە ماڵێکدا ژیاون، پەیوەندی ئەم ژن برایانە بەپێی پەندی پێشینان پەیوەندییەکی شلۆق و درز تێکەوتوو بووە، دواتر بە خراپ بەسەر براکانیش شکاوەتەوە، چونکە ((ژنێتی ژ بەر ژنێتی مال کر،...))[٤٤] (ژنێتی) لە سۆرانی (هاوگیان)ی پێ دەڵێن کە بە یەکەوە ئاسوودە نابن و خەریکی کێبڕکێ دەبن، بۆیە لە ڕقی یەکتر داوای ماڵی سەربەخۆ دەکەن، سێبەری ئەم تێڕوانینە درێژەی هەیە، ئێستا هەر پێش تاقیکردنەوەی پێکەوە ژیانەکە جیادەبنەوە و بەرگەی ژیان لەگەڵ یەکتر ناگرن، تەنانەت دێرینەکان لایان وابوو، ((ئاوی هەوێیان دەڕوا، هی هەوگیانان ناڕوا))[٤٥] هەوێ کە پەیوەندییەکان هەردووکیان ژنی یەك کەس دەگونجێن و دەتوانن بەیەکەوە بژین، کەچی هەوگیان کە هەریەکەیان ژنی برایەکن ناتوانن بەیەکەوە بگوزەرێنن.

(پلك) کەسێکی نزیکە لە منداڵی خوشکی، تەنیا یەك پەند باس لە ڕۆڵی پلك لە چوارچێوەی خێزاندا دەکات ((پلك بۆنی داکی لێ دێ))[٤٦]، چەشنی دایك دەتوانێ لەگەڵیانا بگوزەرێنێ، پەیوەندی خۆشەویستی بەیەکیان دەبەستێتەوە. (داپیر)یش لە پەندێکدا بەدی دەکرێت، ((شیردا بۆ داپیردا و داپیریش بە کلکە قوڵەی وەدا))[٤٧] ئەمە پاشماوەی حیکایەتێکی دێرینە، ئێستا بۆ مەبەستی داپیر بەکارنایەت، بەڵکو لەو سنوورە دەرچووە، بۆ هەر شتێك کە دوور و زەحمەت بێت و بە ئاسانی نەگاتە دەست، بەکار دەهێنرێت.

پەیوەندییەکی تری نێو کەسایەتییەکانی ژنان (هەوێ)یە، ئەم جۆرە پەیوەندییە لەسەر بناغەی کێبڕکێ و ڕق و کینەیە، بۆیە دەڵێن ((هەوێ لە ڕقی هەوێ دەخوا یەك عەربەی خوێ))[٤٨]، ئەمە خەسڵەتێکی نێگەتیڤی هەیە، بەلام (هەوێ) بە بەراورد لەگەڵ (هەوگیان)دا، (هەوێ) خەسڵەتێکی پۆزەتیڤی دەبێت، هەروەك ئاماژەمان پێدا، کورد بە مەبەستی هێورکردنەوە و سووککردنی باری هەوێداری وتوویانە ((ژەن ژەنش نەواردا))[٤٩].

(بەربووك) کەسێکی نێو پەندی پێشینانە، ئەو کەسە نزیکەی هەر لە هەنگاوەکانی سەرەتاوە تا کۆتایی لەگەڵ (بووك)دا دەبێت. زۆربەی کاتیش لەگەڵ بووکدا بەراوردی دەکەن*

((چەند بەربووك لە بووكێ جوانترن، بەڵام بووك بەختی دێتەوە))[٥٠] ئەمەش ئەوە دەردەخات کورد باوەڕی بە نێوچەوان و بەخت هەبووە، لە زۆر شتدا پێیان وابووە، بەخت ڕۆڵی دیاری تێدا دەنوێنێ، نەك توانا و جوانی...هتد.

(مەلاژن و ئاغاژن) دوو کەسایەتین خاڵێك کۆیان دەکاتەوە، ئەویش تا ڕادەیەك خۆیان لە پلەیەکی سەرووتری خەڵك دەبینن و خۆیان بە جیاوازی دادەنێن. بە تایبەتی کە کەسایەتی (ئاغا، مەلا) بە درێژایی مێژوو لە کۆمەڵگای کوردیدا دەسەڵاتدار بوون، ئاغا بە هۆی زەوی و زار و سامانەکەی، مەلا بەهۆی دەسەڵاتی خوێندەواری، خەڵکە سادەکە خزمەتی کردوون، بەڵام لە مەلا هێندە نەترساون، هێندەی لە ئاغا ترساون و حیسابیان بۆی کردووە، تا وردەوردە ڕۆڵی ئاغا کز بووە و شێوە و وێنەی جارانی نەماوە، کەچی هێشتا لە ناخی دەروونیانا پێکهاتەی ئاغایەتی لەلایان ماوە و دەناسرێنەوە.

ئەم دوو پلەیە ژنەکان بەهۆی مێردەکانیانەوە وەریانگرتووە و بەتایبەتی ئاغایەتییەکە لە ئاکامی چینایەتی دروست بووە ** (مەلاژن) دەلالەتی ڕێز و خۆشەویستی خەڵکانە، ((ژن بە شەوێك دەبێتە مەلاژن))[٥١] لە کاتێکدا (مەلا) بە شێوەیەکی گشتی ڕەمزی خوێندەواری و تێگەیشتوویی بووە، پلەی ژنەکە ماندووبوونی خۆی نییە، بەڵکو هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ (مەلا)، بەهۆی ئەوەوە ئەم پلەیەی بە ئامادەکراوی پێ بەخشراوە، ((نان نانی مەلایە و بارە قەلای مەلاژنێ))[٥٢] ئەمەش هەر بۆ ئامادەیی پلەکەی دەگەڕێتەوە، ئەم پەندە بۆ هەموو ئەو کەسانە بەکاردەهێنرێ کە کارێکی ڕێکوپێك دەکەن و کەسێکی تر بە هۆی ئەمەوە ناو دەردەکات واتە کەسانێك کە پیاوەتی بە ماڵی خەڵکییەوە دەکەن.

ئەم جۆرە ژنانە پۆز بە کار و دەسەڵاتی کەسانێکی ترەوە لێ دەدەن. (ئاغاژن) هاوشێوەی مەلاژن نییە لە پۆزلێدان و سروشتی گشتی، چونکە (ئاغاژن) لووت بەرزی و حەزکردنی خۆدەرخستنی زۆری هەیە و شانازی بەم پلەیە دەکات، ((بم نوێنن بە جلی گایە، پێم بلێن ژنی ئاغایە))[٥٣]، زیاتر گرنگیدانە بە ڕوخسار و شتە ڕووکەشەکان و حەزکردن بە گەورەیی، تەنانەت ئەم خۆ بەگەورە زانینە زیانیشی پێ بگەیەنێ لای پەسەندترە لە هەر شتێکی تر ((ئاغاژنێ سەر چەپەرێ، پشیلەکە هات دووگە بەرێ، بێزی نەهات ختەکەرێ))[٥٤]، لەبەر فیز و

گەورەییەکەی ناتوانێ زیان لە خۆیشی دووربخاتەوە، ئـەم کەسـایەتییە خـۆی لـە سەرووی خەڵکانی ئاسایی دادەنێ و لای وایە دەبێ چینەکانی تر خزمـەتی بکـەن. هەر بەو چاوە لە خەڵك دەڕوانێ، ئەمەش بۆشاییەکی دروست کـردووە و دروسـت دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا کـە کەسـایەتی (ئاغـاژن) واتـە ( خۆبـەزل زانـین)، بـەلاَم بەتەوســەوە و بـۆ ئـەوەی ئاگـاداری بکەنــەوە دەڵـێن ((ئاغـاژنیش پێویـستی بـە سووژنیش دەبێت))(٥٥)لە کۆتاییدا ئەویش مرۆڤە و پێویستی بـەو بابەتانـە دەبێـت کە ژنی هـەژار و کـەم دەرامـەت بـەکاری دەهێنـێ و شـتی بـچووکن بـە مەبەسـتی هۆشیارکردنەوەی ئەم جۆرە ژنە خۆ بە زل زانە کە ئەویش خەڵك ئاسایە.

## بەشی دووەم
## ناو و کار و کەرەستەکانی ژن لە پەندی پێشیناندا
### ١_ناوی تایبەت بە ژن

بەشێك لە پەندەکان هەڵگری ناوی دیاریکراون، ئەم ناوانە ڕەنگدانەوەی باری کۆمەڵایەتی و لایەنەکانی تری کۆمەڵگای کوردین . ئەم ناوانە تاکو ئێستاش وەکو خۆیان بەکاردێن، جگە لەچەند پەندێك نەبێت کە ناوەکان گۆڕاون .

ناوەکانیش ئەو ناوە باوانەن کە لەو کاتەدا دیاریکراو بوون لەو سەردەمەدا بەکارهاتوون و سیمای ناوی کوردییان لە خۆ گرتووە، وەك (( شەمێ لە شاییدایە، خەجۆ شاباشی دایە))[٥٦]، ئەو جۆرە پەندانەی کە دوو ناویان تێدایە، چەمکی ئەوە دەبەخشن کە کەسێکیان کارەکە ئەنجام دەدا . کەسی دووەمیان سوود وەردەگرێت و دیارتر دەبێت . وەك ((ئەسمەر تێکا، خانزاد فڕکا))[٥٧]، کەسانێك ماندوو دەبن، کەسانێکی تر بەرهەمەکەی دەخۆن، یا ((ڕەزی خاتێ، ماڵ ئاڤایی لە فاتێ))[٥٨]، چەمکی ئەو پەندەش بەهەمان شێوە یەکێك چاکەی لەگەڵ دەکات سوپاسگوزاری کەسێکی تر دەکرێت . ئەمەش دیاردەیەکی ناهاوسەنگەو زوڵم لە کەسێك دەکرێت لەسەر حیسابی کەسێکی تر .

یا ((ئەگەر خەجە، ئیشی وی قنجە))[٥٩]، پەسەندکردنی ئیشی کەسێك لە ئاکامی خۆشەویستی، هەندێ جار مەرجیش نییە کارەکە هێندە باش و پەسەند بێت، بەڵام خۆشەویستی و ڕێزەکە ناتەواوییەکانی کارەکە دادەپۆشێت .

یا (( پوورە عەیشێ جلکی شوشت ،چێشتی لێ ناو باری کرد))[٦٠] . بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت کە کارێکی لەناکاو ئەنجام دەدەن . لەکاتێك هیچ شوێنەواری ئەم کارە بەژیانیانەوە بەدی ناکرێت (جل شوشتن و چێشت لێنان) نیشانەی چەسپاوی و نیشتەجێ بوونە، کەچی (بارکردن) پێچەوانەی کارەکانی سەرەتا نیشانەی کۆکردنەوەو پڕ جوولەیی و ڕۆیشتنە. ئەم جۆرە کارانە دەبنە مایەی سەرسوڕمان و سەرنجڕاکێشانی بەرامبەر . ئەمە مانای پاراستنی نهێنی و کەسێتی شاراوە دەدات، یا ((ڕۆژ لە ئاوابوونە، فاتێ دەلینگی لوول ئەدا))[٦١] بۆ ئەو ژنانەی کە تەوەزەڵن و درەنگ کارەکانیان ڕادەپەڕێنن و زیاتر خەریکی خۆیانن، یاخود

((پلکە شەمام، هەموو ڕۆژێ حەمام))[٦٢] ئەمە لە شێوەی سەرسوڕمان بەو ژنانە دەوترێت کە زیاتر خەریکی خۆششتن و خۆ گۆڕینن . بۆ ئێستاش و لەبینینی هەڵوێست و کاری هاوشێوە هەمان ئەو ناوانە بەکاردەهێنرێن، واتە (پلکە شەمام) بۆتە ڕەمزێك بۆ هەموو ئەوانەی لەچەشنی ئەون و هەمان کار ئەنجام دەدەن . بۆ نموونە ((هەر خەجە ڕۆیەتی))[٦٣] کاتێ کەسێك بەبەردەوامی حەیف بۆ شتێکی لەدەستچوو دەخوات .

یان (( پوورە مەستان، کاسە بەو کاسە بسان))[٦٤]، جاران و ئێستاش لە هەندێ شوێن و گەڕەکی میللی ماوە، وەك داب و نەریتێك لە نێوان دراوسێکان چێشتیان دەبەخشییە یەکترو ئاڵوگۆڕیان دەکرد، بەتایبەتی گەر چێشتێکی دیارو باشیان دروست کردبا، وەك ئەرکێکی دراوسێتی بەرامبەر یەکتر، بەلأم چەمکی ئەم پەندە لەسەر ئەوە بەندە کە ئاڵوگۆڕییەکە دەبێ لەلایەن هەردوولاوە بێت . ناشێت لایەك ئەنجامی بداو ئەوی تر نا . گەر بتەوێ چێشتت بۆ بێت، دەبێ خۆشت بەشداری بکەیت .

((بۆنی تس لەماڵێ نایەت، ناوی کچی نارنجۆکە))[٦٥] بۆئەوە بەکاردێت کە ناوێك هەبێت، بەلأم شوێنەواری بەدی ناکرێت . ئەمەش دوانەیەکی دژ بەیەکن . یا (( خۆ ئەمە لە فاتمە دۆمێ نینە))[٦٦] لە ئاکامی بێبەشکردنی کەسێك ئەمە دەوترێ . وەك داواکردنێك بۆ ماف و هەقی خۆی و ئاگادارکردنەوەی بەرامبەر بۆ مافە فەرامۆشکراوەکەی .

یان دەڵێن : (( فاتمۆکەو عەیشۆکە لە ڕێی دەکەن دوو قسۆکە))[٦٧] زمانی ئەم پەندە بەزەیی و میهرەبانی بەرامبەر ئەو دوو ناوە تێدا بەدی دەکرێت، چونکە ناوەکانیشیان بچووك کراوەتەوە، قسەکانیشیان کورت کراوەتەوە، بەلأم مەبەست پێچەوانەی ئەمەیە، چونکە ژن بەوە دەناسرێت کە زۆرتر خەریکی قسەکردن دەبن . هەروەها ڕەمزێکیشن بۆ هاوڕێتی و دڵسۆزی و نزیکی لە یەکترییەوە .

یان (( لە دەرێ ڕابی، لە ژوورێ ڕۆمی هاوارم بە بەر تۆ ڕەببی))[٦٨] کەسانێك لە نێوان دوو ترس بن ئەوا هەردەبێ هاوار بۆ یەزدان بەرن، هەروەها ((پوورە فەرەنگێز تۆ تەشیەکەی من بڕێس ، هینەکەی خۆت بدە بە نیو ڕێس ))[٦٩]، (تەشی ڕستن) هێمایە بۆئەوەی ئیشەکەی من بکەو ئیشەکەی خۆت جێ بهێڵە بۆ

کات و یەکێکی تر . ئەمە بۆ ئەو کەسە هەلپەرستانەیە کە گرنگ جێبەجێکردنی ئیشەکانی خۆیانەو هیچ شتێکی تریان لا گرنگ نییە .لە پەندێکی تردا هاتووە ((کابانت پوور بەهیَ بیَ، حالَت حالَی سەیَ بیَ))[٧٠]، (پوور بەهیَ) بۆتە ڕەمزی کابانێکی خاو و ناکریَ پشتی پیَ ببەسترێت . یا ((فیتە لەبەریا فیتی کرد، ئەسمەر کراسی چیتی کرد))[٧١]، ئەم پەندە کە ناوی ( ئەسمەر)ی لەخۆ گرتووە و یەکێکە لەو ناوانەی کە لە گەلیَ پەندا بەدی دەکرێت، ناوێکە پانتاییەکی زۆری لەو کاتانەدا داگیر کردبوو، ئێستا ئەم ناوە بەدی ناکرێت . ئەم پەندە بەکەسێك دەلَێن کە لە دوای خۆشەویستییەکی گەورە باکی نەبێت و بەدوای ئارەزووە خودییەکانی خۆیدا بڕوات . ناوی ( فاتم) کە کورتکراوەکەی (فاتە)یە، هاوشانی ئەسمەرە لە بەکارهێنانی لە پەندا کە ناوێکی زۆر باو و بلاَوی نێو کۆمەلَگەی کوردی بووە . ئێستا مەگەر بۆ خۆشەویستی کەسێکی ئازیزی مردوو ئەم ناوە زیندوو بکرێتەوە، ئەگەر نا زۆر دەگمەن و بەرەو نەمان چووە . وەك ((خۆی و گونی، فاتەکەی ژنی))[٧٢] مەبەستیش لە چەمکی ئەم پەندە بار سووکییە، کە شتێکی وای نەبیَ قورسایی بۆ دروست بکات، بۆیە گواستنەوەشی ئاسان و بیَ ئەرك دەبێت .

ئەو ناوانەی باس کراون ناوی باوی نێو کۆمەلَگای کوردین، لەگەلَ ناوەڕۆکی پەندەکاندا گونجانێکی زۆریان دروست کردووە . تەنیا لە پەندێکدا ڕەنگدانەوەی (لەیلی و مەجنون)ی عەرەبی بەدی دەکرێت . ئەمەش بەهۆی بلاَوبوونەوەو ناسینی داستانی (لەیلی و مەجنون) کە لە سەرووی هەموو داستان و نووسینە عەرەبییەکانی تر بووە .لەوانەیە لەبەر ئەوەش بێت کە ئەو داستانە کراوەتە کوردی و ئەم ناوانە ئاشنایەتییان لەگەلَ کۆمەلَگای کوردی دروست کردووە .((لەیلیَ بەچاوی مەجنون قەشەنگە))[٧٣]، یا ((لەیلی پیاگ بوو یا ژن؟!))[٧٤] لەئەنجامی بیَ ئاگایی ئەم جۆرە پرسیارە سەر هەلَدەدات .

## ٢_ئیشی تایبەت بە ژن

لەنێو پەندی پێشیناندا چەندین پەند هەن کە گوزارشت لە ئیشی ژنان دەکەن، بەبیَ ئەوەی خودی (ژن)ی تێدا هەبێت . ئەم ئیشانە هەر لە دێرینەوە

تایبەتن بەژن و ژنی پێ دەناسرێت و بەراوردی لەگەڵ ژنی تردا پێدەکرێت، لە کاتێکدا دێرینەکان وا ئیش و کارەکانی ژنانیان هەڵسەنگاندووە کە کۆتایی نایەو لایان وابووە ((ئیشی ژنان سی و چارن، هەر نان و شیو دیارن))[٧٥] . یا دەڵێن : ((ئیشی ژنان سی و چارن، هەر نان و شیو دیارن))[٧٦] . بەمەش زوڵمێکی زۆریان لە ژن کردووە، چونکە ژن لە هەموو کاروبارەکانی ژیان بەشدارییان کردووە و لە پیاو زیاتر ماندووترو ئیشکەرتر بوون .

لە سەرووی ئەو کارانەی لە پەندا زۆر بەدی دەکرێن چێشت لێنانە وەك ئەرکی سەرەکی ماڵ کە بە (کابان)* وەسف دەکرێت . خەسڵەتی کابان یەکێکە لەو خەسڵەتە گرنگانەی کەسایەتی ژنی چاکی پێ دەناسرێت، تەنانەت پێشینان لایان وا بووە(( ماڵی بێ کابان وەك کاولە ئاشییە))[٧٧] . لەکاتێکدا (کابان) لە زۆر کاتدا هاوواتای (ژن)ە . پوختەیی ماڵ بەکابان دەبەسترێتەوە، لەکاتێکدا ((کابان یان بێ بەشە یان ڕووڕەشە))[٧٨] لەبەرئەوەی خۆی سەرپەرشتی خواردن دەکات و دابەشی دەکات . زۆرجار لەبەر ئەوانی تر خۆی بێ بەش یا بەشێکی کەمی بۆ دەمێنێتەوە کابان بەستراوەتەوە بە ماڵ و سووڕێنەری ماڵ بۆیە ((ئەگەر کابان نە لەماڵە، شت هەمووی خەسارە))[٧٩] کابان ڕۆڵی سەرەکی و گرنگ و پڕ بایەخی لە بەڕێوەبردنی ماڵدا هەیە (( ماڵ تێرە، کابانی شێرە))[٨٠]، بەلام (( ئەگەر کابان تێرە دنیا تحێرە، ئەگەر کابان برسییە دنیا خەنییە))[٨١]، چونکە گەر خۆی برسی بێت زووترو خێراتر هەوڵی ئامادەکردنی خواردن دەدات . کابانیش بەستراوەتەوە بە جۆری چێشتەکە . دێرینەکان وردبین بوون لە هەڵسەنگاندنی ژن و ئیشەکانیان، سەرنجی ئەوەیان داوە، ئەگەر لە کابانێك زیاتر بوو ئەوا (( شیوی زۆر کابان یان سوێرە یان بێ خێ))[٨٢] . لە کاتێکدا ((کابان کە شیوی سوور بوو یان بێ خوێ مانایەکی لێ دەفامرێ))[٨٣] ئەم حاڵەتە پەیوەندی بە میزاجی ژنەکەو کاتەکە هەیە، دەشێ لایەنی دەروونی ئارام نەبێت، یا هەر هۆکارێکی تر هەبێت، چونکە دێرینەکان هەموو وردەکاریەکانیان لێکداوەتەوە . تەنانەت ((دوو کەیبانوو لە مەنجەڵێکا ناکولێن))[٨٤]

پەیوەندی نێوان (کابان)ێتی بە (ژن) ئەوەیە کە (( هەموو کابانەك ژنە، هەموو ژنەك کابان نییە))[٨٥] . خەسڵەتی کابانێتی تایبەتە بەو ژنانەی کە خولیاو

ئارەزووی ئیش و کاری ناو ماڵیان هەیەو بایەخ بە جوانکاری دەدەن . ئینجا جوانکاری کەلوپەلی ناو ماڵ بێت یا جوانکاری خواردن و ڕازاندنەوەی خوان بێت، بە هیچ شێوەیەك دوو کەیبانوو لەیەك شوێندا کۆ نابنەوە، چونکە هەر خۆی کابانێتی سەربەخۆیی خۆی هەیە، بۆیە ((خانووی دوو کەیبانوو خۆڵی تا ئەژنۆیە))[٨٦]. لە ئاکامی بوونی (دوو) ماڵەکە پەشێو و نارێك دەبێت، کەسیان کارەکانیان بەرێکی ئەنجام نادەن . لە کاتێکدا ((کابان ئەو کابانە، پێستەی بکاتە هەمبانە))[٨٧] .

دەست ڕەنگینی یەکێکە لەو خەسڵەتانەی کە کابانی لە ناکابان جیادەکاتەوە، چونکە ((ژن ئەگەر نەخشینە، ماڵی ڕەنگینە))[٨٨] چەند ژن کارزان و کابان بێت، ئەوەندە لەناو ماڵەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە .

کۆمەڵگای کوردی ماڵ و کارکردن و چۆنیەتی کارەکانی ژنی کردۆتە پێوانە، ڕێژەی کارکردن چەند لە بەرزیدا بێت هێشتا لایان کەم بووەو کەم قسەکردنیشیان لا خەسڵەتێکی چاك بووە، بۆ ئەوەی زیاتر بایەخ بەکارەکانیان بدەن و کاتێکی زیاتری بۆ تەرخان بکەن .(( ژن کەم دوو بێ، چەند کارکەر بێ))[٨٩] . خۆ خۆشەویست کردنیش لای هاوسەرو کەس و کاری هاوسەرەکەی هەر بەهۆی کارکردن و چوستی و چالاکی بووە، بۆیە ژنەکە بە شانازییەوە دەڵێ : ((ئەمن لەبانان دەبەزم، سمێڵی پیاوم دەگەزم))[٩٠]. نزیکبوونەوە بەهۆی کارکردن و چوستی و چالاکی نواندن لە ئیش و کاردا، پێچەوانەی ئەمەش ژنی ئیش نەکەرو تەوەزەڵ هەمیشە لە پەنددا بۆتە مایەی تەوس و پلار تێگرتن و بەدیاردەو حاڵەتێکی نەشیاو تەماشا کراوە، وەك ((ئێوارەی لەدەلینگان، سێ ڕێزەی لەکلاوی))[٩١]. لەبارەی ئەو ژنانەیە کە زیاتر خەریکی خۆ ڕازاندنەوەن و ئیش و کارەکانیان فەرامۆش دەکەن، بۆیە وتوویانە((ئەوەی هەر چەنگە مووەکی بەسەریەوە بێ بەژن حیساب ناکرێ))[٩٢]، چەمکی ئەم پەندەش لەگەڵ چەمکی پەندەکەی پێشوودا یەك دەگرێتەوە، هەموویان جەخت لەسەر کارکردن و ڕێکوپێکی ژن دەکەنەوە، نەك ڕەنگ و ڕوخساری ژن، چونکە بەکارکردن و ڕازاوەیی ماڵ خۆشەویست دەبێت، نەك بەجوانی خودی خۆی و ڕوخساری .

دێرینەکان ئەوەشیان ڕەچاو کردووە کە ئیش و کاری ژنان لە مانگی ڕەمەزاندا زیاتر دەبێت ((ڕەمەزانە، مەرگی ژنانە))[٩٣] .

(خاتوون)یش هاوواتای (کابان)ی و دەست ڕەنگینی ژن دەنوێنی، بەلاَم لەپەندی پێشیناندا زیاتر جەخت لەسەر (کابان)ێتییەکە کراوەتەوە، چونکە فراوانترە لە (خاتوون)، لەوانەیە (خاتوون) لەیەك لایەن یا زیاتر بێت، بەلاَم (کابان) هەموو لایەنەکان دەگرێتەوە ((ئیش ئیشی خاتوونێ، ناو ناوی مەیموونێ))[٩٤] . بۆکاروبارێکی ڕێك دەگەڕێتەوە کە کەسێك ئەنجامی دابێت و یەکێکی تر پێی بنازێ و ناوبانگ دەربکات . لەبارەی خۆ خەریککردنی ژنان وتوویانە (( بەدوو ژنان بزنەك دەدۆشن، لە هەردوو ماران ڕوونی دەفرۆشن))[٩٥] . بۆ شتی کەم شوێنی زۆر دەخەنەکار، ئەمەش تەنیا خۆ خەریککردنە، پێچەوانەی ژنی کارکەرو ڕێکە، تەنانەت ((دیزە لەدەست کابانێ بشکێ تەقەی نایێ))[٩٦]، هێندە بەکارامەیی دەناسرێت، کە زیانەکانیشی چەشنی خۆی بە زیان ناژمێردرێ . ئەمەش ڕێزو گەورەیییەك بە کابان دەبەخشێ . بووکیش هەربەهۆی ئیش و کارەکانیەوە هەلّسەنگێنراوە، دەلّێن ((بووکا سالارا، شەو و ڕۆژ لە دارا))[٩٧] (دارکردن) یەکێك بووە لەو ئیش و کارانەی لە ئەستۆی ژندا بووە بەتایبەتی، چونکە تاقە سەرچاوەی سووتەمەنی بووە بۆ پێویستییەکانی ژیانیان، بۆیە بووکی گوێڕایەلّ دەبوایە ئەم کارەی بە ڕێکی ڕاپەڕاندبایە .

هەروەها (گێسك لێدان)یش کارێکی تر بووە و کەسایەتی ژنی پێ ناسراوە، چونکە نەدەبوایە هیچ شوێنەوارێکی پیسی بەجێ بهێلّێت، بۆیە وتوویانە (( تازەبووك گێسك باش دەدات))[٩٨] . ئەم کارە وەك بەلّگەیەك بۆ چەسپاندنی کەسایەتییەکەی لە نێو مالّە نوێیەکەیدا . بەتایبەتی کە جاران هەمیشە بووك لەگەلّ مالّی خەزوورانی نیشتەجێ بووە، مالّی سەربەخۆی نەبووە، لەبەرئەوە چاودێری لەسەر ئیش و کارەکانی هەبوون .

ئەو هەموو ئیش و کارانەی کە ژنان ئەنجامیان داوە بەشێك بوون لە پسپۆڕی و لێزانینی خۆیان بۆ ئەو کارانە، بەلاَم کاری واش هەبووە کە ژن لێی نەزان بووەو نەیتوانیوە بەڕێکی ئەنجامی بدات، ئەگەرچی هەندێ جار ناچار بووبێ بۆ ئەنجامدانی ((ژن ببوونە گەورەی ماران، گیسکیان دەبڕیەوەو کاوڕیان

دەهێـشتەوە))[99] یـا (( تـەگبیر کـەرێ مـارێ ژن بـێ گیـسکێ سـارێ دوو جـار بڕبێ))[100] .

چەمکی ئەو پەندانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئیـشی ژنـان و ئیـشی پیـاوان جیاوازە و هەندێ ئیش گەر ژن بیکات ڕێـڕەوی ئیـشەکە تێك دەچـێت، لـە نێـوان ژنانیش خۆیاندا دوو جۆر هەیە ژنی چـاك و ژنـی خـراپ بـە پێـی ئیـشەکانیان . (( ژنی ڕەن لەبەهارا ڕۆن ئەکا، ژنی گەن لەپایزا))[101]، ئەمە بەراوردێکە لە ماڵداریدا، چـونکە لـە بـەهاردا* شـیر زۆرە نـەك لـە پـایزدا . کابـانی و جـۆری چێـشتەکە و ڕەنگدانەوەی لەسەر دەوروبەرو باری دەروونی کابانەکە لە پەنـدی پێـشینان‌دا بـە وردی گوزارشتیان لێ کراوە . تەنانەت تووڕەبوونی کابان وەك ئـەوەی چێـشتی لێ نەنابێ، بەڵام ئەمە وەك فێڵێك بۆ بەرامبەرەکەی بەکار بهێنێ لـەم پەنـدەدا بـەدی دەکرێت ((بڕبڕی مەنجەڵی و تووڕەیی کابانێ لێك دوورە))[102] . ئەمـە لـە خـەیاڵی هاوسەر یا هەرکەسێکی نزیکی کابانەکە لێك دەدرێتەوە . جاری وا هەیـە کابانەکـە لە میوان وەڕس بێت . کاریگەرییەکی زۆر بەسەر میـوان دروسـت دەکـات ئەمـەش هـەر لەئـەنجامی ئەوەیـە کـە خزمـەت و ئـیش کردنـەکان لـە ئەسـتۆی ژنـن، بۆیـە کاریگەریشیان زۆرتر دەبێت ((کشە مریشکە دونگزە، کابـان ئەمـشەو زیـزە))[103]، بـارێکی نێگـەتیڤی لـێ دەکەوێتـەوە . جـۆری کابـان و چێشتەکە لـە پەنـدا بـەم شێوەیە ڕەنگی داوەتەوە وەك :

- برنجە کابان قنجە [104] ئەمە کابان خۆشەویست دەکات
- بروشە کابان تووشە[105] ئەمە کابان تووڕە دەکات
- داندۆکە کابان کۆکە[106] ئەمە کابان جوان و ڕێك دەکات، چونکە ئەرکی نییە .
- ساوارە کابان هارە[107] ئەمە کابان تووشی هەڵچوون دەکات

وەسفی کابانەکە لەسەر ڕیتمی جۆری چێشتەکە زیرەکانە دانراوە .

کارێکی تری ژن لە پەندا ئاماژەی پێکرا بێـت، بـەبێ ئـەوەی نـاوی ژنـی تێـدا بێــت (مانگــا دۆشــین)ە، وتوویانــە ((مانگــا دۆشــین و قــەزوان کرۆشــتنیان نەوتووە))[108]، چونکە مانگا دۆشین جوولەو کاری سەربەخۆی پێویستە، قـەزوان

کرۆشتن پێچەوانەی کارەکانی تر پێویستی بەدانیشتن و ئاسوودەیی هەیە . ناکرێ هەردووکیان لە یەك کاتدا ئەنجام بدرێن .

تەنانەت کاتی (هەویرکردن)یش بیرکردنەوە جیاوازە وەك لە کاتەکانی تر، بۆیە وتراوە ((دەستم لە هەویرە، هەر ئەوەندەم لەبیرە))[109] . ئەمە بەهۆی رابردوویەکی چڕو پڕ لە بەسەرهات و رووداو سەر هەڵدەدا، جۆرێك لە تەوس و پلاری تێدایە، نەك ناپاکی کردنی بیرەوەری، بۆیە هەویرکردنەکە دەکاتە پاساوێك بۆ کۆتایی هێنانی وەلآمی ئەو پرسیارەی ئاراستەی کراوە .

یەکێ لە ئەرکەکانی تری (کابان) ئەو پردەیە کە لەگەڵ دراوسێدا دروستی دەکات . لە سەردەمی دێریندا (ئێستاش لە گەڕەکە میللییەکاندا بەدی دەکرێت) چێشت لە نێوان دراوسێکاندا ئاڵوگۆڕ دەکرا، بەمەش هاوبەشییان لە تامکردنی چێشتی یەکتر دەکرد و دواتر ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەبارەی چێشتەکە ئەنجام دەدرا، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە پەیوەندییەکانی پتەوتر و زیاتر لەیەك نزیك دەبوونەوە، بۆیە وتوویانە ((ئەگەر کابان بێ نەوسە، جیران یەك کەوچکی بەسە))[110] بەمە هاوبەشی کردنی ژیانی یەکتری دەبوون و چێژیان لەم هەستی نزیکی و بەسەرکردنەوەیە وەرگرتووە .

ئەو ژنانەی کە خۆیان لەکارە هەرەوەزییەکان بەهەر پاساوێك بێت دزیوەتەوە ئەوا پەندی تایبەتی ئاراستە کراوە وەك : (( ئەدالێ هێدەرەی وەش وەش ملۆ سەیەو نەری))[111] . (خۆش خۆش) مەبەست وردە وردە خۆی دەکێشێتەوە بە پاساوی منداڵ . ئەم دیاردەیەش پەسند نەبووە، چونکە ژنی کورد بەگشتی بەئیش و کار و چالاکی ناسراون . ئەم جۆرە ژنانەیان بە تەوەزەڵ داناوە . یا بۆ مەبەستی نیشاندانی ژنی نەوسن و پاساوهێنانەوە دەوترێت (( یەك بۆ ئایە، یەك بۆ کایە))[112] کە گەلێك لە ژنان لە کاتی چێشت لێنان کە رەستەی چێشتەکە تام دەکەن و ناتوانن لە تامکردن بوەستن تا کاتی کوڵان وئامادەکردنی چێشتەکە هەندێ ئیشی تر لە نێو پەنددا هەن کە تایبەتن بە ژن ،بەڵام مەبەست لە هێنانەوەی ئەم ئیشانە و خودی ئیشەکە وجێبەجێکردنی نییە، بەڵکو زیاتر هێمایەکن بۆ مەبەستێکی دیاریکراو وەك (( بەخەرکیم رێست، بەخەرکیم بادا، کردمە جاجم بەخۆم دادا))[113] .

(ڕستن و بادان) یەکێك بوون لە ئیشە سەرەکییەکانی ژنان . لێرەدا هێمایە بۆ ناپاکی و کەسێکی فێڵباز و چەوسێنەر کە ئیشی خۆی بەخەڵکی تر بکات و بەرهەمەکەشی تەنیا خودی خۆی سوودی لێ وەربگرێت .

لە ڕوانگەی پێشیناندا ژن بە ئیشکردنەوە جوان بووە، ژنی ئیشکەریان پەسندتر کردووە، بۆیە وتوویانە ((ژنێ سەر بەتۆز، نە ژنێ قیت و قۆز))[114]، چونکە ئیشکردن واتە بوونی بەرهەم، جۆری بەرهەمەکەش گرنگ و پڕبایەخە و دەبێتە پێوەری ئیشەکە .

دروستکردنی خواردن لەنێو پەندا لە هەموو ئیشەکانی تری ژن زیاتر بایەخی پێدراوە، هەر بۆیە وتوویانە ((دماڵێدە کەسا هەرە خەباتکار بێگومان کەبانییە))[115]، ئینجا منداڵ بەخێوکردن و ناو ماڵ ڕێکخستن و کارەکانی تر دێن .

### ٣_کەرەستەی تایبەت بە ژن

لەنێو پەندی پێشیناندا چەندین کەرەستەی تایبەت بە ژن بەدی دەکرێت، بەشێکیان بەمەبەستی جوانی و بەشێکی تریان بەمەبەستی گەیاندنی مانایەك و وانەیەك هاتووە، لە سەرووی هەموویانەوە خشڵە، کە ژن و خشڵ وەك دووانەیەکن و لەیەکتری جیانابنەوە، وەك غەریزەیەك ژنان حەز بەڕازاندنەوە دەکەن . هەرچەندە پێشینان لایان وابووە (( ڕەوشتی ژن لە زێڕ چاکترە))[116] بایەخیان بەناوەرۆك داوە زیاتر لە ڕوخسار . لەگەڵ ئەوەشدا ڕوخساریان فەرامۆش نەکردووە، لە بەرامبەر ئەم پەندە ئەوەش هەیە کە (( ئاڵتون لەقوڕدا دیارە))[117] ئاڵتون ڕەمزە بۆ ژن، ژن جوان بێ چەندیش کەم دەرامەت بێ هەر جوانە .

یەکێ لە کەرەستە سەرەکییەکانی پەندی پێشینان لەو خشڵە مەعنەوی و خوازەییانەی کە پێشینان پەسندیان کردووە ئەوەیە کە ((بێدەنگی چاکترین خشڵە بۆ ئافرەت))[118] .

لەگەڵ ئەوەشدا (جیهاز)* کە جۆرێك لە ڕاستەوخۆیی تێدایەو لە نێو هەندی پەندا ڕەنگی داوەتەوە، پێچەوانەی پەندەکەی پێش خۆیەتی، چونکە ئەمەیان ماددییە و ئەویان مەعنەوی بۆیە وتوویانە ((ئەوەی لەگەڵ بووکێ نەبێ، لەگەڵ بەربووکێ نابێ))[119] هەر لەبەر ئەوە دەڵێن : ((چی لەگەڵ بووکێ نەبێ، لەبۆ

زاوای نابێ ))[١٢٠] هەرچەندە ئەمانـە پێوانەیـەکی گشتی نـین، دەشـێ پێچەوانەی ئەمانەش لە ئارادا بێت، لە سەرەتادا شتێکی وانەبێت، بەلاّم دواتر شت و کەلوپەلی زۆر بێت

یـا (( نـازی لـە قـەدەر جیهـازی))[١٢١] . بـە ڕادەو ڕێـژەی جیهازەکـەی نـازی ڕادەگیرێت و بایەخی پێ دەدرێت .

یەکێکی تـر لـەو کەرەسـتە تایبەتییانـەی ژن کـە زۆر بـەکار هاتبێـت، (کـل)ە وەکو کەرەستەیەکی جوانکردن، هەموو ڕازانەوەکانیان بەهۆی (کل و کلدان)** ەوە بووە . بۆتە مایـەی سەرنجراکێـشانی ژن، بۆیـە وتوویانـە ((ژن چـییە بەنـەینۆك و کلدانەکی هەڵدەخەڵەتیّ))[١٢٢] . یا ((حەفتی بمـرێ لـە بـاوان، سـورمەی نـابرێ لـە چاوان))[١٢٣] یا ((شل و مل و چاو بەکل، لەبۆ ئیشێ بێ دەست و پـل))[١٢٤] . دوو حاڵـەتی پێـچەوانەن ، ئـەو ژنانـەی زیـاتر خـەریکی ڕازانـەوەی خۆیـانن و ئـیش و کارەکانیشیان فەرامۆش دەکەن . ئەم پەندە تەوس و پلارە بۆ ئەو جۆرە ژنانـە ، یـا ((شـووم کردگـە پـامورەو پۆزەوانـەم بـێ))[١٢٥] ئامـانج لـە شـووکردنەکە وەك خەونێك تەنیا ئەوەیە کە خڵخاڵ و ساقبەندی هەبێت . ئـەم جـۆرە خەونانـە تـاکو ئێستاش هەیە، بەلاّم ڕێژەکەی کەم بۆتەوە . بەپێی ڕێـژەی هۆشـیاری کەسـەکان دەگۆڕێت .

هەمان چـەمك لـە پەنـدێکی تـردا بـەم شـێوەیە گوزارشـتی لـێ کـراوە (( زاوا نییەتی دانـدۆك، بـووك دەیـەوێ گۆبـەرۆك))[١٢٦]، پلـەی بـەرزڕوانین لـەم پەنـدەدا زیــاترە لـــە پەندەکـــەی پێـــشووتر، چـــونکە دانـــدۆك نیـــشانەی هەژارییـــە و ناهاوسەنگییەکی زۆر لەم چەشنە پەندانەدا بەدی دەکرێت .

جـل و بـەرگی تایبـەت بـە ژن لـە هەنـدێ پەنـددا ڕەنگیـان داوەتـەوە. وەك ((هەنگوچك سپی بەقوربانم نـەبن؟! کـراس ڕەش زۆرن))[١٢٧] . هەنگوچـك قـۆڵی کراسی کوردییە و بەشێکە لە کراسەکە، پەیوەست کراوە بە ڕەنگی (سـپی)، واتـە بەشێکی بچووکیش بێت بەلاّم ڕاست و ڕەوان بێت باشترە لە بەشێکی گەورە و زۆر کەچی ڕەش بێت . لەگەڵ ئەوەشدا لە چەمکی پەندەکە ئەوە بەدی دەکرێت گـەر کەسی پلە یەك نەبێت، ئەوا پلە دوو هەیە، بۆیە وەك نائومێدییەك ئامادەیی خـۆی بۆ کراسی ڕەش دەردەبڕێ .

یـا بـەکارهێنانی کەرەسـتە لـە بـری سـیفەتێکی دیـاریکراو، وەك ((هــەر دەرەلنگێکی* لـە مالێـك پـساوە))(١٢٨)، بۆتـە درکـە بـۆ ژنـی گـەڕۆك** یـا دیـسان بەتەوسەوە و بە واتایەکی خوازەیی دەوترێ ((خوشکم لـۆ نـەهاتی، خـۆ خرخاڵـت نەدەزرنگاوە))(١٢٩)، یا بە گلەیی و سکالاَ ئاڕاستەکردن دەوترێ ((کلیلـی خرخاڵـت دەکرایەوە))(١٣٠) . بەهۆی ئامادەنەبوونی یـا دەرنەکـەوتنی کەسـێك لـە بۆنەیـەکی دیـاریکراودا ئــەم پەندانــەیان ئاڕاسـتە دەکـرێ . لــە ئاکـامی ئــەو بۆشـاییەی ئامادەنەبوونەکـە دروسـتی دەکـات  ئەمـەش زۆربـەی کـات لـە خۆشەویـستییەوە سەرچاوە دەگرێ . هەرچەندە شـێوازی ئاڕاسـتەکردنەکە لـە شـێوەی پرسـیارێکی سەرسوڕمان ئـامێزە یـا (( شـەدە لـۆ یەکـەك ژنـی سـالار بـێ، وەك ئاغـاژنی مـن ڕەسـەنی دیـاربێ))(١٣١)، جـاران (شـەدە) یـەکێك بـوو لـە دیارییـە بەنرخـەکان و نیشانەو هێمای خۆشەویستی بووە . لەم پەندەشدا کەسێك نموونە بـە کەسـایەتی ژنەکـەی دەهێنێتـەوە کـە شایـستەی ئـەم دیارییـە بێـت، لەبەرئـەوەی ڕەسـەن و بنەماڵەی دیارە. ئەمەش جۆرێکە لە شانازی و ستایشکردن .

هەندێ جار لە پەندی پێشیناندا ئەوە بەدی دەکرێت کە خشلّ کێشەو نـاکۆکی دروسـت کـردووە، وەك ((بـووك نیتــی شـیوی شــەوێ، ئەنگوسـتیلەی دەسـتی دەوێ))(١٣٢)، ئەو کەسانەی کە لەخۆیان بەرزتر دەڕوانن و بەپێی بارودۆخی خۆیان هەڵسوکەوت ناکەن   .

## ئه نجامەكان

– بەشێكی پەندەكان خەسڵەتە پۆزەتیڤەكانی ژن دەخەنە ڕوو وەك خۆشەویستی و میهرەبانی و كارامەیی و توانای ڕێكخستن و ماڵداری و.........هتد

– بەشێوەیەكی گشتی ژنیان وەكو ستوونی ژیان و كۆمەڵگا داناوە، كە ژیان و كۆمەڵگا ژیانیان لەسەر ژن بەندە، بەهەمان شێوە پێوانەكەش هەر بەهۆی ژنەوە هاوسەنگ یا نا هاوسەنگ دەبێت .

_ سەرباری گۆڕانی سەردەم و ژیان و دەوروبەر، پەندەكان بەهۆی ناوەڕۆكەكانیانەوە توانای گونجان و مانەوەیان هەیە، بە مەبەستی گوزارشتكردن لە بیركردنەوەی میللەت .

– كەسایەتی ژن بە پێی قۆناغی تەمەن و بارودۆخی دەوردراوییان ڕۆڵێكی چالاكیان لە كۆمەڵگادا نواندووەو دەنوێنن، هەڵسووڕێنەری ژیانی كۆمەڵگان .

– كەسایەتی ژن بەتەواوی لە نێو پەنددا بەرجەستە بووە، هەر لە هەڵسوكەوت و بیركردنەوە تا زۆربەی وردەكارییەكانی تر.

– كەسایەتی بێوەژن جۆری (ا) چالاكترو پۆزەتیڤتر خراوەتە ڕوو، زیاتریش ناوی لە پەنددا هاتووە.

– كەسایەتی باوەژن قالبێكی ئامادەی هەبووەو هەیە . هیچ گۆڕانێكی بەسەردا نەهاتووە، جگە لە ڕۆڵێكی نێگەتیڤ لەنێو كۆمەڵگادا نەبێت .

– پەندەكان زیاتر گرنگی و بایەخیان بە نیشاندانی وێنەی كەسە نزیكەكان داوە . هەندێ كەسی چەشنی (خاڵۆژن، مامۆژن ........ هتد .) زۆر دەگمەن و ناوازەن نەك تەنیا لەنێو پەندی پێشینانی كوردیدا، بەڵكو لەنێو پەندی پێشینانی عەرەبیشدا بەهەمان شێوەن.

– هەستپێكردنێكی خودی لە پەیوەندییەكاندا بەدی دەكرێت، بەهۆی ئەو هەستەی دەوری واتا ڕاستەقینەكانی نێو پەندەكانی داوە ، كە پڕن لە ژیان .

– مامەڵەكردن لەگەڵ ئیش و كارو كەرەستە تایبەتییەكانی ژن بە تەواوی لە نێو پەندەكاندا ڕەنگیان داوەتەوە و دەتوانرێ هەست بە ئازارو جۆری بیركردنەوەیان بكرێت، لە پاڵ مامەڵەكردنیان لەگەڵ كەرەستەكاندا و ڕۆڵی ئەو كەرەستانە لە ژیانی گشتی ژناندا.

– زمانی پەندەكان زمانێكی سادەی خەڵكن، بەڵام قووڵن و لە چوارچێوەیەكی شیاو داڕێژراون كە هەست بە دەرچوون یا زێدەڕۆیی ناكرێت، تەنیا لە چەند بارێكی كەمدا نەبێت .

## سەرچاوەکان

**به زمانی کوردی/أ_کتێبەکان**


- ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان گوستاولوبون ، گوتەی مەزنان و فلسفی، چاپخانەی ئەیتام، بەغدا، ١٩٣٣ .
- جگەر سۆز پێندرۆیی، ٢٠٠٠ پەند ژ جیهانیّ، چاپخانەی سپیرێز، دهۆك، ٢٠٠٥ .
- حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٦ .
- حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٢ .
- خالید جوتیار، دەشتی هەولێر – پەندو زاری شیرین، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥ .
- دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی لە پەندی پێشیناندا، چاپخانەی چوارچرا، هەولێر، ٢٠٠٧ .
- ڕۆهات ئەلاکۆم، د فۆلکلوری کوردی دە، سەردەستەکیەکە ژنان، و/ئازاد عبدالعزیز مزیری، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦ .
- ڕێبوار جەمال، پەندی پێشینان لە ناوچەی پشدەردا، ئینستیتۆتی کەلەپوری کورد، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨ .
- سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پشنان، جلد دوم، مرکز نشر و فرهنگ و أدبیات کردی، انتشارات صلاح الدین أیوبی، ١٣٧٨ .
- سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پشنان، جلد أول، انتشارات صلاح الدین ایوبی، تهران ، ١٣٦٩ .
- شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٧ .
- عومەر شێخەڵلا، پەندی کوردی، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٨٠
- قەناتی کوردۆ (کوردۆیڤ)، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری، پێداچوونەوە /د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦ .

- کەریم شارەزا، پەندی بەراوردکاری (لەنێوان ئینگلیزی و عارەبی و کوردی)، چاپخانەی سمیر أمیس، بەغدا، ١٩٨٣
- مەلا مەعروف شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٨١
- مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا، ژ گوتنێن پێشییا، مطبعة شفیق، بغداد، ١٩٨٠
- مەولود ئیبراهیم حەسەن (د)، پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی، چ١ ،چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٧ .
- محەمەدی مەلا قادر، پەندنامەی ئاوارە، (لە وتە بەنرخەکانی باوو باپیران)، چاپخانەی خەبات، ١٩٨٥ .
- نەجم خالد ئەلوەنی، پەندو قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین (لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری)، چ١، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨ .
- هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە پەندی کوردی، بەرگی یەکەم و دووەم، چ٢، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٩ .
- هەژار ، بۆ کوردستان، چاپخانەی عیتانی ، بەیروت، ١٩٦٦ .
- هەردەوێڵ کاکەیی، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی شەبەك، ئینستیتۆتی کورد، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨ .
- هەردەوێڵ کاکەیی، داب و نەریتی کوردەواری (ناوچەی گەرمیان)، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٩ .
- یاسین حەسەن گۆران، پەندی پێشینان و بەسەرهاتی کوردی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦ .

**ب_گۆڤارەکان**

- جەلیل عەباسی، پەندی پیر، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ (٦)، ٢٠٠٤ .
- ڕۆهات ئەلاکۆم، ڕەوشا ژنان د ناڤ گوتنێت پێشینانده، و / سایب محەمەد، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ (٢٣)، ٢٠٠٦
- سایب محەمەد، پەندو شیرەت، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ (٦)، ٢٠٠٤ .

- سیامەند هادی، شیکردنەوەی پەندێکی کوردی لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، گ. (ی کورد)، ژ (١١)، بەشی دووەم،  ئەیلولی ١٩٩٧ .
- شوکری فەزلی، پەندی کوردی، و/ ئازاد عبدالواحید، گ. (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ (١١٢)، کانونی یەکەمی ١٩٨٦ .
- عادل گەرمیانی (د)، ڕەنگدانەوەی دیاردەی چینایەتی لە پەندی کوردیدا، گ. / ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ (٨)، ٢٠٠٥ .
- عەلی شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، بەشی دووەم، گ. (ی کورد)، ژ (١١)، ئەیلولی ١٩٩٧ .
- هیمدادی حوسێن  (د)، پەندی پێشینانی کوردی بە شێوەزاری هەورامی، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ (٦)، ٢٠٠٤ .

**ج_لە زاری خەڵك**

_ سەعادەت تەیب، هەولێر، ٥٨ساڵ، ٢٠٠٩/٢/١٨

**بە زمانی عەرەبی  /أ_کتێبەکان**

- ابي الفضل احمد بن محمد بن ابراهيم الميداني، مجمع الامثال، تحقيق/ محمد ابو الفضل ابراهيم، ج٢، ط٢، بيروت، لبنان، ١٩٨٧
- عكاشة عبد المنان الطيبى، هداية شكر، موسوعة الامثال الشعبية، دار يوسف، بيروت، لبنان، ٢٠٠٨.
- مطيعى المرابط، امثال دمشق الشعبية، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٥.
- وليد ناصيف،  اشهر الاقوال والامثال والمصطلحات الشائعة، ط ١، دار الكتاب العربي، دمشق، القاهرة، ٢٠٠٨ .
- وليد ناصيف، طه عبدالرؤوف، الموسوعة الذهبية لامثال الدنيا، ج١، ط١ (الامثال الشعبية المصرية)، دار الكتاب العربي، دمشق – القاهرة، ٢٠٠٩ .
- ياسر خالد سلامة، موسوعة الامثال الشعبية، ط ١، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية، مصر، ٢٠٠٦ .

**ب– گۆڤارەکان**

– ابوبكر عبدالكافي، البنت في الامثال الشعبية، مجلة (التراث الشعبي)، (٥ — ٦)، السنة السابعة، ١٩٧٦ .
– شكر الصالحي، الامثال الشعبية المقارنة، (في مصر والعراق)، مجلة ( التراث الشعبي)، ع (٢ — ٣)، السنة الخامسة، ١٩٧٤.
– عامر رشيد، الامثال الشعبية الفلسطينية والعراقية، مجلة ( التراث الشعبي)، ع (٩)، السنة الثامنة، ١٩٧٧ .
– نبيهة احمد الزبيدي، الامثال الشعبية والواقع الاجتماعي، مجلة ( التراث الشعبي)، ع (٢)، السنة الثالثة، ١٩٧١ .

**ج – ئینتەرنێت**

- www.balagh.com. الامثال الشعبية
- www.islam to day net. الامثال الشعبية

– موقع مركز گلگامش للدراسات والبحوث الكردية، بتول شيراميري، الامثال الكردية باللهجة الفيلية، ٢٠٠٧/٢/٩ .

## ملخص البحث باللغة العربية

الأمثال الشعبية عطاء شفوي ونتاج ثقافة الشعوب ويكون جزءا كبيرا من ذاكرة الامة ، وعلى امتداد الاجيال يتنقل بين ثنايا الحياة العامة ، وعلى شفاه عامة الناس والطبقات المختلفة،لأن الامثال يعبر عن كل النواحي المتعلقة بالحياة ، ودورها يكمن في القيمة الثقافية والاجتماعية والتربوية والتي تشكل أطارها العام، لذلك خصصنا هذا البحث ل( شخصية المرأة في الامثال الشعبية الكردية) وتصنيف الأمثال حسب الشخصيات الواردة في الأمثال وكثرتها واتساع مساحة استعمالها والمحافظة على بقائها في أذهان الناس.

وطبيعة موضوع هذا البحث أقتضت الأعتماد على أكثر من منهج، كالمنهج التحليلي الى جانب المنهج الوصفي ، فضلا عن الأستعانة بالمنهج المقارن، من أجل مقارنة الأمثال الكردية مع الأمثال المتداولة في الأدب الشعبي العربي .

وقد قسم البحث الى فصلين يصدرهما تمهيد عام بشأن الأمثال الشعبية وأهميتها ومشاكلها وأهدافها، وتضمن الفصل الأول المعنون ب( شخصية المرأة في الامثال الشعبية الكردية) والمؤلفة من تصنيف الشخصيات كالآتي : (شخصية الأرملة) و (شخصية زوجة الأب) و (شخصية العجوز) و (الشخصيات الأخرى).

أما الفصل الثاني الموسوم ب(الاسماء والاعمال والأدوات الخاصة بالمرأة في الأمثال الشعبية الكردية) ، فيتضمن هذه المواضيع (أسماء المرأة) و (العمل الخاص بالمرأة) و (الأدوات الخاصة بالمرأة) .

وأختتمت هذه المباحث كلها بأهم الأستنتاجات التي توصل اليها البحث.

## ABSTRACT

Proverbs are a part of the national and cultural resources of any nation they are structured in the course of history and through human experiences and crisis.

This research is devoted to(sub characters of woman in Kurdish proverbs) it consists of on introduction and two chapters .

The first chapter is about sub characters and are divided according to the characters importance to (the character of widow)"(the character of step-mother) " (the character of old woman ) and(other characters)

The second chapter is about (women's deeds and tools in proverbs ) it discusses these subjects (names that are special to women) and:"(works that are special to women ) and(tools that are special to women)

At the end the most important conclusions are presented

(١) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٢ ، ل٢٦ .
یان دەوترێ (ئەوەی بەبێوەژنی ئەیکا، بەگەورەکچی بیکردایە) بڕوانە ( ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان گوستاولوبون، چاپخانەی ئە یتام، بەغدا، ١٩٣٣، ل٢٠ .
واتە بەگەورەکچیش هەندێ کار ئەنجام بدرێت ڕەچاوی ئەوە دەکرێت کە کچە، سەرباری گەورەیییەکەی لە تەمەندا، بەڵام بەبێوەژنی ناشێت، ئەم پەندە بۆ ئەوەش بەکاردێت کە هەر ئیشێك بەکات و ساتی خۆی .
(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦ . ئەم پەندە بەم شێوەیەش هاتووە( بلا ڕێ بێ، بلا دێربێ، بلا کچ بێ، بلا پیربێ) . بڕوانە شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧ ، ، ل١٠٠ . برگەی یەکەمی ئەم پەندە لەگەڵ چەمکی ( دوور بڕۆ سەلامەت وەرەوە) دەگونجێ، بۆئەوەی بیکەنە بەڵگەیەك بۆ برگەی دووەم کە کچێکی گەورەو پیریش بێ باشترە لە بێوەژن .
(٣) حەمید گەردی، گوڵێك لەگوڵستانی کوردستان، ل١٩ .
(٤) سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٧ ، لە هەندێك شوێن دەوترێ ( مەکری پیرەژنێ، کە ڕێوی دەکاتە کونێ) بڕوانە: حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، ل١٢٢ .
(٥) شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشنان، چ٤، ل١١٢ .
(٦) سید عبدالحمید حیرەت سجادی، پند پشنان، جلد دوم، ، انتشارات صلاح الدین ایوبی، تهران، ١٣٧٨، ل ٣٨٢ . گەلێ جار (کوڕی بێوەژن) یش بۆتە مایەی تەوس و پلاری لێ بدرێت و بە چاوێکی ترەوە سەیری بکرێت، بۆ نموونە (هۆش کوڕی بێوەژنێ لە کرو و لە جۆش گەنمی خاڵ میکائیلی دەبەی دەفرۆش) بڕوانە یاسین حسن گۆران، پەندی پێشینان و بەسەرهاتی کوردی ، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٩٢ .
(٧) شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، ل١١٢ .
(٨) سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٠ .
(٩) هەردەوێڵ کاکەیی، داب و نەریتی کوردەواری (ناوچەی گەرمیان)، مطبعة الحوادث، بەغداد، ١٩٨٩، ل١٣٥ .
(١٠) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پشنان، جلد اول، ل١٨٥ .
(١١) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، چ٢، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦، ل١٨٤ . یان دەڵێن (نە گای شاخ شکاو، نە ژنی تەڵاقدراو) بڕوانە: عەلی شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، بەشی دووەم، گ. کەلەپووری کورد، ژ (١١) ئەیلولی ١٩٩٧، ل٦٧ .
**(١٢) رواه ابو داود (٢١٧٨) كتاب الطلاق باب (في كراهية الطلاق) سنن ابی داود سليمان بن الاشعث السجستانی (٢٠٢_٢٧٥ هـ)، بيت الافكار الدولية، رياض،السعودية، ص٢٤٨**
(*) هەرچەندە (زیز بوون)یش لای کورد پەسند نییە و لایان وایە (ژن بە زیزبوون سووك دەبێت) . بڕوانە : حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، ل٧٦ . یا (ژنێ کە زیز بوو گێسکی ماڵێ

پێی پێدەکەنێ) بڕوانە هەمان سەرچاوە، بەڵام لەگەڵ (تەڵاقدان) بەراورد دەکرێت، زیز بوون پەسندتر دەکرێت، چونکە بواری ئاشتبوونەوەی تێدا بەدی دەکرێت .

(١٣) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی كوردستان، ل٥٤ ، چونكە كورد لای وایە ( ژن بۆ شەو و ڕۆژێك نییە) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، چاپخانەی خەبات،؟، ١٩٨٥،ل١٦٧ .

(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣ . عەرەبەكان پێچەوانەی كورد لایان وایە ( قد تبلى المليحة بالطلاق) . بڕوانە: **أبي فضل احمد بن محمد بن ابراهيم الميداني، مجمع امثال، تحقيق/ محمد أبو الفضل ابراهيم، ط٢، االجزء الثاني، بيروت لبنان ؟ ص٥٣٩** ، لەوانەیە جوانییەكەی ببێتە مایەی تەڵاقدانی.

(* *) چەند پەندێكی دیاریكراو هەیە لەبارەی تەڵاقدان وەك (**غيرة المرأة مفتاح طلاقها**) بڕوانە : **ياسر خالد سلامة، موسوعة الامثال الشعبية، ط ١، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية، مصر، ٢٠٠٦، ص١٣٧** .

(١٥) خالید جوتیار، دەشتی هەولێر، پەندو زاری شیرین، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٤٦ . بەشێوەی تریش هاتووە وەك (پیاو ئەگەر ناچار بوو، بە دۆستی دایكی دەڵێ كاكە) . بڕوانە : محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٨٩ . یا ( ژنا چارییەك مرۆۋ ژیارێ دییا خوەرا دبێژە باڤۆ) بڕوانە : قەناتی كوردۆ، كۆمەڵە تێكستی فۆلكلۆری، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل٢٣٧ . ئەم پەندە لای عەرەبەكانیش بەدی دەكرێ (**كل من أخذ امي صار عمي**) **مطيع المرابط، امثال دمشق الشعبية، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٥، ص٢١** . یا (اللي بيجوز امي اقوله ياعمي) یا (**كلمن يأخذ أمي يصير عمي**) لەسەر هەمان چەمك دەوترێ : ( ان كان لك عند الكلب حاجة قُل له ياسيدي) بڕوانە : شكر الصالحي، الامثال الشعبية المقارنة، (في مصر و العراق)، مجلة التراث الشعبي،ع (٢-٣)، السنة، ١٩٧٤ ، ص٤٥ .

(١٦) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، ل١٢٠ . یا دەوترێ ( ئەگەر دەسەڵات نەبوو، بەدۆستی دایكی دەڵێ بابە ). بڕوانە : هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە پەندی كوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل٦٧ .

(١٧) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٠٤ .

(١٨) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، ل٧١ . كوردە شەبەكەكان دەڵێن : (بابۆ ژەن بێ دینا ) . باوەژن بێ دینە . واتە هەر لە بنچینەوە ئاینی نییە، هەرچەندە بابەتەكانی ئاینیش ئەنجام بدات . بڕوانە : هەردەوێڵ كاكەیی، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی شەبەك، ئینستیۆتی كەلەپووری كورد، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥٠ .

(١٩) ئینتەرنێت، **موقع مركز گلگامش للدراسات والبحوث الكردية، بتول شيرامیری، الامثال الكردية باللهجة الفيلية**، ٢٠٠٧/٢/٩ . واتە ( بۆ هەموو خەڵك وەكو دایكەو بۆ ئێمەش وەك باوەژن) ئەمە لە سۆرانیشدا هەیە ( بۆگشتیان دایكەو بۆ من باوەژن) بڕوانە : **سيد عبدالحميد حيرت سجادى، پند پشنان، جلد اول، ل٨٠** .

(٢٠) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل١٢٩ . ئەم پەندە بەم شێوەیەش هەیە (دایك بوو بە باوەژن، باوكیش ئەبێ بە باوە پیارە) . بڕوانە : مەلا مەعروف شارەزووری، پەندی پێشینانی كورد، بەرگی یەكەم، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨١، ل٥٣ . دایك بناغەیە، ئەگەر باش نەبێت لەگەڵ منداڵەكانی، ئەوا باوكەكەش وەك ئەوی لێ دێت .

(٢١) سيد عبدالحميد حيرت سجادی، پند پشنان، جلد اول، ل٧٢ .

(٢٢) هەردەوێڵ كاكەیی، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی شەبەك، ل٤٩ . واتە ( باوەژن باوكی بمری، براژن برای بمری ) .

* بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە : د.مەولود ئیبراهیم حەسەن ، پێكهاتەی ئەفسانەی كوردی ، چ١ ، چاپخانەی ڕەنج ، سلێمانی ٢٠٠٧ ، پەراوێزی ژمارە (١٨) لا ٢٧٧.

(٢٣) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی كوردستان، ل٢٧ .

(٢٤) هەمان سەرچاوە، ل٥١ . بەم شێوەیەش دەگوترێ (بەناڵە ناڵ، بە نووكە نووك، قۆچە دەهۆڵ، خۆی كرد بەبووك) بڕوانە : شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٨٩ . ئەمەنیشانەی تەرپۆشی پیرەژنە، لێرە نەك هەر وەك بووكە، بەڵكو بۆتە بووك .

(٢٥) عومەر شێخەڵلا دەشتەكی، پەندی كوردی، ل١٣١ .

(٢٦) هەمان سەرچاوە .

(٢٧) هەمان سەرچاوە، ل١٣٢ .

(٢٨) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٧٦ . پەندێكی تری لەم شێوەگاڵتە جارییە (پیرەژنێ سەر بەئاردە، سارێ خۆم پێ ڕابواردە) بڕوانە : خالید جوتیار، دەشتی هەولێر، پەند و زاری شیرین، ل٤٥ .

(٢٩) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٣٥ .

(٣٠) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی كوردستان ، ل٥١ . یا دەوترێ ( پیرەژن ئەوەندەی نەگوت تەلاقیان دا ) بڕوانە : شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤ ، ل٨٧ .

(٣١) نەجم خالد ئەڵوەنی، پەند و قسەی نەستەقی كوردی شاری خانەقین، چ ١، چاپخانەی موكریانی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥٥ . حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٧٦ .

(٣٢) خالد جوتیار، دەشتی هەولێر، پەند و زاری شیرین، ل٣٣.

(٣٣) هەمان سەرچاوە، ل٨١ .

(٣٤) محەمەدی مەلا قادر: پەندنامەی ئاوارە، ل١٢٤.

(٣٥) حەمید گەردی: سامان و پەندی گەردی، ل ١١٠. عەرەب بەشێوازێكی توند دەڵێن (ابعد اختي عني و خذ حملها مني)، عەرەبی فەلەستینی دەڵێن: (خذ اختي عني واطلب ثمرها مني) بڕوانە: عامر رشيد: الامثال الشعبية الفلسطينية والعراقية، مجلة التراث الشعبي، ع (٩)، السنة الثامنة، ١٩٧٧،

ص١٨٧. لە کوردیدا ئەمەش دەوترێ (ژنۆکە وەرە پشتۆکە، خوشکێ تایێ، دایێ بەرایێ) بڕوانە: دێدەوان یەعقوبی: ژن ناسی لە پەندی پێشیناندا، چاپخانەی چوارچرا، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٧.

[٣٦] شێخ محەمەدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل٤٠٤. چەمکی ئەم پەندە لە شێوەزاری ئەردەلانی پێچەوانە دەبێتەوە (خۆشە ئاگر خۆشە دوو، برا خاسە نەوەك شوو) بڕوانە: د. هیمداد حوسێن: پەندی پێشینانی کوردی، گ.ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ(٦)، ٢٠٠٤، ل١٥٣. شەبەك دەڵێن: (ژەن نمە لۆ عەبای براش، مە لۆچیژ عەبای مێردەکەی) واتە ژن ناڕواتە ژێر عەبای برای، بەلاَم دەڕواتە ژێر عەبای مێردەکەی. بڕوانە: هەردەوێڵ کاکەیی: پەندی پێشینان...، ل١٤٢. مێرد پارێزەری ڕاستەقینەی ژنە نەك برا، چونکە لە ژێر بەرپرسیارێتیی برا دەردەچێت، (عەبا) ڕەمزە بۆ پاراستن. عەرەب دەڵێن (جهنم جوزي ولاجنة ابويا) ئینتەرنێت www. balagh.com الامثال الشعبية. هێشتا دۆزەخی مێرد پەسەندتر دەکات لە بەهەشتی باوك و برا، ئەو پەڕی نارەزایی دەربڕینە بەرامبەر بە باوك و برا، یا فەلەستینی دەڵێن (الجوز رحمة ولو انه ما بيجيب الا فحمة) عەرەبی عێراقیش دەڵێن: (الرجال لوچان فحمة للمرة رحمة). بڕوانە: عامر رشيد: الامثال الشعبية، ص١٨٩. کورد ئەمەش دەڵێن (شووی کافر لە برای موسڵمان خاسترە) بڕوانە: سيد عبدالحميد حيرت سجادى: پند پيشينان، جلد اول، ل٣٣٨.

* دش لە پەندی پێشینان هیچ بایەخێکی پێ نادرێ، بۆیە دەڵێن (دش دشێ، بەچی ئەچێ) بڕوانە: شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان،چ٤ ،ل٢٠٤

[٣٧] شێخ محەمەدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل٤٣١.

[٣٨] عەلی شارەزووری: پەندی پێشینانی کورد، بەشی دووەم، گۆڤاری ( کەلەپووری کورد)، ژ (١١)، ئەیلولی ١٩٩٧، ل٦٦. عەرەب دەڵێن (يعطيك راجل لا امو ولا اخواتو، السما رماتو) بڕوانە: ابوبكر عبدالكافي: البنت فى الامثال الشعبية، مجلة التراث الشعبي، ع (٥-٦)، السنة السابعة، ١٩٧٦،ص١٣٢. تەنانەت دەڵێن: (الاخ اخ مرتة، يفوت و ينجلي اختة) بڕوانە: نبيهة احمد الزبيدى: الامثال الشعبية والواقع الاجتماعي، مجلة التراث الشعبي، ع (٢)، السنة الثالثة، ١٩٧١، ص١٣. يا (الحمى غمة، واخت الجوز عقربة سمة) بڕوانە: وليد ناصيف: الموسوعة الذهبية، الامثال الدنيا،ج١، ط١، دار الكتاب العربي، دمشق – القاهرة، ٢٠٠٩ ص١٦٨. زۆر تێکەلاَوبوون و نزیکی کێشە دروست دەکات، بۆیە ئەم پەیوەندییە لە ئاکامی دەستێوەردانی دش بەم شێوەیە وەسف کراوە کە تەنانەت بە بەراورد لەگەڵ خەسوو، بەو هەموو دژایەتیەشەوە، ئینجا دش دوژمنایەتییەکی زیاتری تێدا بەدی دەکرێ.

[٣٩] هەردەوێڵ کاکەیی : پەندی پێشینان ، ل ٢١٣ .

[٤٠] هەمان سەرچاوە ل ٥٢ .

[٤١] عومەر شێخەڵلا دەشتەکی ، پەندی کوردی ، لا ٤٧ .

[٤٢] سیامەند هادی: شیکردنەوەی پەندێکی کوردی لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، گ.(کەلەپووری کورد)، ژ(١١)، ١٩٧٧، ل٧٠

(٤٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩

(٤٤) سایب محەمەد ، پەند و شیرەت، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژ(٦)، ٢٠٠٤، ل٤٨_٤٩ .

(٤٥) هۆشیاری نوری لەك: گولبژێرێك لە پەندی کوردی، چ٢، ل٥.

(٤٦) عومەر شێخەڵلا: پەندی کوردی، ل١٣٠. عەرەب دەڵێن (البنت لعمتها ولو قطعوا رقبتها) بڕوانە: ولید ناصیف: الموسوعة الذهبیة لامثال الدنیا، ص١٣٣. چونکە زۆر خەسڵەت لە پلکی وەردەگرێ، وەك چۆن کوڕ سێ بەشی دەچێتەوە سەر خاڵی هەروەها دەوترێ (البنات من صدور العمات) یاسر خالد: موسوعة الامثال الشعبیة، ص١١٨. پەندێکی تر هەیە کە ئاماژەی بە پوور کردووە و دەڵێ (پوورم لۆمەی منی کرد، بە خۆی هیشکە ڕنی کرد) بڕوانە: حەمید گەردی: سامان و پەندی گەردی، ل٧١. ئەمە بۆ کەسێك بەکاردەهێنرێ کە گلەیی ئەنجامدانی کارێك لە بەرامبەرەکەی بکات، دواتر خۆی لەویش تێپەڕێنی و خراپتر بکات.

(٤٧) محەمەدی مەلا قادر: پەندنامەی ئاوارە، ل١٨٢.

(٤٨)دێدەوان یەعقوبی: ژن ناسی لە پەندی پێشینانەدا، ل٢٤. عەرەب دەڵێن (الضرة، عیشتها مرة) ولید ناصیف: الموسوعة الذهبیة لامثال الدنیا، ص٢٣٧. یا تەنیا دەڵێن: (الضرة مرة) بڕوانە: ولید ناصیف: اشهر الاقوال والامثال والمصطلحات الشائعة، ط١، ص٩٦. یا دەڵێن (الضرة ضرة ولو كانت قعمرة جرة) بڕوانە: ولید ناصیف: اشهر الاقوال  والامثال والمصطلحات الشائعة، ص٧٣. واتە هەوێ هەرچەندە شتێکی واش نەبێت ئەوا هەر جێی ترس و فێڵ و ڕق لێ بوونەوەیە. لە زمانی عەرەبیدا پەندی زیاتر لەبارەی هەوێ هەیە بەبەراورد بە پەندی پێشینانی کوردی.

(٤٩) هەردەوێڵ کاکەیی، پەندی پێشینان ،  ل ١٤١ ، لە کەلهوری خانەقینیشدا دەڵێن (خوو ژن، ژن نیخورد)، لە سۆرانیدا (ژن ژنی نەخواردووە) یا(خۆ ژن ژنی نەخواردووە) .

* کورد دەڵێ: (لەگەر بووکێ نەبێ، لەگەر بەربووکێ نابێ) بڕوانە: خالید جوتیار: دەشتی هەولێر پەندو زاری شیرین، ل٧٩. ئەمە لە سنووری بووك و بەربووك دەرچووە، چۆتە خانەیەکی فراوانتر، واتە ئەوەی گەرما و گەرم نەبێ، دواتریش نابێت.

(٥٠) شێخ محەمەدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل١١. ئەم پەندە بەم شێوەیەش دەوترێ (هەر بلێ بەربووك لە بووك جوانترە) بڕوانە: هەمان سەرچاوە .

** بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: د. عادل گەرمیانی، ڕەنگدانەوەی چینایەتی لە پەندی کوردیدا، (٢٠٠٣)، گ.(ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژ (٨)،٢٠٠٥ ، ل١١ .

(٥١) محەمەدی مەلاقادر: پەندنامەی ئاوارە، ل١٦٥.

(٥٢) هەمان سەرچاوە، ل٢٦١.

(٥٣) شێخ محەمەدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل١٠١. بە جۆرێکی تر دەڵێن (پیاما بکە شووژن، بانگم بکە ئاغاژن)، هەمان سەرچاوە، ل١١٩. یا (گژیانم بکەن دەرزیا ژن، بەشەرتێ پێم بێژن قێخاژن). بڕوانە: سید عبدالحمید حیرت سجادی: پند پشنان، جلد دوم، ل ٤٠٩. دیارە کە وەزیفەی

(قازی) سەری هەڵداوە ئەم پەندە بەم شێوەیەی لێ هاتووە (بم نوێنن بە جلی تاژی پێم بڵـێن ژنـی قازی). بڕوانە: حەمید گەردی: گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، ل٤٠. تەنیا ئەم پەندە لە بارەی ژنی قازی بەدی دەکرێت.

(٥٤) هەمان سەرچاوە، ل١٩.

(٥٥) حەمید گەردی: گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، ل١٥. هەندێ جار (پیرێژن) لە بـری (ئاغـاژن) بەکاردێت وەك (پیرەژنێ حەوجە بووێ بە سویژنێ) بڕوانە: جگەرسۆز پێنـدرۆیی: ٢٠٠٠ پەنـد ژ جیهانێ، چـاپخانەی سـپیریز، دهـۆك، ٢٠٠٥، ل ٢٠٩. عـەرەب دەڵێن (اللي علی راسـه تـاج یحتاج) ئەنتەرنێت، www.islamtoday.com الامثال الشعبیة .

(٥٦) خالید جوتیار، دەشتی هەولێر پەندو زاری شیرین، ل٦٨ .

(٥٧) عومەر شێخەڵلا، پەندی کوردی، ل١٢٣ .

(٥٨) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل١٥٦ .

(٥٩) هەمان سەرچاوە، ل٤٠ .

(٦٠) عومەر شێخەڵلا، پەندی کوردی، ل١٣١ .

(٦١) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل١٥٣ .

(٦٢) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١١٨ .

(٦٣) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٥٠ .

(٦٤) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١١٨ .

(٦٥) ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان گوستاولوبون، ل٣٧ .

(٦٦) عومەر شێخەڵلا، پەندی کوردی، ل١٣٩ . هەنـدێ جـار لـەبری ناوهێنـانێکی دیـاریکراو دەوتـرێ (خۆ ئێمە لە ژنە دۆمەکە نین) بڕوانە : محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل١٢١ .

(٦٧) هەمان سەرچاوە، ل١٥١ .

(٦٨) عومـەر شـێخەڵلا، پەنـدی کـوردی، ل٣٢ . بـەبیرو ڕای مـن دەبوایـە ( لـە دەرێ ڕۆمـی لـەژوورێ ڕابی) بێت، تەنیا ئەگەر لە حاڵەتێکی شڵەژان ئەم تێکەڵییە دروست بووبێت ڕەوایە .

(٦٩) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٧١ .

(٧٠) ڕێبوار جەمال، پەندی پێشینان لە ناوچەی پشدەردا، ل٥٠ .

(٧١) عومەر شێخەڵلا، پەندی کوردی، ل٣٦ .

(٧٢) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل١١٨ .

(٧٣) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پشنان، جلد دوم، ل٤٥٨ .

(٧٤) هەمان سەرچاوە، ل٤٥٨ .

(٧٥) خالید جوتیار، دەشتی هەولێر پەندو زاری شیرین، ل٣١ .

(٧٦) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٤٣ . یا دەوتـرێ ( شـۆڵێن ژنـان بیـست و چـوارن، ژوا دوو دیارن، ئەویش نان و گرارن) . بڕوانە : محەمەدی مەلا قادر، پەنـد نامـەی ئـاوارە، ل١٩٠ .

واتە هەمیشە خەریکی کارکردنن، کەچی دوو ئیشیان بەرچاو و دیارن، ئەوانیش نانکردن و برنج لێنانە .

* کابان / ئەو ژنانەی پێ وەسف دەکرێت کە ئیش و کاریان پوخت و رێکوپێکە، هەر لە چێشت لێنان و رێکخستنی ناو ماڵ و وردەکاریەکانی تر. وەکو ناویش بەکارهاتووەو بەکاردێت، تەنانەت دەوترێت (ئاڤاهییا ماڵێ کەبانییە) . بڕوانە : ڕۆهات ئەلاکۆم، رەوشا ژنان دناڤ گوتنێت پێشینانده، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ٢٣، ل١٨ .

[٧٧] محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٢٥١ .

[٧٨] هەمان سەرچاوە، ل٢١٣ . یا دەوترێ (کەبانی یا مەلونە، یا مەحرومە) بڕوانە : ڕۆهات ئەلاکۆم، رەوشا ژنان دناڤ گوتنێت پێشینانده، ل٢٠ .

[٧٩] محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٤٥ .

[٨٠] ڕۆهات ئەلاکۆم، دفۆلکلۆرێ کوردی دە ، سەردەستەکیەکە ژنان، ل٥٧ .

[٨١] حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٦ . ئەمە رێك لەگەڵ چەمکی پەندی (زگی تێر ئاگای لە زگی برسی نییە) یەك دەگرێتەوە .

[٨٢] خالید جوتیار، دەشتی هەولێر پەند و زاری شیرین، ل٦٧ . لە ناوچەی پشدەر دەڵێن : (چێشتی دوو کابان سوێری دەچێژێ) . بڕوانە : ڕێبوار جەمال، پەندی پێشینان لە ناوچەی پشدەردا، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٨٢ . یان دەوترێ (دیکێ بە سێ کابان هەر بۆ سییە) بڕوانە : محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل١٨٨ . لێرەشدا واتە شیوی لەیەك کابان زیاتر بێت بۆسۆی لێ دێت، کەواتە تامی ناخۆش دەبێت و ناخورێت . هەرچەندە کورد پەندی پێچەوانەی ئەمەشی هەیە کە رووبەکی پۆزەتیڤی زۆرکابان نیشان دەدات (کابانی زۆر و قازی زۆر هاوکارن) . بڕوانە : حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، ل١٠٣ . هندییەکانیش دەڵێن : ( اذا كثر الطباخين فسد اللحم) (ئەگەر چێشت لێنەر زۆر بوون ، گۆشتەکە تێك دەچێت) ئەنتەرنێت . www.balagh.com

[٨٣] محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٢٠٦ .

[٨٤] قەناتی کوردۆ، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری، ل٤٦ .

[٨٥] خالید جوتیار، دەشتی هەولێر پەند و زاری شیرین، ل٩٢ .

[٨٦] شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٦٤ . هاوچەمکی ئەم پەندە دەوترێ : (ماڵی زۆر ژنان، ئاویان نییە لە گۆزان) . بڕوانە : حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٢٢ .

[٨٧] خالید جوتیار، دەشتی هەولێر پەند و زاری شیرین، ل٧٣ . ئەم پەندە بە شێوازی فەرمان و داخوازیش دارێژراوە (ژنەك بینە ژنانە، پێستە بکاتە هەمبانە) . بڕوانە : حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، ل٧٦ .

[٨٨] محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٣٣ .

(٨٩) هەمان سەرچاوە، ل٣٧ .

(٩٠) هەمان سەرچاوە، ل١٥ .

(٩١) هەمان سەرچاوە، ل٣٤ .

(٩٢)هەمان سەرچاوە، ل١٥ .

(٩٣)شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٢١ .

(٩٤) هەمان سەرچاوە، ل٦٤ .

(٩٥) خالید جوتیار، دەشتی هەولێر، پەندو زاری شیرین، ل٤٠ . لە هەندێك شوێن لە بڕگەی دووەمدا دەڵێن : ( لە هەردوو ماران كەرە دەفرۆشن) . بڕوانە : حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٥٠ .

(٩٦) خالید جوتیار، دەشتی هەولێر، پەند و زاری شیرین، ل٥٩ . یا دەوترێ (دیزەیەك كابان بیشكێنێ، دەنگی لێ نایێ) . بڕوانە : محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە ، ل١٣٦ . یا (كاسەیەك كەیوانوو بیشكێنێ، تەقەی نایەت) . بڕوانە سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پشنان، جلد دوم، ل٣٧١ .

(٩٧) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٦٣ .

(٩٨) هەمان سەرچاوە، ل٨٠ .

(٩٩) عومەر شێخەڵلا، پەندی كوردی، ل٣٢ . لە كرمانجی سەروو دەڵێن (ماڵخوێتی كەت ددەست ژنێ دا كەهرك بری و بەرخك هشت ل بن لڤایێ دا) . بڕوانە : مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا ژ گۆتنێن پێشیا، مطبعة شفیق ، بەغداد، ١٩٨٠، ل٢٧٠ . یا دەوترێ : (ژنیان كردە كوێخا، ساڵێ حەفت جار بزنی بڕیەوە) بڕوانە : هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە پەندی كوردی، ل٤٥ . یا دەڵێن (ئەو ماڵ خراب بیت، ئەوا ژن تێدا ببیت ماڵخۆی) . بڕوانە : مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا ژ گۆتنێن پێشینا ل١١ .

(١٠٠) هەمان سەرچاوە .

(١٠١) عەلی شارەزووری، پەندی پێشینانی كورد، گ./كەلەپووری كورد، ژ(١١)، ل٦٨ .

* بۆیە وتوویانە ( كابانێ ڕوونی نیسانێ، دا هەرگرین لۆ جستانێ) . بڕوانە : عومەر شێخەڵلا، پەندی كوردی، ل١٥٣ .

(١٠٢) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٦٤ .

(١٠٣) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٢١٣ .

(١٠٤) محەمەدی مەلا قادر، پەندنامەی ئاوارە، ل٥٥ .

(١٠٥) هەمان سەرچاوە،

(١٠٦) هەمان سەرچاوە، ل١٢٩ .

(١٠٧)هەمان سەرچاوە، ل١٧٢ .

(١٠٨) کەریم شارەزا، پەندی بەراوردکاری (لە نێوان ئینگلیزی و عارەبی و کوردی)، چاپخانەی سمیرامیس، بەغدا، ١٩٨٣، ل١٣٩ .

(١٠٩) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٩٣ . هەژار موکریانی لە دیوانی (بۆ کوردستان) ل١٨٠ ئەم پەندەی وا داڕشتووە:

| | |
|---|---|
| کوڕ بە دایکی گوت: بێجگە لە باوە | چەند شووی ترت بوون، وەرامی داوە |
| نۆ مێرد لەو هۆزی نۆیان لەم هۆزی | دوو نۆش لە هۆزی نەورۆزە قۆزی |
| نۆ هەر لە بەر تاو خۆیان ئەدۆزی | نۆشیان نیوەی ساڵ دەژیان بێ ڕۆزی |
| شەش و شەشان و شەشێکی تریش | ووچەی ئامان و ڕەشێکی تریش |
| بە خوا ڕۆڵەگیان دەس بە هەویرم | وردە مێردەکان کەم دێنە بیرم |

بە سەرهاتی ئەم پەندە لە پەراوێزی ژمارە (١٣٢)ی هەمان لاپەڕە بەدی دەکرێت . ئەم پەندە دوورو درێژە دەڵێن (نۆ لەم هۆزو نۆ لەو هۆز، نۆ لە تایفەی برایمە قۆز، ڕەحمەتیەکەی باوکی تۆش، دەسم ها لە هەویرا، هەر ئەمەنەم لەبیرا) . بڕوانە: سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پشنان، جلد دوم، ل٥٠٣ .

(١١٠) عومەر شێخەڵلا، پەندی کوردی، ل١١٩ .

(١١١) جەلیل عەباسی، پەندی پیر، گ. (ئاسۆی فۆلکلۆر،) ژ(٦)، ٢٠٠٤، ل٥٣ . پەندێکی شێوەزاری هەورامییە واتە ( دایکی حەیدەر خۆش خۆش دەچێتە سێبەری دار بەڕوو) چیرۆك و بەسەرهاتی ئەم پەندە لە نێو باسەکەی نووسەردا ئاماژەی پێکراوە .

(١١٢) عەلی شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، گ. (کەلەپووری کورد) ژ(١١)، ل٦٨ .

(١١٣)عومەر شێخەڵلا، پەندی کوردی، گ.(ڕۆشنبیری نوێ)، ژ(١١٠)، ١٩٨٦، ل٢١١ .

(١١٤)حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٤٩ .

(١١٥) ڕۆهات ئەلاکۆم، ، ڕەوشا ژنان دناڤ گۆتنێت پێشیناندا، گ.( ئاسۆی فۆلکلۆر) ژ (٢٣)، ٢٠٠٦، ل٢٠.

(١١٦) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان، ل٧٩ .

(١١٧) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٠ .

(١١٨)حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی کوردستان ، ل٤٢ .

* جهاز یا جیازی، واتە کەلوپەل، ئەو کەرەستەو کەلوپەلانەی کە جل و بەرگ و پێویستییە تایبەتییەکانی بووك دەگرێتەوە و لەگەڵیدا دەینێرن بۆ ماڵی زاوا . جیازی زۆر نیشانەی خانەدانی و گەورەیی بنەماڵەی بووك بووە . تارادەیەك بەردەوامی هەیە و تاکو ئێستاش ئەم دیاردەیە ماوە زۆرجار دەبێتە مایەی شانازی کردن بە جیهاز .

(١١٩) دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی لە پەندی پێشیناندا، ل٢٥ . عەرەبەکان دەڵێن : (اللي ما بطلع مع العروس ما يلحقها) . بڕوانە: یاسر خالد سلامە، موسوعە الامپال الشعبیە، ص٢٠٥ .

(١٢٠) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی ، ل٩٦ .

[121] هەمان سەرچاوە، ل٢٣٣ .

** (کل) تایبەت کراوە بە ژن، هەرچەندە هەندێك لە پیاوانیش بەکاریان هێناوە، بۆیە دەڵێن : (سورمە بۆ ئافرەتە، نەك بۆ پیاو) . بڕوانە : حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٥٩ .

[122] دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی لە پەندی پێشیناندا، ل٨ . نەینۆك و کلدان بەبەراورد بە زێڕ و کەرەستەکانی تر شتێکی کەم بایەخە، هەرچەندە ئەمە بۆ ئەو حاڵەتە دەگەڕێتەوە کە ژنان زیاتر پارێزگاری لە دیاری دەکەن، هەرچەندە کەمیش بێت، بەلاَم لەم پەندەدا بۆتە نیشانەی زوو باوەڕکردن و هەڵخەڵەتاندن .

[123] شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٦٠ بوونی کل واتە دڵ تەڕی و پاراستنی خۆ جوانکردن بەهۆی کل .

[124] محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ل١٨٥ . هەروەها دەوترێ (دەم و چاو لووسە، ناو ماڵ پیسە) . بڕوانە : نەجم خالد ئەلۆەنی، پەندو قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین، ل٧٥ .

[125] سید عبد الحمید حیرت سجادی، پند پشنان، جلد دوم، ل٣٣٧ .

[126] هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە پەندی کوردی، چ٢، ل٢٥ . (گۆبەرۆك) جۆری هەیەو زێڕێکی زۆرە بە (ئێلەگ)ەوە دەدروێت کە بەشێکە لە جلی کوردی .

[127] حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٦٠ . پێچەوانەی ئەم پەندەش بەدی دەکرێت (کراسی ڕەش لەبۆ تۆ هەبێ، هەنگوچك سپی بۆ من زۆرە) بڕوانە : هەمان سەرچاوە، ل١٩١ . لە چەمکی ئەم پەندەش تەوس و پلار بۆ بەرامبەرو شانازیش بۆ خودی خۆی دەردەکەوێت.

* دەرەلنگ / لە چەشنی بێجامەیەکی بەرینە کە خوارەکەی بەلاستیك گرژ دەکراو ئێستاش هەروایە . جوانییەکی تایبەتی دەبەخشێت، زۆرجار گرێی لاستیکەکە دەبێتەوە یا دەپسێت.

[128] شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٤٣٣ .

** ژنی گەڕۆك زۆر بەسووکی تەماشاکراوە، وەك (ژنی گەڕۆك لە سەی ناترسێ) . بڕوانە : خالید جوتیار، دەشتی هەولێر پەندو زاری شیرین، ل٦٣ . یا ( ژنی گەڕۆك، سەگی بەڕەلاّ) . بڕوانە : حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی ، ل١٤٩ .

[129] لەزاری (سەعادەت تەیب) هەولێر، تەمەن (٥٨) ساڵ، ٢٠٠٩/٣/١٨ وەرگیراوە .

[130] هەمان سەرچاوە .

[131] حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٦٢ .

[132] هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە پەندی کوردی، چ٢، ل٢٤ .

# کلاسیزم لە چیرۆکی کوردی

د. سەلیم ڕەشید ساڵح

زانکۆی سەلاحەددین/ کۆلیژی پەروەردەی زانستە مرۆڤایەتییەکان

## پێشەکی

ئەم تۆژینەوەیە هەوڵێکە لە پێناو دیاریکردنی قۆناغێکی نادیاری چیرۆکی کوردی کە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە بووە بە بەشێك لە مێژووی کۆمەلآیەتی و سیاسی گەلەکەمان، بابەتەکەم بە سەر چەند تەوەرێکدا دابەش بووە هەر لە ڕوونکردنەوەی چەمکەکانی کلاسیزم و گونجاندنی لەگەڵ سیمای سەردەمێکی کۆنی چیرۆك و لە قالّبدانی هەندێ لەو چیرۆکە سەرەتاییانە لەو چوارچێوەیەدا و، دواتر دیاریکردنی قۆناغەکانی چیرۆك بە شێوەیەکی کورت بۆ لەیەك جیاکردنەوەی قۆناغی کلاسیزم لە قۆناغەکانی تری چیرۆك ، لە تەوەرێکی تری باسەکەدا ڕوونکردنەوەی ئەو شێوازە تایبەتییانەی بەشێك لەو چیرۆکانەیە بۆ ناسینەوەیان کە سەر بە چ قۆناغێکن، تەوەرەکەی تر دیاریکردنی ئەو لایەنە هونەرییە سادەیەیە کە وەك سیمایەك چیرۆکی کوردی دەستنیشان دەکات و لە دواییشدا بە ڕاڤەکردنی چیرۆکێك سەلماندنی ئەو بارەی چیرۆکە . بەو هیوایەم توانیبێتم بەو باسە خزمەتێکی چیرۆکی کوردیم کردبێت وەك مێژوویێك بۆ قۆناغەکانی چیرۆك لە ئەدەبی کوردیدا .

**سەرەتايەك**

لە ئەدەبیاتی جیهانیدا بە گشتی بۆ سەرجەم رەگەزەکان و هونەرەکانی ئەدەب، پێوستە بگەڕێینەوە بۆ ئەو کانییە فراوانەی زانست و مەعریفە کە لەلای فەیلەسووفە یۆنانییەکان هەبووەو سەری هەڵداوە و بلاّو بۆتەوە بۆ نەتەوەکانی تر بووە بە رێچکە و رێبازێك[1]، بۆ هەموو ئەدەبی جیهانی چ ئەونەتەوانەی دراوسێیان بوون یاخود نەتەوەکانی تر بەهۆی بارودۆخی جیاجیای کاریگەری ئەدەبی، وەك ئاوارەیی و شەڕ و داگیرکاری یان تێکەڵبوونی بازرگانی وفراوانبوونی باری رۆشنبیری لە پێناو سوود وەرگرتن لە هونەرە تازەکان لە رێگەی چاولێکەری ولاساییکردنەوە، گریکەکان بە سەرچاوەیەکی سەرەکی و فراوان دەژمێردرێن لە بواری زانست و ئەدەبیاتدا کە تا ئێستاش سوودیان لێ وەردەگیرێت و کاریان لە سەر دەکرێت، دوا بەدوای ئەوانیش ئەوروپاییەکان دێن کە وەك پردێك بۆ پەڕینەوەی ئەو زانست و مەعریفانە دادەنرێن بۆ نێو ئەدەبیاتی میللەتانی رۆژهەلاّت، ئەگەر بڕوانینە لایەنە هونەرییەکان و زانستەکانی ئەدەب لەڕووی گەشەکردنی مێژووییەوە، بەلاّم ئەگەر هاتو بە پێی پۆلینکردنی سادەیی و ئالۆزی بێت بە تایبەت بواری چیرۆك و حیکایەت و هەروەها بەپێی قۆناغەکانی گەشەکردنی قۆناغەکانی مێژوو ئەوە شێوازی جیاجیای بەخۆوە بینیوە، کە هەر لە سەرەتادا ئەو جۆرە چیرۆك و حیکایەتانە زۆر نزیك بوون لە گێڕانەوەیەکی ئاسایی و گفتوگۆی زارەکی و ناوچەیی کەسەکە[2]، کە دوور بووە لە چنین و هونەربازی و رێکخستن لە دواندا یان لە گێڕانەوەدا، بۆ ئەو مەبەستەش ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دیاریکردنی شێوازەکە ئەوە دەبێت ئاوڕێك لە چەمك و پێناسە جیاجیاکانی کلاسیزم بدەینەوە، کە کۆمەڵێك پێناسەو شێوەی جیاجیا لە خۆ دەگرێت، هەندێك دەڵێن کلاسیزم بریتییە لەو بەرهەمانەی کە لە لاساییکردنەوەی نووسەرە ناودارەکانی گریکەوە هاتوون، وەك ( ئەسخیلۆس و یۆربیدس و ئەرستۆ فانس و سۆفۆکلیس )، کە خاوەنی هەندێ رێبازو یاسای تایبەتی بوون لە داهێنانی شیعردا ئنجا شانۆو بابەتەکانی تر[3] . هەندێکی تریش بەو بەرهەم و شاکارانەی سەردەمی رێنیسانسیان دەگوت کە هەر لە سەردەمی

یۆنانەکان و ڕۆمانەکان هاتبوونە نێو ئەدەبیاتی ئەوروپی، کلاسیزم و قۆناغـەکانی کلاسیزم، هەندێ لە شارەزایانی ئەدەبیش بەو بەرهەمانەیان دەگوت کلاسیزم، کە لـە سـەدەی هـەژدە وەك دەسـتوورو یاسـایەك بووبـوون بـە بنـەماو لـە سـەری دەڕۆیشتن، ئەگەر چی ئەو هەموو پێناسەیە بۆ کلاسـیزم لـە سـەردەمی جیاجیـادا هاتبوونە کایە، بەڵام لە خاڵێکدا لە یـەك نزیـك دەبوونـەوە ئـەویش ئـەو بەرهـەم و شـاکارە بەپێزانـە دەگرێتـەوە کـە زیـاتر پەیوەسـتە بـە باسـکردنی کارەسـات و بابەتەکانی کەسایەتییە بـەرز و بـەهێزەکان، ئەمـەش چ لـە چوارچـێوەی هـۆنراوە بووبێـت یـان لــە گێڕانــەوەی ڕووداوێکــی حیکایــەتخوانی دوورو درێــژدا، وەك حیکایــەتێك یـان ڕۆمانێـك کـە ئـەویش بـە زۆری هــەر بــە شـێوازی هـۆنراوە دەگێڕدرایەوە، تا وای لێهات کلاسیزم بۆ ئـەو جـۆرە بەرهەمانـە بـە کـار بێـت کـە پێویستی بە بەهرەو توانایەکی باش بێت بۆ داڕشتن، لە دواییشدا بوو بە ڕێگەیـەك بۆ لاساییکردنەوەو چاولێکردن، لـە بـەر ئـەوە ئـەو چـەمکە، (کلاسـیزم)، بـوو بـە چەمکێك بۆ ئەو بەرهەمە کۆنانەی لە ئاسـتێکی بـەرزو دانسقەدا دەخرانـە ڕوو کـە کەم کەس دەیتوانی دەستی بەسەردا بشکێت و کـاری تێـدا بکـات [٤]، لەبەرئـە وە پێویستی بە تواناو شارەزاییەکی بەرزی زمانەوانی هـەبوو وە پـشتی بـە هونـەری ڕەوانبێـژی دەبەسـتا لـە داڕشـتنی دەقـدا، بـۆ یەکـەم بنـەماش بـۆ ئـەو چـەمك و پێناسەیە ئەوەیە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ تیۆرەکانی ئـەفلاتۆن و ئەرسـتۆ کـە ئـەوان دامەزرێنـەرو داهێنــەری ئــەو جــۆرە دەســتوورو یاســایە بــوون و دوای ئــەوانیش شاعیران و نووسەرانی گریـك وەك ڕێبازیـك لەسـەری بـەردەوام بـوون، ئەگـەر چـی تیڕوانینی ئەفلاتون و ئەرستۆ لە بارەی جۆرەکانی هونـەر جیاوازییـان هـەبووە لـە ڕووی بـیرەوە [٥]، ئـەفلاتون ئایدیالیـستانە سـەیری بابەتـەکانی هونـەری کـردووە، ئەرسـتۆش بـە پێـچەوانەی ئـەو مادیانـە یـان ڕیالیـستانە بابەتـەکانی هونـەری لێکداوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو فەیلەسووف ڕێگایەکیان بۆ ئەدەب و هونەر دامەزراندووە کە بۆ نەوەکانی دوای خۆشیان بووە بە بنەما و ڕێباز، لەگەڵ هـاتنی چـاخی ڕێنیـسانس و گۆڕانکارییـەکانی بـوارە زانـستییەکان و دەرکـەوتنی ڕێبـازی تازەو دەرکەوتنی ئەدەبی نەتەوەیی کە پێشتر زمانی لاتینی زمانی ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی ئەوروپا بووەو، بەهۆی گەڕانـەوە بـۆ زمـانی نەتـەوەیی سـەربەخۆ لـە

زانستی ئەدەبیدا[٦]، لە پاڵ ئەوەشدا زمانی نەتەوە بوو بە زمانی بۆنـە و یادەکـان لە ناو شوێنە ئاینی و کەنیسەکاندا [٧]. دوای ئەوەی نووسەرانی ئەوروپا بیریان لـە بەرهەم و داهێنانی تر کردەوە کە پەیوەندی بە چەمکە مرۆڤایەتییەکانەوە هـەبوو قۆناغێکی تر سەری هەڵدا، بەهۆی ئەو زمانە جیاجیایە کەوتنە دەربڕینـی شـێوازە تایبەتییەکانیان بۆ کارتێکردنە سەر خوێنەری نەتەوە، ڕەخنـە گـران و لێکۆڵـەران هەستیان بە هاتنە پێشەوەی جۆرە ئەدەبێکی تر کرد بە هۆی بەکارهێنانی زمـانی نەتەوەکان، کە ئەدەبی ڕەسمی و ئەدەبی کەنیسەی لە یەك جیـا کـردەوە کـە بـە زمـانی لاتینـی دەنووسـران وەك پاشماوەیـەکی ئـەدەبی جیهـانی کـۆن (گریـك و ڕۆمان) سەیر دەکرا، ناچار بوون بۆ ئـەو جیاکردنەوەیـە لـە شـێوازەکانی ئـەدەبی نەتـەوەیی و ئـەدەبی کـۆن زاراوەیـەك بدۆزنـەوە ئـەو زاراوەیـەش بـە (کلاسـیزم ) ناسێندرا، دواتـریش ئـەو ئەدەبـە کۆنـە وەك بنـچینەیەکی مـەعریفی لـە پۆلـەکانی خوێندن دەخوێندرا، ئەمەش وای کرد کە ئەو زاراوەیـە وەك نـاو و پێناسـەیەك بـۆ ئـەو جـۆرە ئەدەبـە جـێگیر بێـت و لـە ئـەدەبی سـەردەمە جیاجیاکـانی دواتـریش لاسایی بکرێتەوە، لە بەر ئـەوە ئـەو ئـەدەب وهونەرانـەی خـاوەنی تایبەتمەنـدی و ئاسـتێکی بـەرز بـوون بـەردەوام خـۆی پاراسـت لـە ڕێگـەی هەنـدێك سـیفەتی چەسـپاوەوە تـا وای لێهـات ببێتـە سەرچـاوەیەك بـۆ لاسـاییکردنەوەی ئـەدەبی نەوەکانی بە دوای یەکدا هاتوو . لە سەدەی حەڤدە لە فەرەنـسا قوتابخانەیـەکی نوێتر سەری هەڵدا، بەڵام ئەویش دەگەڕایەوە بۆ بنـەماکانی ئـەو ئەدەبـەی کـە لـە لای ( گریك و ڕۆمان ) جێمابوون و ئەدەبی ناوچەییان ڕەت کردەوە، بۆیە پێیان دەگوترا کلاسیکییەکان، لە دوای دەرکەوتنی کلاسیزمی فەرەنسی ئەو زاراوەیە بۆ دوو لایەن بە کار دەهات تایبەت و گشت ، لە باری یەکـەم بـۆ ئـەو ئەدەبانـەی لـە سەر ڕێبازی ئەدەبی فەرەنسی دەڕۆیشتن و لە بـاری دووەمـیش بـۆ هەنـدێ کـاری ئەدەبی وەك شانۆ و ڕۆمـان و جـۆرە شـیعرێك کـە هونـەرێکی تێـدا بێـت و ببێتـە کەرەستەیەکی وشیارکردنەوە و ڕۆشنبیرکردن [٨]، بەم شێوەیە لە ئەدەبی کۆنـدا، (کلاسیك )، وەکو جۆرە شـێوازێك لـە هـەر یـەك لـە ڕەگـەزە ئەدەبییەکانـدا بـووە بنەما و دەسـتوور لـە لایـەك و لـە لایـەکی تـریش وەك سـیفەتێکی جیاکـەرەوە و دابڕان لە یەکتر، تا وای لێهات لە دواتـردا ئـەدەبی سـەنعەت بـەم پێوانەیـە سـەیر

بکرێت بە پێی تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی دەرکەوێت و بناسرێتەوە، هە رچەندە ئەو ئەدەبە وەك پاشماوەیەکی ئەو ئەدەبەی تایبەت بوو بە چینی سەرەوەو خاوەن دەسەڵات دەنووسرا ، لە بەر ئەوە دەبوایە وشە و زاراوەی هەڵبـژێردراو لە ئاستی ئەو چینە دابوایەو جێگەی ڕەزامەندی و شایستەی ئاستی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەوان بوایە، بۆیە ئەو جۆرە ئەدەبە دەبوایە سەنعەتکارییەکی بەرزی تێدا بەکاربهاتبایە، لەو سەردەمەدا کە چینی دەرەبەگ لە ئەوروپا خاوەن شکۆ و دەسەڵاتدار بوون، ئەدەبەکەش زیاتر لە خزمەتی ئەواندا بووە، ئەگەر چی هەندێ کات دەسەڵاتی پاشایەتی تووشی دارمان و بێهێزی دەبوو، بەهۆی دەرکەوتنی هێزی نوێخوازی بورژوازییەوە بەڵام دووبارە گەڕانەوەیان بۆ سەر دەسەڵات، وەك لە وڵاتی بەریتانیادا لە ساڵی ١٦٤٠ رووی دا هەروەها لە ١٦٦٠ جارێکی تر رژێمی پاشایەتی بە زەبری چەك گەڕایەوە سەر دەسەڵات و ئەدەبی نوێ فەرامۆش کراو گەڕانەوە سەر ئەدەبە کۆنەکەی کلاسیك، لە فەرەنسا هاوسەنگییەك لە نێوان بیری دەرەبەگایەتی و بورژوا دروست بووبوو، ئەدەب و ڕۆشنبیریش لەو وڵاتە زیاتر لە بارێکدا جێگیر بووبوو، کۆمەڵێك نووسەر هەوڵی پێشکەوتنی ئەدەبیان دەدا و جارێکی تر گەڕانەوە سەر پرەنسیپ و بنەماکانی ئەدەبی گریکی کۆن، ئەو کۆمەڵەیە، ( پلیاد )، پێیان وابوو کەوا ئەو بنەمایانەی لە ئەدەبی گریکی و ڕۆمانیدا هەبووە ڕەسەنن و پێویستی بە توانایەکی بەرزی داهێنەرانە هەیە [٩] پێوەر لای ئەوان گەڕانەوە بوو بۆ ئەو دەستووورو بنەمایانە، ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە کە سەردەمی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپا زیاتر درێژەی کێشاوە، لە سێبەری دەسەڵاتی کەنیسەو پیاوە ئاینییەکان و چینی دەرەبەگ، کە بە چینی بەرزی کۆمەڵ دەژمێردران و خۆیان بە خاوەنی ئەو ئەدەبە دەزانی و ئەو ئاستە ڕۆشنبیریەیان بە شایستەی خۆیان دەزانی، لەبەر ئەوە ڕێبازی کلاسیزم لەگەڵ درێژە کێشانی سیستەمی دەرەبەگایەتی درێژەی کێشاو بیرێکی جیا لە ناو ئەو ئەدەبە ڕەنگی دایەوەو لەگەڵ ڕوخسارێکی پڕ لە ستاتیکاو بە هێزی هونەری و ڕەوانبێژی .

**پێناسەیەکی کلاسیزمی کوردی**

سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیری فەرەنسی ( فۆلتێر )، لە نامە فەلسەفییەکانیدا کە لە ساڵی ١٧٧٣ نووسیویەتی، دەڵێ: من لە ڕێگای سوود وەرگرتن لە سەرچاوە بەریتانییەکان هێرشم کردە سەر سیستەمی فەرەنسی و بێدادییەکانی فەرەنسا و خاڵە لاوازەکانی، چونکە بەریتانیا ئازادیخوازی و سیاسەت و سەربەستی ئایینی و بایەخدان بە زانست و فەلسەفەی تێدا کۆ ببووەوە، ئەوانە سەرنجی منیان ڕاکێشا بۆ ئەوەی هەوڵی گۆڕانکاری بدەم [١٠]، ئەوە شتێك ئاشکرا دەکات کە ئەویش کاریگەری بەریتانییەکانە وەك هۆکارێکی سەرەکی بۆ ئەوەی فەرەنسییەکان بتوانن لە ڕێگەی لاساییکردنەوەی ئەو پێشکەوتنەو ئازادییە لە بارودۆخ و ئاستی ئەدەب و زانستی فەرەنسا بکۆڵنەوە هەر چەندە فەرەنسییەکان لە سەدەی حەڤدە بەدواوە بوونە سەرچاوەیەك و کانگەیەکی ڕۆشنبیری بەر فراوان و، سوودیان بە هەموو جیهان بەخشی لە ڕووی مەعریفەو فەلسەفەوە . بەڵام کاریگەری بەریتانییەکان بە ئەدەبەکەیانەوە دیار بوو، هەر چەندە فەرەنسییەکان پێشتر سوودیان لەو دەستوورو بنەمایانەی کلاسیزمی ئیتالی وەرگرتبوو، چونکە ئیتالییەکان بەر لەوان ئەو دەستوورو ڕێسایانەیان چەسپاندبوو، بە سود وەرگرتن لە هونەرەکانی ئەرستۆ و هۆراس و بەهۆی وەرگێڕانەوە بۆ سەر زمانی لاتینی و ئیتالی، لەلایەکی تر لە ئەڵمانیا گۆڕانکارییەکی گەورە لە سەدەی شازدە سەری هەڵدابوو تائەوەی لە سەدەی حەڤدە توانی شان لە شانی ئەدەبی کلاسیکی فەرەنسی و ئیتالی بدات، لە ئینگلتەرەش لە سەدەی حەڤدە بە دواوە ئەو شێوازە ئەدەبییەی (کلاسیزم) سەری هەڵدا، بە شێوەیەکی گشتی دەبینین کلاسیزم لە ئەوروپا چەندین سەدە درێژەی کێشاوە، چینە باڵا دەستەکان کلاسیزمیان وەك کەرەستەیەك بۆ مانەوەو بەردەوامبوونی یاسا باوەکان بەکار هێناوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، ئەگەر سەیرێکی مێژووی ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتیش بکەین بە پێی ئەو دەق وتێکستانەی کە وردە وردە هاتنە دەرکەوتن، ئەوە دەردەکەوێت کە ئەدەبی کوردیش بەشێکە لەو ئەدەبیاتە کە لە چەندین دەروازەوە ئەو زانست و مەعریفەیەی تیادا هاتوونەتە پەیدابوون، ڕێبازە ئەدەبییەکانیش بەشێکی ئەو زانستانەن لەو ڕەوتەدا، لە پێشدا باسمان لەوە کرد کە چۆن کلاسیزم لە وڵاتانی

ئەوروپا مامەڵەی لەگەڵ کراوە بەپێی شوێنە جیاجیاکان، هەرچەندە بە دورو درێژی نەچووینەتە ناو باسەکە چونکە پێشتر لێکۆڵینەوەی زۆری لە بارەوە کراوە، د. فەرهاد پیربال باس لەوە دەکات کە سەرجەم ڕێبازەکانی ئەدەب لە داهێنانی ئەوروپییەکان بوون، بە تایبەت گریك و ڕۆمان و دوایش میللەتانی ئینگلیز و فەرەنسا و ئەڵمانەکان کە بنەما و ڕێسای تابەتییان بۆ هەر یەك لەو ڕێبازانە دیاری کردووە، خەسڵەت و سیفەتی تایبەتییان بۆ نیشان کردوون وەك دەستوور و ڕێسا . میللەتی کورد لە مێژوودا تێکەڵاوییەکی دوورو درێژی لەگەڵ میللەتانی دراوسێدا وەك تورك و عەرەب و فارس هەبووە بە هەر بارودۆخێك بوو‌بێت، ئەوەش دیارە کاریگەری خۆی هەبووە وەك دەروازەیەك بۆ پەڕینەوەی بەشێکی زۆری ئەو ئەدەب و زانستانە بە جۆرەها ڕێگەو هۆ، جگە لە ئەدەبی ڕەسەنی فۆلکلۆریمان نەبێت کە پانتاییەکی زۆری ئەدەبەکەمانی داگیر کردووە وەك موڵك و سامانێکی نەتەوەیی، بەڵام ئەوەی مەبەستە ئەو ڕێبازو زانستانەیە کە لە ئەدەبی جیهانیدا لە نەتەوەیەکەوە پەڕیونەتەوە لای نەتەوەیەکی تر و ئێمەی کوردیش بەشێکمان بەر کەوتووە، عەرەب هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەر لە نەتەوەکانی تری ڕۆژهەڵات هەوڵی ئەوەیان داوە سوود لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا وەربگرن، بە تایبەت یاساو ڕێبازە دیارەکانی ئەدەبیاتی گریك و کلتووری خۆیان پێ بەرگ کردووەوئەو پۆلینکردنەیان هێناوەتە نێو ئەدەبەکەیان، کلاسیزمی کوردی زیاتر پەیوەندی بە شێوازی تێکستە کۆنەکانەوە هەیە لە ڕووی ناوەرۆك و ڕوخسارەوە کە لە دارشتندا لە سەر ڕۆشنایی ئەو دەستوورانەی لای ئەدەبیاتی نەتەوە موسڵمانەکان پەیڕەو کراوە، ئەگەر چی لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەو شێوازە ئەدەبییە لایەنی هۆنراوە دەگرێتەوە چونکە یاساکانی کێش لە هۆنراوەدا دەبینرێت، بەڵام دەتوانین چیرۆك و پەخشانیش بە شێوازەکانیانەوە لە ڕووی بابەتەوە لەو چوارچێوەیە دەرنەکەین، دیارە ئەگەر بەو شێوازە هۆنراوانە بگوترێ کلاسیزم کە سەروا و ئاوازیان بە قەدەر ژمارەی برگەکانیان هاوکێش بکرێن، ئەوە چیرۆکیش شێوازەکانی سەرەتایی جیای دەکاتەوە لە شێوازەکانی دواتری لە ڕووی بەکارهێنانی زمانەوە، چونکە هەر زمانە دەستنیشانی ئەو دابەشکردن وپۆلینکردنانە دەکات، لە ئەدەبی کوردیدا بۆ

چـیرۆك دەبـێ بگەڕێینـەوە بـۆ هـەردوو لایـەنی ( ڕوخـسار و نـاوەڕۆك )، کـە بەشێوەیەکی سادەو ساکار لە نووسینەکانی سەرەتادا مامەڵەی لەگەڵدا کراوە . هـەر چیرۆکیـشە داکـشاوەتە نـاو هـۆنراوەو داسـتان و شـانۆکانی بـەرایی، هـیچ ڕەگەزێکی ئەدەبی نەیتوانیوە لە چیرۆك دوور بکەوێتەوە، لـە ناوەڕۆکدا بەشـێکی چـیرۆکەو بـە شـێوازی جیاجیـا نـاوەڕۆکێکی لـە خـۆ گرتـووە، بـەڵام ئەگـەر وەك هونەری چیرۆك سەیری بکەین، ئەوەلە ئەدەبی کوردیدا شـێوازو فـۆرمی تایبـەتی خۆی هەبووە، لە سەرەتادا بە شێوازێك و دواتریش گۆڕانکـاری لـە شـێوازەکە بـە پێی سەردەمەکە ڕووی داوە، کە چیرۆك تێیدا تێپەڕ بـووە، لەگـەڵ ڕێبازەکانـدا و لە بەکارهێنانی زمانی جیاواز لە ڕووی

داهێنان و هونەرەوە . لەبەر ئەوە شێوازەکانی چیرۆکی سەرەتایی کوردی زۆر جیـاواز بـووە لـەو شـێوازە باوانـەی ئـەمڕۆ، لـە ڕوویـەکی تـرەوە کاریگـەری گواستنەوەی ڕێبازەکانی ئەدەب چ لە ڕێگەی ئەدەبی دراوسـێوە بووبێـت یـان بـە هۆی ئەدەبی جیهانییەوە بووبێت، ڕۆڵی خۆی هەبووە لـە وەرگرتنـی ڕێبازەکانـدا، بە تایبەتیش کلاسیزم کە درێژترین تەمەنی هەبووە لە هەموو ئەدەبیاتی جیهانـدا . لە کۆمەڵگەی کوردیماندا سەرەتای خوێندن لـە حـوجرەو خانەقاکانـدا بـووە بـە زمـانی بێگانـەی وەك عـەرەبی و فارسـی و بابەتـە ئایینییـەکان دەخوێنـدرا یاخود ئەو کاریگەرییـەی لـە نێـو زمانـەکانی بێگانـە کـە شـیعر و ئـەدەبیاتی پـێ دەنووسرا، لە بارودۆخی سیاسیشدا ئەوە کوردسـتان دواکەوتـەی ئـەو بارودۆخـە سیاسییانە بووە کە لە ناوچەکەدا دەسەڵاتدار بوون، هەر لە بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام تا دەگاتە سەردەمی دەسـەڵاتی عوسمـانی و کۆتـایی هـاتنی و لـە پاشـانا دەرکەوتنی دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و وڵاتەکانی تری بێگانە لە ناوچەکە بە کوردستانیشەوە، بێ گومان ئەو بارودۆخەش کاریگـەری خـۆی هـەبووە لەسـەر گواستنەوەی زانست و هونەرەکانی ئەدەب و ڕێبازەکانی، لە پێنـاو پـەرەسـەندنی ئەدەبی نەتەوەیی، لە ئەدەبی ئێمەدا کلاسیزم زۆرتر لـە بـواری شـیعردا دەبینـرێ هەر لە چوارینەکانی بابە تاهیری هەمـەدانی (سـەدەی ١١ ی ز. )، و هۆنراوەکـانی مەلا پەرێشان و فەقێ تەیران و عەلی حەریری و مەلای جەزیری و ئەحمەدی خانی، کە تێکەڵە بە شارسـتانیەتی ئیـسلام لـە ناوەرۆکـدا، لـە ڕوخـساریش لەسـەر تاکـە

بەیت و چوارین و مولەمەع و پێنج خشتەکی و تەرکیب بەند و موستەزاد و غـەزەل و قەسیدەی بە کێشی عـەرووزی ڕۆژهـەڵاتی وەسـتاوە هـاو تـەریب و لـە یەکـچوو لەگـەڵ ئـەدەبیاتی نەتـەوەکانی ناوچـەکە، ڕێبـازی کلاسـیزم تـاوەکو سـەرەتای سەدەی نۆزدەو ناوەڕاستی ئەو سەدەیەش درێژەی هەبووە، لە بواری پەخـشان و چیرۆکیشدا ئەوە شێوازەکە، دیارە تا چ ڕادەیەك سەرەتایی بـووەو دوور بـووە لـە هونـەرو چـنینی هونەرمەندانـە، کـە دەتـوانین بـە پێـی بنـەماکانی کلاسـیزم لـەو چوارچێوەیەی دابنێین کە لە باسەکانی دواتر بە وردی لێی دەدوێین .

## پۆلینکردنی ڕێڕەوی چیرۆکی کوردی

دیارە هەر لێکۆڵەرێك و توێـژەرێك بـە پێـی ڕوانگـەی تایبـەتی خـۆی چـیرۆکی کوردی

پۆلین کردووە، هەیە لە ڕووی مێژوو و سەردەمەکانەوە دیاری کردووە بە پێـی ڕێبازەکـانی ئـەدەب و هەڵکـشانی لەگـەڵ سـەردەمە دیاریکراوەکانـدا، بابەتـە ئەدەبییەکان بـە گشتی و چـیرۆکیش بـە تایبـەت ڕاسـتەوخۆ یـان نـا ڕاسـتەوخۆ ڕەنگدانەوەی بـوارە جـۆراو جۆرەکـانی کۆمەڵـە لـە مێـژوودا،چ لـە ڕابـردوودا بێـت یاخود لە ئێستادا، یان تێڕوانین بێت بۆ ئایندەو تازەکردنەوە بە پـشت بەسـتن بـە ئێـستاو بـە ڕابـردوو، چـیرۆك زێـدەتر لـە ڕەگـەزەکانی دی پەیوەسـتە بـە سـەردەمەکەی خـۆی کـە تێیـدا دێتـە کایـەو پەیوەستیـشە بـە لایـەنی کەسـێتی نووسـەرو بیرکردنـەوەکانی لـەو سـەردەمە، بـاو بـوونی هـەر ڕێبـازو بابـەتێك لـە سەردەمێکی دیاریکراودا کاریگەری خۆی هەیە لە سەر دەستنیـشانکردنی جـۆری دەربڕینەکەو شێوازەکە لـە پـاڵ بیرکردنـەوە و ڕۆشـنبیری نووسـەرەکە خـۆی، لـە کاتێکـدا کۆمەڵگـەی کـوردی بـە بـارێکی دیـاریکراودا، بـە یـەکێك لـە قۆناغـە مێژووییەکاندا تێپەڕ بووبێت، هەر وەك دەرەبەگایەتی و کشتوکاڵ و شـوانکارەیی کە کۆمەڵێك سیفەت و خەسڵەت هەڵدەگرێ و جیای دەکاتەوە لـە قۆناغـەکانی تـر وەك بوارە کۆمەڵایەتیەکان، لـە قۆنـاغی دەرەبەگایـەتی تایبەتمەنـدی شـانازی بـە خۆبوون و پیاهەڵدان بە کەسـێتییەکی دیـاریکراودا بـاو بـووە، وەك پیاهەڵـدان بـە پاڵەوان و قارەمان، کە لە داستانە کۆنەکانی دڵداری وشەڕو شۆڕدا هاتووە ، ئـەوە لە ناوەرۆکدا پێویستی بەوە بووە کە خەسڵەتەکان گەورەتر نیـشان بـدات لـەوەی

كه هەیـه و، بـه شـێوەیەك دەردەبڕێـت كـه جێگـەی شـانازی و پیاهەڵدان بێـت و دەرخستنی كەسێتییەكی ئازاو نەبـەردو جـوامێر، لـه ڕوخساریـشدا ئـەوە دەبوایـه زمانێك بوایه بـه هـۆی ڕەوانبێژییـەوە پـڕ بێـت لـه وشـەی پیاهەڵدان و ڕازاوە بـۆ وەسفكردن و زمانێكی پاراو كه شایەنی ناوەرۆكەكـه بێـت، ئەگـەر چـی نووسـەری كـورد لـه بـارەی پـۆلینكردنی چـیرۆكی كـوردی بەشـێكی ئـەو چـیرۆكانەیان لـه خانـەكانی ڕێبازەكـان دانـەناوە بـه تایبـەتیش (كلاسـیزم)، كـه سـەرەتاو بناغـەی ڕێبازەكانه، دەتوانین لێرەدا ئاماژە بـۆ ئـەوە بكـەین كـه بەشـێك لـەو چـیرۆكانەی باس له ڕووداوی پاڵەوانێتی و دڵداری تراژیدی دەكەن، یـان ئـەو داسـتان و شـەڕو شۆڕانه بخەینه ئەم چوارچێوەیە، وەك ئەو جۆرە چـیرۆكانەی د. مـارف خەزنـەدار بـه چـیرۆكه شـیعر یـان ڕۆمانـه شـیعر ی ناسـاندوون[11] پێیـان بڵـێین چـیرۆكی كلاسیكی، چیرۆكی لەیلاو مەجنون ئەگـەر چـی بـه شـێوازی هـۆنراوە داڕێـژراوە، بەڵام بنەماكانی چیرۆكی تێدا دەبینرێـت ،وەك كـات و شـوێن و ڕووداو و پاڵـەوان، ئەگەر چی بۆچوونی جیاواز لـەو بارەیـەوە لەوەدایـه كـه ئـەو چـیرۆكانه لـه ڕووی هونەرەكانی چیرۆكەوە لـه ڕۆژگـاری ئـەمڕۆدا بـه چـیرۆك لـه قەڵـەم نـەدراوە ، لـه ڕاستیشدا هونەر لەگـەڵ سـەردەمەكەیەتی، نـاتوانین دوێنـێ بـه پێـی لێكدانـەوەی ئەمڕۆ مۆركی پێوە بنێین و له قەڵەمی بدەین ، دەتوانین له ڕووی ناوەرۆكـەوە بـه پێی یەكێك له پێناسەكانی كلاسیزم پۆلینیـان بكـەین كـه دەبـێ بابەتەكـه بـەرز و دانسقه بێت، لێرەدا ئەو بۆچوونه ڕێگه دەكاتەوە بۆ ئەو بابەتانەی كه لەگەڵ ئـەو پێناسەیە جووت دەبێت، به پێویستی دەزانم لێرەدا ئاماژە بـۆ كۆمـەڵێك فاكتـەرو هۆكار بكـەین، كـه ڕۆڵیـان هـەبووە لـه سـەر گەشەسـەندنی كۆمەڵگـەی كـوردی و گۆڕانكارییەكان، كه ڕەنگی داوەتەوە لەسەر دەربڕینی بوارە هونەرییەكانی چیرۆك بۆ شێوازی جیاجیا و ڕێبازی جۆراو جۆر، ئەو گۆڕانكارییانەش چ به هۆی گەشـەی ئاسایی كۆمەڵگەی كوردی بووبێت وەك هەموو كۆمەڵگاكانی جیهان بۆ لایەنـەكانی ژیـان و قۆناغـه یـەك لـه دوای یەكـەكانی مرۆڤایـەتی، یـاخود بـه هـۆی گـۆڕانی بارودۆخی سیاسی نەتەوەی كورد و ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی چینەكانی ناو كۆمەڵگەی كوردی بووبێت، له پاڵ كاریگەری نەتەوەكانی دراوسـێدا كـه بـه ڕوونـی لـه سـەر لایەنـەكانی ئـەدەبی كوردیـدا دەركـەوتووە، دەركـەوتنی هـەر ڕێبـازێكی هونـەری پەیوەسـت بـووە بـه بیركردنـەوەی دەسـەڵات و كاریگـەری لـه سـەر كۆمەڵگەكـە، توندبوونی ململانێی دەرەبەگایەتی و هەڵچوونی چینەكان بەرەو قۆناغی دواتـر لـه

چەوسانەوەی چینێك بە دەست چینێکی ترەوە، کاری کردۆتە سەر دەرکەوتنی لایەنێکی فیکری لە ئەدەبدا وەك لە ڕێبازی ڕیالیستی دەرکەوت، ئەمەش لە یەکێك لە قۆناخەکانی ئەدەبی ئێمەدا ڕوونە، هەر لە دوای کۆتایی هاتنی دەسەلاتی عوسمانی و هاتنی ئینگلیز بۆ عێراق بوو بە سەرەتا بۆ بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری و فیکری بە هۆی بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتییەوە، چەندین گۆڤار و ڕۆژنامە هاتنە بلاوکردنەوە بە تایبەت لە سەردەمی حوکمڕانی شێخ مەحموود، کە پڕ بوون لە بابەتی چیرۆك و هەواڵ و بابەتی کۆمەلایەتی و پەخشان و هۆنراوە[١٢]، لە پاڵ ئەمانەشدا پەیدابوونی چەندین ڕێکخراوی لاوان بۆ جۆشدانی خوێندەوارانی کورد و خۆ ڕۆشنبیرکردن و پەرەپێدانی زمانی ئەدەبی و نەتەوەیی لە نووسیندا، لە ناویاندا چیرۆك بابەتی هەرە دیاری نێو ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە بووە، لە پاڵ بابەتی مێژوویی و کۆمەلایەتی، شێوازی ئەو چیرۆکانەش زیاتر لە سەر ڕێبازی ڕیالیستی بوون، لە ناوەرۆکدا باسی واقعی سەردەمەکە و کێشە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان بوون، وەك چیرۆکەکانی (جەمیل سائیب ) و (ئەحمەد موختار جاف) کە بە ئاراستەی ڕەخنەی کۆمەلایەتی و سیاسی بوون [١٣] . ئەگەر چی بەشێك لەو چیرۆکانە لە ناوەرۆکدا ڕیالستی بوون بەلام لە ڕوخساردا بە بەراورد لەگەڵ چیرۆکی ئەمرۆ، ئەوە شێوازێکی کۆنی گێڕانەوەیان بە سەردا زاڵ بووە، کە لە سەر زاری گێڕەرەوە یان نووسەر گێڕدراونەتەوە، ئەمەش دەتوانین بلێین شێوازێکی کلاسیکی بووە لە داڕشتنیدا، نووسەر ڕووداوی چیرۆکی بە شێوەیەکی ئاسایی و بە زمانێکی سادەی ناوچەیی بەکار هێناوە لە گێڕانەوەدا و هیچ پێوەرێکی بۆ ڕێکخستنی کات و شوێن و گونجاندنی لەگەڵ ڕووداوەکە دانەناوەو، ماکیاج و جوانکاری نەزانیوە بۆ دەربڕین بەڵکو ڕووداوی وەکو خۆی نیشانداوە، وەك گەیاندنی هەواڵێك یاخود گێڕانەوەی سەربردەیەك، لە دوای سالانی چلەکان و دوای جەنگی جیهانی دووەم و تاوەکو شەستەکانیش چیرۆکی کوردی شێوازێکی تری بەخۆیەوە بینی، نووسەر هەولی داوە گرێچنی بکات لە گونجاندنی کات و شوێن لەگەڵ ڕووداودا، نووسەر بیرو توانای خۆی خستۆتە گەڕ بۆ دروستکردنی چوارچێوەیەك بۆ کەرەستەکانی چیرۆك، بەوە شێوازەکەی جیا کردەوە لە چیرۆکەکانی پێشووتر و قۆناغێکی تر هاتە کایە، هەندێ لەو چیرۆکانە لە ناوەرۆکدا ڕووداوی ڕۆمانسی،یاخود نەگەیشتنی پالەوانەکانیان بە ئاواتەکانیان و

کۆتایی هاتنێکی تراژیدیانەیان پێوە دیار بوو[١٤]، لە چیرۆکی کوردیدا ناتوانین وەك هۆنراوە بە پێی ڕێبازەکانی ئەدەب دابەشیان بکەین، چونکە جاری وا دەبێت دوو ڕێباز لە چنینیدا تێهەڵکێش دەکرێت بە پێی جۆری بابەتەکە و شێوازی داڕشتنەکە لە بەکارهێنانی هونەروبنەماکانی چیرۆك، وەك مەسەلەی ویژدانی (ئەحمەد موختارجاف )، کە لە ناوەرۆکدا ڕیالیستییە و لە خەیاڵێکی ڕۆمانسییانە داڕێژراوە . چیرۆکە سەرەتاییەکان چ ئەو چیرۆکانەی بە زارەکی گوتراون و دواتر نووسراونەتەوە یاخود ئەوانەی نووسەر ڕاستەوخۆ نووسیویەتی، وەك چیرۆکەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی تا دەگاتە چیرۆکی (شویش )ی فوئاد تەمۆ یەك شێوازی گێڕانەوەو زمانی گۆکردنی تێدا زاڵە[١٥]، نووسەر هیچ هونەرێکی تێدا نەخستۆتە گەڕ جگە لە گێڕانەوەیەکی بە زمانی ناوچەیی نەبێت کە بە نووسین داڕێژراوە، دەکرێ بەو جۆرە شێوازە بڵێین شێوازی کلاسیزم، چونکە ئەو مەرج و خەسڵەتانەی کە لە کلاسیزمی کۆندا دەبینرێ لێرەدا هەیە، لە هەمان کاتیشدا ناوەرۆکی ئەو چیرۆکانە ڕیالیستی تێدا دەبینرێ ، لە دوای جەنگی جیهانی دووەم وبە هۆی ئەو بارودۆخەی بە سەر ناوچەکەدا هاتووە و بۆتە هۆی دروستبوونی بیری نەتەوەیی و چینایەتی، ئەمەش لە چیرۆکدا ڕەنگی داوەتەوە، هەر لەو ماوەیەشدا چیرۆکی ڕۆمانسییانە دەکەوێتە بەر چاو وەك ئەو چیرۆکەی پیرەمێرد، ( گەشتێك بەسەر باڵی پەڕەندەی خەیاڵەوە )، بۆیە چیرۆکی کوردی بە پێی زنجیرەی ڕێبازە ئەدەبییەکان بە دوای یەکدا نەڕۆیشتووە، ئەو دیاردەیە لە هۆنراوەشدا دەبینرێت بەڵام بە ڕێژەیەکی کەمتر ، لە دوای حەفتاکاندا بە هۆی کاریگەری نوێبوونەوە گەلێك گۆڕانکاری بە سەر شێوازی چیرۆکدا هاتووە لە هەردوو لایەنەوە ( ڕوخسار و ناوەڕۆك )، لە ڕوخساردا هەوڵ دراوە چیرۆك کورت بکرێتەوە جگە لە شێوازی هەندێ نووسەر نەبێت کە درێژدادڕی تێدا کردووە وەك گەلە گورگی حسێن عارف، بەڵام بە گشتی ئەوە دەبینرێت کە شێواز لە گێڕانەوەی ئاسایی و وەسفی دوورو درێژ دوور کەوتۆتەوە .

## شێوازە باوەکانی کلاسیزم لە چیرۆکی کوردیدا

کلاسیزم تاوەکو ئێستا بە پێناسەکانی کلاسیکی گریکییەوە ناسراوە بۆ ئەو بەرهەمە تایبەتییانەی لە ناوەرۆکدا باس لە چینی بەرزی دەسەڵاتدارەکان،یاخود ئەو ڕووداوانەی پەیوەستە بە کاروباری ئەوانەوە لە قۆناغەکانی دواتریشدا بۆ لاساییکردنەوەو دیاریکردنی سەردەمێکی دیاریکراو لە ئەدەبیاتی نەتەوەکاندا بە کار هات، لە ئەدەبی ئێمەشدا کە زیاتر لە هۆنراوەدا باسی لێوە کراوە، پتر لایەنی ڕوخساری دیاری کردووە لە کێش و عەرووزی هۆنراوەدا، بەڵام کلاسیزم لە ئەدەبی کوردیدا هەر تەنیا هۆنراوە نەبووە بەڵکو لە ڕەگەزە ئەدەبییەکانی تریشدا دەبینرێت ، ئەگەر وردتر سەیری چیرۆکی کوردی بکەین ئەوە لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ چەندین ڕێچکەو شێوازی گرتووە، بەڵام لە هەموو قۆناغەکانیدا شێوازی گێڕانەوە زاڵ بووە و پەیڕەو کراوە، بەڵام بە ئەدگاری جیاجیاوە، لە چیرۆکە سەرەتاییەکان تا دەگاتە چیرۆکەکانی (جەمیل سائیب ) و (ئەحمەد موختار جاف )، گێڕانەوەیەکی دوورو درێژ و ئاسایی هەموو بنەماکانی چیرۆکی لە خۆ گرتووە، بەڵام دەبینین لە چیرۆکی ئەمڕۆدا گێڕانەوە بەم شێوەیە نییە، بەڵکو هەندێ جار هەست بە گێڕانەوەکە ناکرێت لە تێکچڕژانی بنەما هونەرییەکان، ئەگەر خوێنەرەکە شارەزایی لە چیرۆك نەبێت . لە چیرۆکی کۆندا گێڕانەوە شێوازی سەرەکی دارشتنی چیرۆك بووە، گێڕانەوە هەموو بنەماکانی چیرۆکی داگیر کردبوو، کات لە گێڕانەوەدا بە بەردەوامی لەگەڵ سەرجەم لایەنەکانی چیرۆك تەریب ڕۆیشتووە، نووسەر هیچ دەستکارییەکی ناکات بەڵکو لەگەڵ ڕێڕەوی ڕووداودا دەڕوات، لەو گێڕانەوەیەشدا کات بەرەو نیشاندانی مێژوو دەچێت[١٦]، کێشەیەك باس دەکات بە گێڕانەوە لە چوارچێوەی مێژوودا، لەو جۆرەیاندا خەیاڵ و بیری نووسەر ناچێتە ناو چیرۆك،بەلکو دەرخستنی جیهانێکە لە ڕەوتی دەقی چیرۆکدا بۆ گوێگر یان خوێنەر . چیرۆك لە ڕێگەی گێڕانەوە دەتوانێت لە دەرەوە مێژوویێکی تر دروست بکات، لێرەش مەبەست ئەو گێڕانەوەیەیە کە بۆ ڕووداوێك وەك خۆی بە کار دێت و بێ دەستکاری کردنی بنەماکانی چیرۆك، بێ ئەوەی نووسەر گەمەی تەکنیك بەکار بێنێ، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە دەتوانین کلاسیزم بەوە جودا بکەینەوە کە یەکیان خولقاندنی واقعێکە بە هۆی نووسەرەوە، ئەوی تریش ئەوەیە کە خۆی لاساییکردنەوەیەکی

سروشتییەو گێڕانەوە ڕۆڵی تێدا دەبینیٚ، ئەو جۆرە شێوازەی چیرۆك، (كلاسیزم)، كۆپی كردنی ڕووداوەكەیە، یان دەتوانین بڵێین وەرگێڕانێكەو بەس لە ڕووداوەوە بۆ زمانی نووسین، یان گۆكردنی ئاسایی بەدەر لە تەكنیك و دەست تێوەردان و دوور لە ئایدۆلۆجیای نووسەر، لێرەدا چیرۆك سەرەتاو كۆتایی ڕوونە، ئەوەی تێبینی دەكرێت لەو جۆرە چیرۆكانە گێڕەرەوە كەسی نووسەرەو دووەمە باس لە كەسی سێیەم دەكات كە پاڵەوانی چیرۆكە، پاڵەوان خۆی هیچ ڕۆڵێك نابینێت لە هونەرەكانی دایەلۆگ و مەنەلۆج لە چیرۆكەكەدا بەڵكو یەكێكی ترە باس و وەسفی دەكات . لە چیرۆكی كلاسیكیدا ئەندێشە بەشداری ناكات و بێلایەنە، لە كلاسیزمدا چیرۆك زۆرتر بۆ مەبەستی گەیاندنی ڕووداوێكە نەوەك گەیاندنی چێژو ئەندێشە، بەوە دەتوانین سیمای چیرۆكی كلاسیك لە چیرۆكی ڕیالیستی و ڕۆمانسی جودا بكەینەوە، لە چیرۆكی كلاسیكیدا بەرەو گێڕانەوەیەكی حیكایەتخوانی دەچێت و ئەو چێژەی لێرەدا دەبینرێت لە گێڕانەوەكەدایە، نەوەك چێژی پەیام وەك چیرۆكە دڵدارییەكانی كوردەواری، یان هەزارو یەك شەوە و حیكایەتەكانی بۆكاشیۆ(١٧)، لە ئەدەبی خۆشماندا وەك چیرۆكەكانی لەیلاو مەجنون و شیرین و فەرهاد و خورشیدی خاوەر و ...تد . ئەوەی ئەم چیرۆكانە جیا دەكاتەوە لە چیرۆكی هونەری ئەمرۆ بەدەرە لە هونەرەكانی جەفەنگ و فەنتازیا و مەنەلۆج و مۆنتاجكردنی بنەماكانی چیرۆك، نووسەر لە چیرۆكی كلاسیكیدا ناگەڕێتەوە بۆ پاش و پێش كردنی كاتەكان و لایەنە دەروونییەكانی پاڵەوانی چیرۆك، یاخود بەكارهێنانی فەنتازیاو سەرلێشێواندنی خوێنەر یان گوێگر لە واتای چیرۆك، بەڵكو سادەو بە زمانی ناوچەیی دەبێت (١٨)، دیاردەیەكی تری ئەو جۆرە چیرۆكانە ئەوەیە كە نهێنی شاراوەی تێدا نییە و نابینرێت، لەبەر ئەوەی گێڕەرەوە لەو شێوازەدا ڕوو لە شاردنەوەی كەسێتی پاڵەوان و ڕووداوەكان ناكات، هەموو هەڵوێست و ڕەوشەكان وەكو خۆی دەردەكەوێت، ڕەنگە توێژەرێك بپرسێت كەواتە جیاوازی چییە لەگەڵ شێوازی ڕیالیستیدا كە شتەكان وەكو خۆی بخاتە ڕوو، لە وەڵامدا دەڵێین مادامەكیٚ گێڕەرەوە یان نووسەر بابەتەكەی بەزمانێكی ئەدەبی و پەتی دوور لە هونەرەكانی نووسین و گفتوگۆ نەخستۆتە ڕوو ئەوە زمانێكی گشتی و سادەیە زیاتر لە زمانی میللییەوە نزیكە لە لایەكی تر نووسەر پەی بە هونەرەكانی نووسین و گرێچنی نەبردووە دەشبێت نووسەر شارەزایی هەبووبێت بەڵام دیارە خۆی مەبەستی بووە بەم زمانە سادەیە دایبڕێژێت بە

مەبەستی پێشکەشکردنی بۆ هەموو خەڵك یان گێڕانەوە بـۆ هـەموو چـینێك، بـەڵام دەبێ ئاگاداری ئەو ڕاستییەش بین کەوا ئەو جۆرە چـیرۆکانە بـێ نـاوەرۆك نییـە و خـاوەنی فەلـسەفە و حیکمـەی خۆیـەتی و بـە مەبەسـت و ئامـانج نووسـراوە وەك ئامۆژگاری و وانە و پەند .

## ڕاڤەو پراکتیك

بۆ ئەو مەبەستە پێویستە بگەڕێینەوە لای ئەو چیرۆکە سەرەتاییانەی کـە لـە سەدەی نۆزدە، وەك دەستنووس بەجێ ماون و توێژەران لێکۆڵینـەویان لـەبارەوە کـردووە کۆنترینیـشیان کـە تـا ئێـستا لـە بـەر دەسـتمان بێـت چـیرۆکەکانی مـەلا مەحموودی بایەزیدیە، کە د. فەرهاد پیربالْ لەم دواییەدا لێکۆڵینەوەی لە بـارەوە کردووە[١٩]، یەکەم دەستنووسیش لەو چیرۆکانە چیرۆکی (مەم و زین ) ە، کـە لـە ساڵی (١٨٥٦ ) بە شـێوەی دیـالیکتی کرمـانجی سـەروو نووسـیویەتی دوایـی ژابـا قونسوڵی ڕووسی لە ئـەرزەڕۆم وەری گێڕاوەتـە سـەر زمـانی لاتینـی و فەرەنـسی، هـەروەها چـیرۆکی (لـەیلا و مـەجنون )ە، کـە ئـەویش بـە دیـالێکتی کرمـانجی نووسراوە و لە چـیرۆکە داسـتانییەکەی حاریـسی بەتلیـسی وەرگـیراوە، دواتـریش گرنگترین بەرهەمی چیرۆکەکانی بایەزیدی کە چل چیرۆکی کوردییەو بە دیـالێکتی کرمـانجی نووسـراون، (جـامیعی رسـالیان و حکایـەتان)، کـە بـە یەکـەم کۆمەڵـە چـیرۆکی کـوردی دادەنرێـت لـە مێـژووی ئـەدەبیاتی کوردیـدا، لەسـەرجەم ئـەو چـیرۆکانەدا شـێوازێك زاڵــە کــە ئێمــە بــە شــێوازی کلاســیکی ناســاندوومانە، گێڕانەوەیـەکی سەرتاسـەری و هەمەلایـەنی چـیرۆکەکانە کـە زیـاتر دەچـێتە سـەر شێوازی حکایەتخوانی [٢٠]، ڕووداو لەسەر زاری گێڕەرەوە یاخود نووسەر کە ڕۆڵـی گێـڕەرەوە دەبینـێ خراوەتـە ڕوو[٢١]، بـەو شـێوازە دەتـوانین ئـەو چـیرۆکانە بـە شێوازێکی تایبەت دیاری بکەین، لەم جۆرەیاندا گێڕەرەوە یان نووسەر دەستکاری هیچ لایەنێکی ناکات بەڵکو وەکو خۆی باسی دەکـات بـۆ نموونـەش چـیرۆکێك لـەو چیرۆکانە وەردەگرین لە شێوازەکەیەوە دەتوانین بە کلاسیکی لـە قەڵـەمی بـدەین بەپێی سیماکانی کلاسیزم :

**چیرۆکی ( حیکایەتی سی** [٢٢] **)**

حیکایـەت دکـەن، مەلایـەك د کوردسـتانێ دا هـەبوو، نـاڤێ (مـەلا بازیـد )، ئەکسەری

وەعزو شیرەت ددایە ئەکرادان، و ل مزگـەفتێ نەسـیحەت دکرن، و د وەعزێـدا دگوت:

ئـەی جەماعـەتی موسـلمین، هـەر چـی کەسـێ ژوە دوو دەسـت جـل و لبـاس هەبن، یەکێ د ریا خـودی دا بدەتـە ژاران، و هەرچـی کەسـێ ژوە دوو نـان هـەبن، یەکێ د ریا خودێ بدەنە فەقیران، مەگەر ژنا مەلا بازیـد ژی هاتبوویـە گوهـداریێ، ئەڤ شیرەتێد میری خوە مەلا بازیدی دبهیستن، وەکو ڤەگەریا و چوو بە ماڵا خوە، دوو دەست جلی مەلا بازید هەبوون، یەك بەر شوو بوو، یەك دشوشتن، و ئـی دنـێ بەر دکرن، ژنا مەلا بازیدی ئینان ئەو دەستێ جلێد مەلای کو بەر شوو بوون، دایـە ژاران و نیڤەکا نانێ حازر هەی دایە فەقیران، ئیجارێ وەکو مەلا بازیـد هاتیـە مـاڵا خوە، شەڤ گۆتە ژنا خوە، کو جلێد من دژوون بووینە، بەر شووید من بینە، دا ئەز جلێد خوە ڤەگهورم، ژنێ گۆتە مەلای، کو من ئیرۆکە، جلێد تـەیێ زێـدە حـەمو ل ژاران بەلاڤ کر، و نیڤەکا نانی ماڵێ حازر ژی من دایە فـەقیران، ئیجـاری مـەلا بازیـد سل بوو، گۆتە ژنا خـوە، تـە ژی بـو جـل و نـان دایـە خـەڵکی، ژنـێ گۆتـە مـەلای ئیرۆکە تە ل مزگەفتێ شـیرەت دکـرن و دگـۆت کـو هەرچـی کەسـێ تـشتەکێ ژوی زێدە هەیـە لازمـە د ریـا خـودێ بدەنـە ژاران، ئەڤنـە ژ مـە زێـدە بـوون، مـن دایـە فەقیران، مەلای وەکو ئەڤ خەبەرە ژ ژنێ سەح کری خوە سل کر و گۆت، کو کـچێ من شیرەت ل خەلقی د کرن لنەفسا خوە نەد کـرن، مـن وەسـانی وەعـز کـرن کـو خەلق جلێد خوەیی زێدەو نانی بدەنە من، نەوەبو کو تو رابی جلێد بەر شوویا من و نانی زارۆکان بدەیە خەلقی، مرادا من داینا ناسان بـوو، تـە ئینایـە ئـەڤ شـیرەتا ژبۆی خەلقی، دەرحەققێ من ئیجرا کریە.

ئەگەر سەرنج بدەینە شێوازی چیرۆکەکە، گێڕانەوە بە ئاسایی و سـادەیی، وەك گێڕانەوەیەکی زارەکی و بە زمانی ناوچەیی کەسـەکە خراوەتـە ڕوو، نووسـەر یان گێڕەرەوە نەهاتووە یەکە یەکە بە وەسفێك باس لـە بنـەماکان و پێکهاتەکـەی

چـیرۆك بكـات، ( كـات — شـوێن — ڕووداو — پاڵـەوان )، ئنجـا لـە ڕێگـەی مۆنتـاج كردنیان گرێـچنی بـۆ چـیرۆكەكە بكـات، بـەڵكو جلـەوی داوەتـە دەسـت چـۆنیەتی ڕۆیشتنی ڕووداوەكە وەك خۆی و بە زمانی گشتی خەڵك دوور لە زمـانی ئـەدەبی و پـاراو دایڕشـتووە، ئەمـەش یەكێكـە لـەو سـیمایانەی كلاسـیزم لـە ڕوخـساردا، لـە ناوەرۆكیشدا باس لە ڕاستگۆیی دەكات كە ڕەوشتێكی بەرزی مرۆڤەو پێویستە لـە ڕووداوێكی ڕاستەقینەدا بخرێتە ڕوو وەك لـە چـیرۆكەكەدا هـاتووە، (كـات) لەگـەڵ درێـژەی گێڕانەوەكـەدا ئاسـایی بـەڕێوە چـووە[٢٣]، شـوێنیش هـیچ دەسـتكاری نـەكراوە بـەڵكو شـوێنی پاڵەوانەكـە خۆیـەتی، لـە هـەموو چـیرۆكەكانی مـەلا مەحموودی بایەزیدیدا تێبینی ئەوە دەكرێت كە شێوازێك بەسـەریاندا زاڵـە و بـاوە لە بەكارهێنانی زمـان و گێڕانەوەیـەكی حكایـەتخوانی، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت كەوا قۆناغی ئەو سەردەمەی چیرۆك بەو شێوازە بووەو جیایە لـە قۆناغـەكانی كـە دواتر بۆ نووسینی چیرۆك هاتوون، كە هونەرو چـنین تێیـدا بـاڵا دەسـت دەبێـت و ڕۆڵی نووسەریش بە ئاشكرا دەركەوتووە لە بەكارهێنانی هونـەرەكانی چـیرۆك، لـە بەكارهێنانی ڕەمزو فەنتازیاو گرێچنیدا كە تواناو لێهاتوویی نووسەر نیـشان دەدات لە مۆنتاج كردنی بنەماكانی چیرۆك .

**ئەنجام**

لـەو لێکۆڵینەوەیـەدا گەیـشتمە چـەند ڕاسـتییەك لـە بـواری دیـاریکردنی قۆناغـە ونەکانی چیرۆکی کوردی سەرەتایی، کە تاوەکو ئێستا دەستنیشانی ئەوە نەکرابوو سەر بە چ قۆناخ و ڕێبازێکە، بە پێی ئەو پێوانانەی کە بـۆ ئـەدەب کـراوە، لـە ئەنجامـدا ئـەو خاڵانەم دەستنیشان کرد لە لێکۆڵینەوەکەدا :

١- چیرۆکی کوردی وەك سەرجەم ڕەگەزە ئەدەبییەکانی تری ئەدەب بـە چـەندین شێوازو قۆناغ و ڕێباز تێپەڕیوە، لەو ڕێبازانەشدا بەشی هەرە زۆریان لێکۆڵینەوەیان لە بارە کراوە، تەنیا ئەو چیرۆکە سەرەتاییانە نەبێت کە شـێوازێکی لەیەکـچوویان هەیـە ئـەویش گێڕانەوەیـە، یـان کـۆپی کردنـی ڕووداوەکەیـە یـان تـەنیا وەرگێڕانێکـە لـە ڕووداوەوە بۆ زمانی نووسین دوور لە تەکنیك .

٢-چیرۆکە سەرەتاییەکان ئەگەر چی گێڕانەوەیان بەسـەردا زاڵـە بـەڵام بـووە بـە سیمایەك بـۆ ناسـینەوەی ئـەو جـۆرە چـیرۆکانە لـە ڕوخـساردا و، هەنـدێ جـاریش بـە گۆڕانی شێوازی گێڕانەوەکە ڕوخساری چیرۆکەکە کەمێك دەگۆڕێـت لەگـەڵ چـیرۆکێکی تر .

٣- لە سیماکانی چیرۆکی کۆنـدا یـاخود (کلاسـیك)، بنـەماکانی چـیرۆك تەواوکـەری یـەکترن و بـە یەکـەوە دێـن بـێ ئـەوەی دەسـتی مۆنتـاجی گەیـشتبێتێ، بـەڵکو هـەر لـە ڕەوتـی گێڕانەوەکـەدا هـاتووە پێـچەوانەی چـیرۆکی نـوێ کـە نووسـەر ڕۆڵ لە مۆنتاجکردنی بنەماکانی چیرۆك دەبینێ .

## پەراوێزەکان

١– د. کەمال مەزهەر . ڕێنیسانس . لا ٢٤
٢– عەلادین سەجادی . مێژووی ئەدەبی کوردی . لا ٨٩
٣– د. فەرهاد پیرباڵ . ڕێبازە ئەدەبییەکان . لا ١٥
٤– د. هیمداد حسین . ڕێبازە ئەدەبییەکان . لا ٢٣
٥– هۆراس . هونەری شیعر . لا ٨
٦– د. عەزیز گەردی . ئەدەبی بەراوردکاری . لا ٢٩
٧– د. هیمداد حسین .ڕێبازە ئەدەبییەکان . لا٢٣
٨– د. جمیل نصیف . المذاهب الادبیة . ص ٤٧
٩– د . عەزیز گەردی . ئەدەبی بەراوردکاری . لا ٣٠
١٠– د. فەرهاد پیرباڵ. ڕێبازە ئەدەبییەکان . لا ٤٣
١١ – د. مارف خەزنەدار . لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە . لا ١٧٣
١٢ – د. کەمال مەزهەر . تێگەیشتنی ڕاستی . لا ١١
١٣– جەمیل سائیب . لە خەوما . لا ٦
١٤– خورشید رەشید . ڕێبازی ڕۆمانتیکی . لا ٢٣
١٥– گۆڤاری ڕۆژی کورد ژ.١٣ . لا ٤١
١٦– کریستیان انجلی ، و. ناجي مصطفی. لا ١١
١٧– عەتا محەمەد . جیهانی ڕاڤە نەکراو . لا ٣٩
١٨– سەرچاوەی پێشوو . لا ٤٠
١٩– د . فەرهاد پیرباڵ . مەلا مەحموودی بایەزیدی . لا ١٢
٢٠– هەمان سەرچاوە . لا ١٣
٢١– بول ریکور، الزمان والسرد و. فلاح رحیم . لا ١٧١
٢٢– رشید فندی . چل حیکایەتێد مەلا مەحموودی بایەزیدی . لا ٩
٢٣–کریستیان انجلي ، الروایات ، ت: ناجي مصطفی ، ص٩٧

## سەرچاوەکان

**کوردییەکان:**
١- جەمیل سائیب، لە خەوما، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٥، بەغدا.
٢- د . هیمداد حوسێن، ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٧، هەولێر
٣- هۆراس، هونەری شیعر، و: حەمید عەزیز، وەزارەتی ڕاگەیاندن، ١٩٧٩، بەغدا.
٤- رەشید فندی ، چل حکایەتێد مەلا مەحموودی بایەزیدی، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٤، هەولێر.
٥- ڕۆژی کورد، ژ: ١٣، (المؤسسة العراقية )، ١٩٨١، بەغدا
٦- مارف خەزنەدار، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، چاپخانەی ( المؤسسة العراقية )، ١٩٨٤، بەغدا
٧- کەمال مەزهەر، ڕێنیسانس، چاپخانەی شڤان، چاپی دووەم، ٢٠٠٤، سلێمانی.
٨ - د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٨، بەغدا
٩- د.عەزیز گەردی، ئەدەبی بەراوردکاری، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٨، بەغدا
١٠- عەلادین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥٢
١١- عەتا محەمەد، جیهانی ڕاڤە نەکراو، ٢٠٠٤ ، سلێمانی
١٢- خورشید رەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیری، ١٩٨٩، بەغدا
١٣- د . فەرهاد پیربال ، مەلا مەحموودی بایەزیدی، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس ٢٠٠٠، هەولێر
١٤- د . فەرهاد پیربال، ڕێبازە ئەدەبییەکان، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٤ ،هەولێر

**عەرەبییەکان:**
١- بول ريكو ، الزمان والسرد، الجزء الثاني ، ت: فلاح رحيم ، دار الكتاب الجديد المتحدة ٢٠٠٢ ، طرابلس .
٢- د. جميل نصيف التكريتي ، المذاهب الادبية ، الطبعة الاولى ، ١٩٩٠ ، بغداد
٣- كريستيان انجلي ، السرديات ، ت: ناجي مصطفى ، منشورات الحوار الاكاديمي، الطبعة الاولى ، ١٩٨٩ ، بيروت.

## ملخص البحث

## الكلاسيكية في القصة الكردية

أقدم هذا البحث من اجل توضيح مرحلة من مراحل القصة الكردية الغير الموضحة ، حيث ان القصة الكردية منذ نشوءها وتطورها عبر الازمان الغابرة اصبحت جزء من التاريخ الاجتماعي والسياسي للشعب الكردي المدونة وغير المدونة، يتوزع هذا البحث على عدة محاور تشمل كل منه توضيحا مختصرا للجوانب التي نشأت فيها القصة الكردية وتحديد مرحلة معينة من مراحلها المختلفة وكذلك توضيح للمفاهيم الكلاسيكية وانسجامها مع فترة من فترات القصة الكردية القديمة بما يسمى الكلاسيكية و وضع بعض من هذه القصص الكردية القديمة حسب سمتها المعروفة في اطار هذه المرحلة ، وفي محور آخر تم تحديد المراحل المختلفة للقصة الكردية بصورة مختصرة وكذلك توضيح اسلوب التعبير للقصص في هذه المرحلة الكلاسيكية بحيث تبين مميزاتها الخاصة عن اساليب التعبير للمراحل الاخرى التي ما بعدها ، وما يميز اسلوب هذا النوع من القصص هي البساطة والتعبير باللغة العامة للمجتمع الكردي من حيث الكلام والحوار وكذلك الجانب الفني السائد هو السرد الطويل ما يشبه بالحكاية او الكلام الطبيعي من دون مشاركة السارد او الكاتب في ابراز فنونه ودون الولوج الى اعماق الفنون القصصية كما موجود في القصص الحديثة والمحور الاخير هو التطبيق على احدى القصص القديمة وتحليلها من جوانبها المختلفة وتطبيق ما ممكن من السمات الكلاسيكية على هذه الانواع من القصص .

## Abstract

I present this paper in order to appear unclear stage of Kurdish story. The Kurdish story since its establishment and its development throw the past times became a part of Kurdish registered and registered social and political history of Kurdish nation. This paper falls into several axes each of them is about obvious summary for aspects of instituted of Kurdish story, and assume one stage among difference stages, although showing its classical conceptual and its equivalence with a stage of Kurdish story stages which called classical, and put some ancient Kurdish stories or classifying the Kurdish story as by its distinguish features. In other axe we bring out the stages of Kurdish story and appearing expression style of stories in classical stage, and distinctive them from other stages. The distinctive features of this stage which make it different from other stages is that it was simple and its language is the falk expression of Kurdish language. In other axe we present the stages of Kurdish story in summary and identify expression style of classical story, and its propriety features , the distinct feature of this kind of story is of its simple, and falk expression of Kurdish language, in its discourse and conversation. The bringing out aspect of this kind of story is the long recital style which is similarly to recitation or natural utterance neither existence of taller, or the author to bring out his arts nor entering to the depth of story arts like the recent story. The last axe is about the applied of an ancient story and analyses it in all aspects and apply the classical features on these kinds of story.

# دووالیزم له شیعره‌كانی ( بێكه‌س ) دا

پ. ی. د. نوزاد وقاص سعید

## پێشه‌كی

هه‌روه‌كو ئاشكرایه شیعر له ناخی مرۆڤه‌وه هه‌ڵده‌قوڵێ و په‌یوه‌ندی به خود و ناخی كه‌سایه‌تییه‌كه و كاریگه‌ری ژینگه و ده‌وروبه‌ره‌وه هه‌یه.

ئه‌وه‌ی به په‌یژه‌ی داهێنان سه‌ر بكه‌وێ، ده‌بێ تاڵاوی دوودڵی كه به‌رهه‌می ئه‌ده‌بی لێ ده‌تكێ، له ناخی خۆیه‌وه بچێژێ، له‌وه‌ی كه‌ڵه‌كه‌ی دژه‌كانی ناو ده‌روونی خۆی ده‌گۆڕێ به بریسكه‌ی تیشكێكی داهێنان، كه خۆی له خۆیدا به‌رهه‌می پڕ به‌های گه‌نجینه‌كانی زه‌ینی گرگرتوون. جا ئه‌و دوودڵییه‌ی دووچاری هه‌ستی داهێنه‌ر و ده‌روونی ده‌بێته‌وه، كه له ناخیه‌وه به داهێنانێكی ره‌وان بۆ جیهانی ده‌ره‌وه‌ی پارێزه ده‌كات. ئه‌وه خۆی سروشتی ئه‌و داهێنانه و ئه‌و ئاسته‌ی پێ ده‌گات، له ڕووی شێوه‌و ناوه‌رۆكه‌وه ده‌ستنیشان ده‌كات. ئه‌و دژیه‌كییه ڕووكاری كه‌سێتی داهێنه‌رو ڕاستی داهێنانه‌كه پێكدێنێ، چونكه ئه‌وه‌ی له به‌هاری ته‌مه‌نی فیكری به‌ده‌ستی دێنێ، ئه‌نجامی پێكدادانی ئه‌و دژیه‌كییه‌یه كه له ناخی ده‌روونی ئۆقره‌ی گرتووه. به‌ڵام سه‌باره‌ت به جیهانی ده‌ره‌وه‌ی، بریتییه له تێكه‌ڵبوونێك له‌نێوان زێده ده‌سه‌ڵاتی ئه‌و دژیه‌كییه‌ی، كه له‌سه‌ر شانۆی كه‌سێتی ده‌ره‌وه‌ی جارێك و هه‌ندێ جاریش له قووڵاییه‌وه به سه‌ر دیارده‌ی ره‌فتاره‌كانی به‌ده‌ر ده‌كه‌وێ.[1] دیاره كاریگه‌ری ژیانی رامیاری و كۆمه‌ڵایه‌تی سه‌رده‌م، ڕۆڵی له كه‌سایه‌تی بێكه‌سدا هه‌بووه و وه‌ك كه‌سایه‌تیێكی دووالیزم ده‌ركه‌وتووه. جارێكیان وه‌ك كه‌سایه‌تیێكی نیشتیمان په‌روه‌ر و خه‌باتگێڕ جارێكیش وه‌ك كه‌سایه‌تیێكی ره‌شبین و بێزار و تووڕه له میلله‌ت و خزم و كه‌س. ئه‌مه‌ش له شیعره‌كانیدا ره‌نگیان داوه‌ته‌وه.

لێکۆڵینەوەکە هەوڵدانێکە بۆ تیشك خستنە سەر دووالیزمی لە شیعرەکانی بێکەسدا، و نەبوونی لێکۆڵینەوەیێکی زانستی دەربارەی ئەم بابەتە، هاندەر بوو بۆ ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

لێکۆڵینەوەکە لە دوو تەوەر پێکهاتووە : یەکەمیان دەربارەی بێکەسە وەك شاعیرێکی نیشتیمان پەروەر و خەباتگێڕ و ڕاستکەرەوەی باری کۆمەڵایەتی. دووەمیش وەك شاعیرێکی رەشبین و بێزار و تووڕە لە میللەت و خزم و کەس و برادەر.

## ژیانی بێکەس

ناوی فایەق کوڕی عەبدوڵلا بەگ کوڕی کاکە حەمەی کوڕی ئەلیاس قۆجەیە. لە ساڵی (١٩٠٥) لە گوندی سیتەك لە دایك بووە. باوکی تابوور ئاغاسی بووە لە سوپای عوسمانیدا. سەرەتای تەمەنی لە سیتەك بردۆتە سەر، لە دواییداماڵیان گواستۆتەوە سلێمانی. هێشتا منداڵ بووە، تووشی ئاوڵە بووە و ئەدگاری دەموچاوی بەهۆیەوە تێك چووە. لە ساڵی (١٩١١) بەکاروباری عەسکەری باوکی نێردراوەتە خانەقین و لەپاشانا بۆ بەغدا، و لەدوای ماوەیێ منداڵەکانیشی گواستۆتەوە ئەوێ. دوای ساڵێك ڕووی کردۆتە وڵاتی تورکی عوسمانی و منداڵەکانی لە بەغدا جێهێشتووە. باوکی لە وڵاتی عوسمانی ون بووە و لەو کاتەدا حەمە سەعیدی برا گەورەی لە ڕووباری دیجلە خنکاوە. ئینجا دایکی کۆچی دوایی کردووە. بێکەس ناچار پەنای بۆ خاڵی بردووە، ئەویش دوای ماوەیێك کۆچی دوایی کردووە، بەم جۆرە خۆی و برا بچووکی بێکەس ماونەتەوە و بەمەش نەگبەتی ڕووی لە بێکەس کردووە.

لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی بەهۆی کاکە حەمەی مامیەوە کە لە سلێمانی بووە، بێکەس و برای لە بەغدا بە حاجی عەلی ئاغا سپێردراون، و ژیانی بۆ دابین کردوون و ڕێگەی خوێندنیانی بۆ خۆش کردووە. بەڵام پێش کۆتایی جەنگ باری داراییان تێك چووەو ناچار لە ساڵی (١٩١٨) بێکەس و برای گەڕاونەتەوە سلێمانی بۆ لای حاجی ئەمینی مامیان، و تا ساڵی (١٩٢٣) لە قوتابخانە خوێندویێتی. بەڵام خوێندنی زۆر ناخایێنی و ڕوو دەکاتە کەرکوك و

لەوێ لە قوتابخانەی عیلمییە دەست دەکات بە خوێندن. بەڵام کاروباری سەرناگرێ و ناچار ڕوو دەکاتە بەغدا. لە ساڵانی (١٩٢٤ – ١٩٢٥) لە قوتابخانەی دارولعلوم دادەمەزرێ. بەڵام لەبەر دەستکورتی ناتوانێ خوێندن تەواو بکات و دەگەڕێتەوە سلێمانی و دەبێتە قوتابی پۆلی یەکەمی ناوەندی. بەڵام هیچ مایەیێکی نابێ پێی بژێت، ناچار کاسبی دەکات و جگەرە و شخاتە دەفرۆشێ، بەڵام ئەمەش دادی نادات و ناچار کرێکاری لە ڕێگەی عەربەت پاڵەیی دەکات. لە ساڵی (١٩٢٨) ماوەییێك لە هەولێر بوو و لە کردنەوەی ڕێگەی هەولێر –ڕواندز– ڕایات کرێکاری کردووە. لەپاشان گەڕاوەتەوە سلێمانی و لە قوتابخانەی زانستی بە مامۆستا دامەزراوە. لە ساڵی (١٩٢٩) هەواڵی مردنی باوکی پێ گەیشتووە، لە شاری مەرعش لە تورکیا. لە ساڵی (١٩٣٠) بەدوای میراتی باوکی چوّتە تورکیا، بەڵام هیچی دەست نەکەوتووە و بە نائومێدی گەڕاوەتەوە. بێکەس لە ڕاپەڕینی بەر دەرکی سەرای سلێمانی لە (٦)ی ئەیلولی ( ١٩٣٠) گیراوە. لەبەر گیرانی لە کاریش دوورخرابووەوە. دوای ئازادکردنی قوتابخانەیێکی تایبەتی کردۆتەوە، تا ساڵی (١٩٣٣) بەردەوام بووە و لەو سەردەمەدا لە گوندی مورتکەی بازیان بە مامۆستا دامەزراوە. لە پاشان گوازراوەتەوە بۆ قوتابخانەی تەوێڵە. لە ساڵی (١٩٣٧) لەبەر جموجۆڵی نیشتیمان پەروەری و بیری کوردایەتی، ئاوارەی شاری حیللە و لەوێوە بۆ عەمارە کراوە. دوای ماوەیێ گەڕاوەتەوە شاری سلێمانی و قوتابخانەیێکی تایبەتی کردۆتەوە، و تا ساڵی ( ١٩٤١) وانەی تیادا وتووتەوە. دوای ماوەییێك بۆتە مامۆستای قوتابخانەی میری لە سلێمانی و سووورداش و هەڵەبجە، و تا دواقۆناغی ژیانی مامۆستا بووە. لە ڕۆژی (١٨) ی شوباتی ساڵی (١٩٤٨)دا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە[٢].

**ژیانی بێکەس و کاریگەری لەسەر باری سایکۆلۆژی :**

ئەگەر سەیری ژیانی بێکەس بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو بارودۆخە ناهەموارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەختی و نالەباری گوزەرانی، لە هەژاری و گرتن و دوورخستنەوە و دەرکردنی لە کاری میری و ئاوارەبوون و تێکچوونی ئەدگاری ڕوخساری بەهۆی نەخۆشی ئاوڵەوە، تووشی ئاڵۆزی سایکۆلۆژی کردووە و دووالیزمیێك لە کەسایەتیدا دەرکەوتووە.

بارودۆخی سیاسی و کۆمەلأیـەتی ئـەو سـەردەمە کاریـان تـێ کـردووە و تووشـی بێزاری و نائومێدی و تووڕەبوونیان کردووە. ئەگەر ( بە وردی تەماشـای ئاوێنـەی کەسێتی بێکەس بکـەین، ئـەبینین ئـەم پیـاوە بریتـی بـووە، لـە کۆمـەڵێ گێنگلـی سیاسی و کۆمەلأیەتی و سایکۆلۆجی، و هەندێ جـاریش دژیـەك، کـە نـاوە بـە نـاو تووشی نائومێدی و بێزارییان کردووە[٣] ئەمەش بۆتـە هـۆی ئـەوەی لـە دوو وێنـەی جیاوازدا دەربکەوێت، (لە یەکەمدا پیاوێکی تا سەر ئێسقان نیشتیمان پەروەر و لە دووەمدا پیاوێکی تووڕە لە نیشتیمان و خەڵك، تووڕە لە خزم و کـەس و کـار)[٤] بـۆ لەیادکردنی ئەم بارودۆخە ناهەموارە و ژیانە سەختە ( پەنای بردۆتە بەر سڕکردنی هەسـتی خـۆی و مـەی و بـادە بکـا بـە هـاودەمی شـەوانەی)[٥] وە کـە لـە ڕووی دەروونییەوە ئاسایی بۆتەوە و ( هەموو بێزارییەکانی لـە بـیر ئەچێتەوە و دەسـت ئەکاتەوە بـە سـروود خوێنـدنی خـۆی)[٦]. ئـەم بـارە سـایکۆلۆجییە و کەسـایەتییە دووالیزمەی لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە.

**١- بێکەس وەك شاعیرێکی نیشتیمان پەروەر و خەباتگێڕ و ڕاستکەرەوەی باری کۆمەلأیەتی**

أ- لە ڕووی نیشتیمان پەروەری و خەباتگێڕییەوە :

بێکەس شاعیرێکی نیـشتیمان پـەروەری بـە سـۆزی میللەتەکـەی بـوو. هەسـت و سـۆزێکی بـەتینی لـە دڵ و دەروونیـدا هـەبوو بـۆ میللـەت و نیـشتیمانەکەی، و ئـادەمیزادێکی خەباتکـەر و ڕۆڵـەی بەسـۆزی گەلەکـەی بـوو. شـیعر لای ( چـەکی خەبات و پرۆگرامی سیاسی بوو )[٧]. بێکەس وەك ئادەمیزاد ( لە بنیـاد و بنـەڕەتی دروستبوونی وەك ئادەمیزاد، فرچکی بە بیری کوردایـەتی و نیـشتمان پـەروەری و خۆشویستنی کوردستان گرتووە )[٨]، و یەکێك بووە لە ( مامۆستایانی قوتابخانـەی کوردایـەتی و ڕاپـەڕین )[٩]، و هـەوڵ و کۆشـشی بـۆ ( دەستخـستنی ئـازادی بـۆ کوردستان و بەختیاری بۆ کورد بوو )[١٠]. لەم بارەیەوە دەڵێت :

خــەياڵاتى شـــەو و ڕۆژم ژيـــانى ميللـــەتى كــــــوردە
تەمـــەننام لاى خـــودا دائـــيم ژيـــانى ميللـــەتى كــــوردە
بـــە دائـــيم دڵ پەشـــێواوى پەشـــێويى ميللـــەتى كــــوردە
وەكـــو بولبـــول ســـەحەرخوانم ژيـــانى ميللـــەتى كــــوردە
نەخۆشــە ميللــەت و فــەوتاوە تــەن بــێ هۆشــە ئــەهلى ئــەو
ئــەوەى مەتڵــەب بــێ لامــان هــەر ژيــانى ميللــەتى كــوردە
بەڕاســـتى چـــاكترە مـــردن حـــەياتى وا لـــەلام تاڵـــــە
ئــەوەى نــاوى نــەبێ ئــەمڕۆ ژيــانى ميللــەتى كــــوردە
شــەجاعەت پيــشەيى كــوردە مــەعاريف ڕەســمى پێــشوويە
كــەرەم ئەلبەتتــە بــاعيس بــۆ ژيــانى ميللــەتى كــــوردە
دڵــم خوێنڕێــژ و ســەر گێــژە دوو چــاوم پــڕ لــە ئەسرينـــە
عيلاجى دەردى (بێكەس) هەر ژيانــــــى ميللەتى كــوردە[11]

بێكــەس لــە ( زۆربــەى بەرهــەمى شــيعريدا خــۆى پــێ ڕانــەگيراوە و ختۆكــەى كوردايەتى، خەياڵى هێناوەتە خەنـدە )[12] ، و بـە جۆرێك گـيرۆدەى خۆشەويستى ميللــەت و خاكەكــەى بــووە، هــەتا لــە زيندانيــشدا ( هــاوارى لــە نركــە و ڕاپــەڕين نەگرتۆتەوە )[13]، و گيرۆدەيى بەرامبەر نيشتيمان دەربڕيوە و دەڵێت :

ئــەى وەتــەن مــەفتوونى تــۆم و شــێوەتم بــير كەوتـــەوە
وەختـــى بەنـــديى و ئەســارەت پـــێ بـــە تـــەوق و كۆتـــەوە
مــن لــە زيكــر و فيكـرى تــۆ غافــڵ نــەبووم وا تــێ نەگـــەى
بـــەو خودايـــەى بـــێ شـــەريك و لا مـــەكان و واحيـــــدە
عەشـــقى تـــۆ نـــەوعێ لـــە دڵمـــا ئـــاگرى كردۆتـــــەوە
ئـــاگرێكى وا هـــەزار ســـاڵ ئـــاوى برژێنيتـــە ســــــەر
قــەت گــڕ و گڵپــە و بڵێــسەى تــا ئەبــەد نەكوژێتـــــەوە
باسى مەحزوونى و كەساسى خۆت نەكەى توو خوا وەتەن
چـــــونكە بەو باســـــــە بريــن و زامەكەم ئەكولێتـــەوە[14]

بێکەس هانی میللەتەکەی داوە بۆ ئەوەی دژی داگیرکەر بجەنگن و خۆیان ببەخشن، و لە مردن سڵ نەکەن، چونکە ئازادی و دەستکەوتنی مافی نەتەوە، بێ فیداکاری و خۆبەخشین، ناسەندرێ و دەڵێت :

داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ
پیاو ئەبێ بۆ سەندنی حەققی لە مردن سڵ نەکا
هەر بڕووخێ بەس نییە تاکو نەسەنرێ نادرێ [15]

هەروەها بێکەس گیانێکی شۆڕشگێڕی هەبووە و شانازی بە نەتەوەکەی و قوربانیدانەکانی گەل و دڵسۆزەکانی کردووە و دەڵێت :

قەومی کورد ئیسباتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین
میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین
میللەتێ لاوی لەڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان
بێتە بەر سێدارە، بێ ترس، دەم بە خەندە و پێکەنین
قەومی وا نامرێ، ئەژی، با دوژمنی هەر شەق بەرێ
ساحێبی ڕۆڵەی نەبەردە، خاوەنی عەزمی مەتین
ئەو کەسەی گیانی لە ڕێگەی نیشتمانا بەخت ئەکا
پێی مەڵێن مردووە، شەهیدە، وا لە فیردەوسی بەرین [16]

هەروەها بێکەس شاعیرێکی نیشتیمان پەروەر و دڵسۆز بووە و دژی خۆفرۆش و میللەت فرۆشان بووە و ڕیسوا و شەرمەزاری کردوون و دەڵێت :

قەدری میللەتانتان بە جارێ شکان
نە حەیاتان ما نە ناوو نیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەر شان

(( وەفـــدی کوردســـتان میللـــەت فرۆشـــان
هــــەرزە وەکیـــلی شـــاری خامۆشـــان ))[17]

**ب- لە ڕووی کۆمەڵایەتی و دەربڕینی داخوازییە کۆمەڵایەتییەکانەوە :**

شیعر لای بێکەس ( ڕاستکردنەوەی باری کۆمەڵایـەتی و دەربڕینـی داخوازییـە کۆمەلآیەتییەکان بوو )[18]. بێکەس بایەخێکی زۆری بە( ژیانی کۆمەلآیـەتی داوە و لەو شاعیرانە نەبووە، تەنها ستایشی قارەمانێتی و ئازایەتی میللەتەکـەی کردبـێ، بـەڵکو لـە پـاڵ ئەمەشـدا، خـەوش و نیفـاق و دووبـەرەکی و خۆخـۆری نیـشتمانی پێـشان داوە و پەنجـەی خـستۆتە سـەر برینـەکان و جـاری واش هـەبووە، بـە ئەنقەست ئـەو برینانـەی کولاندۆتـەوە، بـۆ ئـەوەی میللەتەکـەی ڕاپـەڕێنێ)[19]. بـۆ نموونـە هـانی میللەتەکـەی داوە بـۆ کـارکردن، بـۆ ئـەوەی بـە سـەربەرزی بـژین و دەست بۆ کەس درێژ نەکەن و دەڵێت :

ڕۆژ و ئـــەرز و مـــانگ وا لـــە گەڕایـــە
تـــۆش تـــێ بکۆشـــە تـــا هێـــزت تیایـــە
ئینـــسانی ئیـــشکەر حـــەبیبی خوایـــە
بەکـــەم رازی بیـــت زۆر لـــە ڕێ دایـــە
ســـەری بـــێ ڕۆژی لـــە ژێـــر خاکایـــا
...............
کاکـــە دانیـــشتن مـــاڵ ویـــران ئەکـــا
بـــێ ئیـــشی ئینـــسان پەرێـــشان ئەکـــا
نـــەفرەت لـــە خـــۆی و لـــە ژیـــان ئەکـــا
نـــان و مـــافی تـــۆ هـــەر لـــە کارایـــــە
ســـــەری بـــــێ رۆژی لە ژێـــر خاکایـــا[20]

هەروەها بێکەس داکۆکی لە ئافرەت کردووە و هەوڵی بەدەستهێنانی مافەکانیانی داوە، و هانی داون بۆ تێکۆشان و خوێندن و ڕزگاربوون لە دیلی و دەڵێت :

نەسـرین دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە
وا من پێت ئەڵێم چونکە لە سەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە
.............
ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانە
عالەم شەو و ڕۆژ وا لە فرمانە
فەرقی نێر و مێ نییە بیزانە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە[21]

بێکەس دەیزانی پێشکەوتن و سەرفرازی میللەت و دەرمانی دەردی دواکەوتوویی خوێندنە، بۆیە هانی داوە بۆ خوێندن و پەیداکردنی زانست و زانیاری و دەڵێت :

مەرهەم و دەرمانی دەردی ئێمە تەنها مەکتەبە
فرسەتە هەستن لە خەو ئیتر چ وەختی نووستنە
با چرای ( زانستی) هەڵکەین و لە زوڵمەت دەربچین
زۆر بەجێ ماوین لە خەڵکی، عەیبە، عارە، مردنە[22]

بێکەس دژی ئەو شێخ و مەلایانە بوو، کە ئاینیان کردبووە داردەستێك و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان دەهێنا و خەڵکیان فێری تەمبەڵی دەکرد و لە پێشکەوتن و زانست، دووریانیان دەکردەوە و دەڵێت:

هەردوو گوێم پڕ بوو لە باسی وەعز و سەرفیترە و زەکات
هەر هەواڵی حەشر و نەشرم پێ ئەڵێی تاکوو مەمات
بەسیە لەم مەوزووعە لادە فێری نوێژ بوو کائینات

خوتبـەییێكی ئیجتیمـاعیم پـێ بڵـێ بـۆ ڕێـی حەیـــــات
ئـــەی مـــەلا تـــۆ بـــەخودا لـــەم فیكـــرە كۆنـــە لابـــــــدە
فـــــەننی تـازەم پێ نیشان دە بۆ تەرەققی و ڕێی نەجـات[23]

٢- بێكەس وەك كەسایەتییێكی نائومێد و بێزار و تووڕە لە نیشتیمان و خزم و كەس :

ژیانی نالەبار و ناهەموار و پڕ لـە خـەم و پـەژارەی بێكـەس و هـەژاری و گـرتن و دوورخستنەوە و ناشیرینی ڕوخساری، كاریگەرییێكی زۆریان لەسەر باری دەروونیدا هەبووە و لە كەسایەتییێكی نیشتیمان پـەروەر و دڵسۆزی میللـەت و نیـشتیمان و چاككەرەوەی باری كۆمەڵایەتی میللەت، بەرەو كەسایەتییێكی بێزار و بـێ ئومێـد و تووڕە لە نیشتیمان و میللەت و خزم و كەسیان بردووە.

أ – بێ ئومێدی و بێزاری :

بێكەس كە بۆی دەركەوتووە میللەتەكـەی نـەزان و نەخوێنـدەوارەو لـەم بـوارەدا هەوڵ و كۆشش ناكات، و چاكە و خەراپەی خـۆی نازانێـت، و هـەوڵی سـەندنەوەی مافەكانی خۆی نادات، بێ ئومێد دەبێـت، چـونكە دەزانێـت، مـاف دەسـێندرێت و نادرێـت، و ئـەو قـسانەی كـە لـەم بارەیـەوە دەوتـرێ، هـەمووی بـە هـیچ و پـووچ دەزانێ، بۆیە هێرش دەكاتە سەر میللەتەكەی و دەڵێت :

ئومێدم ئیتر بەم كوردە نەمـا
نابێ بە ئینسان لە ناو عالەما
بمێنێ هەتا لە دەرد و غەمـا
هەر ئەناڵێنێ لە ژێر قەدەمـا[24]

بێكەس ئەوەندە تووشی بێ ئومێدی و بێـزاری بـووە، یـەك ترووسـكە چـاكەی لەم جیهانەدا بەدی نەكردووە، چونكە زانیـوییێتی كـە كۆمـەڵێك لـە سـەر بنـچینەی سوود و تایبەتی بەڕێوە بچێ، و میللەتەكە خۆخۆر و دژی زانـست و نەخوێنـدەوار بن و لە گوێی گادا خەوتبن، مەحاڵە پـێش بكـەوێ و ڕزگـار بێـت و چارەنووسـێكی

ڕووناکی هەبێت. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو بەها کۆمەڵایەتییەکان بخاتە ژێر پێی. بۆ ڕەشبینی و بێ ئومێدی دایدەگرێت و دەڵێت :

**سەرم سووڕ ماوە نازانم چ شەخسێ بێ غەش و چاکە**
**لەناو ئەو قەومەدا کێیە لەگەڵ هاوجینسی خۆی پاکە**
**لە لام وا باشە ئێستاکە بەکەس پشتێ نەبەستی تۆ**
**لە خزم و دۆست و ئاشنایان هەتا ئەتوانی هەر ڕاکە**
**ئەگەر پارەت نەبێ بەخوا هەزار خزمت ببێ پەشمە**
**کە پارەت بوو هەموو عالەم براتە و پێت ئەڵێ کاکە**[٢٥]

هەروەها لە شیعرێکی تردا دەڵێت :

**کوا پیاوی دڵسۆز، کوا وەتەن پەروەر ؟**
**کوا خاوەن غیرەت ؟ کوانێ مونەووەر ؟**[٢٦]

**ب– هێرش کردنە سەر میللەت :**

بێکەس لە ڕەفتاری میللەتەکەی و لە بێ خەبەری و هەوڵ نەدان و هۆشیار نەبوونەوەیان تووڕە دەبێت و هێرش دەکاتە سەریان و دەڵێت :

**ئومێدم ئیتر بەم کوردە نەما**
**نابێ بە ئینسان لە ناو عالەما**
**بمێنێ هەتا لە دەرد و غەما**
**هەر ئەنالێنێ لەژێر قەدەما**[٢٧]

هەروەها لە شیعرێکی تردا بێکەس هێرش دەکاتە سەر میللەتەکەی، دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوێت، کە میللەتەکەی لە خۆپەرستی و خۆخۆری و دژایەتی یەکتر هیچی تر نازانن و دەڵێت :

